خلاف. إختلاف: فَرق. تباين/ جياوازی.
– . – : ضد وِفاق/ نارێکی، ناکوکی.
بـ – : عَدا. ماعَدا/ بێجگە.
بـ – ذلك. خِلافاً لذلك/ بە پێچەوانەی.
عليه – : عليه نِزاع/ چەن و چونی لە سەرە، ناکوکی لە سەرە.
و – ـە: و غير ذلك/ هەروەها.
خلافَة: عُقوب. الإتيان بعد/ بەدواداهاتن، لەدواهاتن.
– : إمامَة/ رابەری.
– : النيابَة عن الغير/ لە بری، لە شوێن، لە جياتی.
خليف. خَليفَة: مَن يخلف غيره/ جێگر، جی نشين، رابەر.
مُخَلَّف: باق. مَتروك/ بەجێماو.
مُخَلَّفات: بقايا/ پاش ماوە.
مُخالِف: مُناقض/ دژ، جياواز، لەيەك نەچو.
– : عاصٍ/ ياخی، سەرپێچ، نەتڵ، بەلەسە.
– : مختلف. مُغاير/ جياواز، تاك و لۆ.
تَخَلُّف/ بەجێ ماو، دواکەوتن.
مُختَلِف: مُتَنوِّع/ هەمەجۆر، هەمەرەنگ، هەمەچيزە.
– عن: مُتَباين/ جياواز.
مُخالَفَة: ضد موافقَة/ نا قايلی، دژوار.
– : مُناقَضَة/ جياوازی، بەرپەرچ.
– : عُصيان/ ياخی بون، لاساری، سەرپێچی.
– : تَعَدٍّ/ دەست درێژی کردن.
– : جُرم اخَفّ من الجُنحَة/ سوکەتاوان.
مخلاف: الرجل الكثير الإختلاف في وعوده/ پياوی بێ پەيمان، بێ گفت، درۆزن، ناراست.
خُلف: عدم إنجاز الوعد/ بێ گفتی، پەيمان شکاندن، درۆ.
خِلف: حَلَمَة الضرع/ گوی گوان.
خِلفَة: رقعَة/ پينە.
مَخلوفَة: رحل البعير/ کورتانی وشتر.

خلق

خَلَقَ: بَرأ: اوجد من العدم/ دروستی کرد.
– . إختَلَقَ: إستنبط/ دای هێنا.
– . – الكذب: إفتراه/ درۆی هەڵ بەست.
خَلِقَ. خَلُقَ. خَلَقَ الثوب: بَلِيَ/ کۆن بو، تەق لەبەرکرا.
– . – بكذا: كان جديرا به/ لەخۆی هات، لێی هات.
اخلَقَ الثوبَ: ابلاه/ کۆنی کرد.
تَخَلَّقَ بِغير خُلقه: تَطَبَّع بطباعه/ خوی يەکێکی کەی گرت.
خُلق. خُلُق: سَجِيَّه و طبع/ خو، رەوشت و خو، رەفتار.
– . – : مُروءَة/ پياوەتی.
سيء الـ – : شَكِس/ بەدخو، بەدرەوشت، بێ ئابرو.
خَلوق: مُؤَدَب/ رەوشت پاك، خۆش رەفتار.
اخلاق: آداب/ رەفتار، رەوشت، رەوشت و خو، رەوتار.
خَلق: ناس/ خەڵك.
– . خِلقَة: فطرة/ سروشتی.
– . – : إيجاد. بَرء/ دروست کردن، داهێنان.
خِلقَة: هيئَة/ سيمەن، روالەت.
خَلَق: بال/ شر، کۆنە.
خُلقانی. بائع الملابس القديمة/ کۆنە فرۆش.
خَلقی: فِطری/ سکماکی، سکماك.
– : طبيعی/ سروشتی.
خَليق: جَدير/ گونجاو، لەبار.
– به: اهل له/ شايانێتی.
خليقه: ما خَلَقَهُ الله/ دروستکراو، خواکرد، جيهان.
– : طبيعة/ سروشت، خۆرسك.
قبل الـ – : قبل خلق العالم/ لە پێش دروست بوونی جيهانا.
خلائق: مخلوقات/ زيندەوەر.
خالق: باريء/ دروست کار.
مُختَلَق: غير حقيقی/ دروست کراو، هەڵ بەستراو.
مُختَلِق: مُختَرِع/ داهێنەر، دروست کار.
إخلَولَقَ: عَسی/ خۆزگە، خۆزگا.
– : اوشك/ ئەوەندەی نەماوە، خەريکە.
– الثوب. بَلِيَ/ کۆن بو، دڕا.

خلا:

خَلا: فَرَغ/ چۆڵ بو.
– المكانُ: رحل ساكنوه/ چۆڵيان کرد، کەسی تيانەما.
– . إختلی به و اليه و معه: إجتمع معه علی خلوة/ دووقۆڵی کۆبونەوە، بەتەنها لەگەڵی مايەوە.
– باله: إطمأن و إستراح/ دڵنيابو، خەمی نەما.
– الشهرُ: مضی/ تێپەڕی، تەواوبو.
– الحزنُ: فارقه/ خەمەکەی رەوييەوە.

– عن و مِن كذا: تجرد. تَبرَّأ/ لەكۆڵی بووەوە.
– بە: خذ لە/ هیوای بڕی، نائومێدی كرد، دەستی بڕی.
– بە: هجره في ضيقته/ وازی لێ هێنا، دەستی لێ هەڵ گرت.
– بنفسه: إنْفَرَدَ/ بەتەنها مایەوە، كونجی تەنیایی گرت.
– . ماخلا. سوی/ بێجگە، جگە لە، جگە، بەبێ.
– بالمكان: لزمه/ تیامایەوە، جێی نەهێشت.
– للامر: تَفَرَّغَ و تَجَرَّدَ/ تەرخان بو، هەر ئەوەی كرد، خۆی بۆتەرخان كرد.
– بالشيء: إنفرد و لم يخلط به غيره/ بەتەنها هەر خۆی كردی.
خَلَّى مكانَه: مات/ مرد، جێگەكەی بە چۆڵی مایەوە.
– : ترك. مَضى/ بەجێی هێشت، وازی لێ هێنا، لێی گەڕا.
– سبيله: اطلقه. فَكَّهُ/ بەریدا، بەرەڵای كرد.
– مكانه: مَضى لسبيله/ بەرێی خۆیا رۆیشت.
– بينهما: تركهما مجتمعين/ بەجێی هێشتن.
أخلى المكانَ: جعله خاليا/ چۆڵی كرد.
– المكان و الإناء: فرغه/ بەتاڵی كردەوە، هیچی تیا نەهێشت.
– مكاناً : وَسَّعَ/ دری دا، جێی كردەوە.
– سبيله: خَلاّه/ بەری دا، بەرەڵای كرد.
– بە و معە: إجتمع معه فی خَلوة/ لەگەڵی كۆبووەوە.
تَخَلَّى عن: ترك/ وازی لێ هێنا، دەست بەرداری بو، لێی گەڕا.
– عن: هجر/ كۆچی كرد، بەجێی هێشت، لێگەڕا.
– . إختلی: إنفرد فی خلوة/ بەتەنها مایەوە.
– لە: تَفَرَّغَ/ خۆی بۆ تەرخان كرد.
خلاء: فضاء. المكان الفارغ/ چۆڵی، چۆڵیان.
– : ريف/ دەشت، لادێ.
في الـ – : تحت السماء/ لە دەشت، لە دەرەوە.
بيت الـ – : مرحاض/ ئاودەست خانە، ئاودەست.
خَلْوَة: مكان لإختلاء/ پەنا، شوێن كۆبونەوە.
– : إختلاء: إنفراد/ دورە پەرێزی.
على – : على إنفراد/ بە تەنیا، دوقۆڵی.
خَلَوي: ريفي/ لادێی.
خَلِيّ. خالٍ: فارغ/ بەتاڵ، بۆش.
– و خالي البال: الخالي من الهَمّ/ بێخەم، بێباك.
– : مَن لا زوجة له/ بێ ژن.
خَلِيَّة النَحْل: قفير/ دوبەرە، پورەی هەنگ، كورەی هەنگ.
– الجسم: حُجَيْرة/ سێلّ.
– / خانە.
إخلاء. إخراج/ چۆڵ كردن، بەتاڵ كردن.
– السبيل. فَكّ. إطلاق السراح/ بەرەڵاكردن.
خالٍ: فارغ/ بەتاڵ، بۆش.
– : غير مشغول/ بەتاڵ، دەست (بەتاڵ، نەگیراو).
– : حُرّ. غير مُرتبط/ ئازاد، دەست بەتاڵ، سەربەست.
– : من عيب/ بێ خەوش.
– من كذا: مُجَرَّدٌ منه/ پەتیەلە.
– من السكان/ چۆڵ، چۆڵ و هۆڵ.
– من العمل/ بێ ئیش، بێكار.
– من الغرض/ بەبێ پێچ و پەنا، بێ خەوش.
– من العراقيل/ بی گرێ، بەبێ تەگەرە.
– من الموانع (المحضورات)/ قەدەغەكراوی تیا نیە.
خلي:
خَلَى الفرسَ: القى اللجام فی فيها/ لغاوی كرد.
– اللجامَ من الفرس: نَزَعَهُ/ لغاوەكەی داكەند.
– القِدْرَ: القى تحتها حطباً/ ئاگری مەنجەڵەكەی كرد.
خَلى. خَلاة: عُشب/ گیا.
مِخلاة. مِخلاة الدابَّة: ما يُجعَل فيه العلف و يعلق فی عنق الدابَّة/ تورەكەی ئالیك.
خم:
خَمّ: كَنَس/ گسكی دا.
– البئرَ: نَقَّاها/ دەری دا، پاكی كردەوە.
– . خَمْخَمَ: فسدت رائحته/ بۆنی كرد، بۆگەنی كرد.
تَخَمَّمَ ما على الخوان: اكل بقايا ما عليه/ هەمو خواردنەكەی خوارد، گسكی لێدا.
مِخَمَّة: مِكْنَسَة/ گسك.
خُمّ الدجاج: خُنّ. قُنّ/ كولانە.
خَمَّة: رائحة الرطوبة و التعفن/ بۆگەنی.
خام. مُخِمّ: نَتِن/ بۆگەن.

خمد:

خَمَدَ. خَمِدَ: سكن. هَدأ/ هێمن بووەوە، هێواش بووەوە، دامرکایەوە، بێ دەنگ بو، کپ بو، خاویوەوە، دامردەوە.

— . — : مات/ مرد، گیانی دەرچو.

— . — الحُمّى: سكن فورانها/ سوکی کرد، تاکەی کەم بووەوە، خاویوەوە.

— . — المريضُ: أُغمِيَ عليه/ لە هۆش خۆی چو.

— ت . — ت النـارُ: سكن لهيبها/ دامردەوە، گڕەکەی نیشتەوە (ئاگر).

اخْمَدَ: اسكت/ بێ دەنگی کرد، هێمنی کردەوە، هێواشی کردەوە.

— : اطفأ/ کوژاندیەوە.

— : اقمع/ دای مرکاندەوە، کپی کرد، دابینی کرد.

— انفاسه: اماته/ خنکانی، کوشتی، پرزەی بڕی، خپی کرد.

— الهِمَّة: بَرّدها/ ساردی کردەوە.

خُمود: سكوت/ بێ دەنگی، کپی، هێمنی، دامرکاوی، دامردنەوە.

خامِد: ساكت/ بێ دەنگ، کپ، هێمن، دامرکاو.

خمر:

خَمَرَ. خَمَّرَ: سَتَرَ. حَجَبَ/ پۆشی، روی پۆشی، دای پۆشی، پەچەی گرتەوە.

— . — : جعله يختمرُ/ ترشانی.

— . — العجينَ: جَعَلَ فيه الخمير/ هەویر ترشی تێ کرد، هەڵی مێنا.

— فلاناً: إستحيا منه/ شەرمی لێ کرد.

خَمِرَ. اخْمَرَ: توارى و استتر/ خۆی شاردەوە، ون بو.

— : تغير عما كان عليه/ گۆڕا، تێك چو.

اختمر. تَخَمَّرَ العجينُ: صار خميراً/ هەڵ هات.

— . — : لَبِسَ الخمارَ/ پەچەی گرتەوە، روی پۆشی.

— العصيرُ: صار خمراً/ بو بە سرکە، بو بە شەراب.

خامَرَ. إرتاب. شَكَّ/ گومانی کرد، دڵی پیس کرد.

اخْمَرَ. خَمَّرَ له: حَقَدَ/ (قین، رق)ی لێ هەڵ گرت، لێی کەوت بە (قینا، رقا).

خِمار: قناع/ پەچە، روپۆش.

خمر. خَمْرَة: مُسكِر/ شەراب، بادە، مەی.

لون خمري/ شەرابی.

خَمّار: بائع الخَمْر/ مەی فرۆش، بادەفرۆش.

خَمّارة: محل بيع الخمر/ مەی خانە.

خِمِّير: سِكّير/ مە ی خۆر، مەی نۆش، بادەنۆش.

خُمـار. خُمْـرَة: صُـداع الخمـر/ سەرخۆشـی، گێـژی دوای خواردنەوە، سەریەشەی بادە.

مَخمور: مَن اسكرته الخمرة/ سەرخۆش، خومار.

خَمير: الخُبز الذي إختمر عجينه/ هەڵ هاتو.

خَميرَة. خُمْرَة/ هەوێن.

— . — العجين (الخبز)/ هەویرترش.

إختمار. تَخَمُّر. تخمير/ بون بە سرکە، هەڵ هاتن، ترشاندن.

تَخمير العجين/ هەڵ مێنان، ترشان، ترشاندن.

— الخُمور/ بەشەراب کردن، کردن بە شەراب، گەڕانەوە.

مُخْتَمِر. مُخَمَّر/ ترشاو، ترش بو.

— . خامِر (للعجين)/ هەڵ هاتو.

خمس:

خَمَسَ: كان خامسهم/ پێنجەمیان بو.

— : اخَذَ الخُمس/ پێنج یەکی برد.

خَمَّسَ الشيءَ: جعله ذا خمسة اركان/ کردی بە پێنج لا.

— العدد: ضَرَبَه في خمسةٍ/ پێنج جارەی کرد.

اخْمَسَ القومَ: صاروا خَمْسَةً/ بون بە پێنج.

خَمْس. خُمُس. ١|٥/ ١/٥، پێنج یەك.

خُماس. مُخَمَّس/ پێنج پێنج.

خَمْسَة. ٥/ پێنج.

— اضعاف/ پێنج (کەڕەت، جار، چەندانە).

— عَشَر. ١٥/ پانزە، پانگزە.

خمسون/ پەنجا.

خُماسي. مُؤَلّف من خَمْسَةٍ/ پێنجە.

— الزوايا/ پێنج گۆشە.

— الاضلاع/ پێنج لا.

— السطوح/ پێنج ڕو.

— الورقات/ پێنج گەڵا.

خَميس. يوم الخَميس/ پێنج شەممە.

خامِس: بَعد الرابع/ پێنجەم، پێنج هەم.
– عَشَر/ پانزە (م، مین، هەم، هەمین).
مُخَمَّس: ذو خمسة اركان/ پێنج لا، پێنج گۆشە.
تخميس (عند الشعراء): إضافة ثلاثة اشطر الى شطري البيت/ تەخمیس، پێنج خشتەکی.
خمش:
خَمَشَ: خَدَشَ/ روشانی، چنکی لێدا، چنگی لێ گرت.
خَمْش: خَدْش/ روشاندن، چنگ لێ گرتن.
خَموش: بعوض/ مێشولە.
خمص:
خَمَصَ. إنخمص الجرحُ: ذهب و رمه/ نیشتەوە، ئاوساویەکەی نیشتەوە.
خَمِصَ البَطنُ: فَرَغَ/ بەتاڵ بووەوە، هیچی نەما (سك).
خَميص الحَشى: جائع/ برسی.
– . خَمصان. خُمصان: ضامر البطن/ سك بەتاڵ، سك بە قوڵاچو.
اخمص القدم: مالا يُصب الارض من باطنها/ بنی پێ، چاڵایی پێ.
خمع:
خَمَعَ: عَرَجَ/ لەنگی، شەلی.
خُماع: ضَلَعُ/ خوارو خێچیەکی زکماکی.
خِمع: ذئب/ گورگ.
– : لِص/ دز.
خَيْمَع. خَيموع: المرا الفاجرة/ سۆزانی.
خمل:
خَمَلَ ذِكرُهُ او صوته: خَفِيَ/ ون بو، کپ بو، دەنگ و سەنگی نەما.
خامِل الذِكر: مَنسي. غير معروف/ نەناسراو، نادیار، بیرەوەچو.
– : بَطيء. مترهل/سست، خاو، خاوو خلیچك.
خُمول: فُتور و كسل/ تەمەڵی، سستی، خاوو خلیچکی، دامێزراوی.
– الذكر/ نادیاری، بیرچونەوە، نەناسراوی.
خُمال: داء في المفاصل/ دەردە جومگە، شلەپەتێ.
خَمائل: الشجر الكثير. الموضع الكثير الشجر/ چرە، بێشە، دارستان.
مُخمَل: خَميلَة: قطيفة/ قەيفە.
خَميلة. خَمْل. خُمالَة: ريش النعام/ توکی قو.
– : المنهبط من الارض/ زەوی داتەپیو، رۆچو، خم خۆرك.
– : الشجر الكثيف/ دارستان، چرە، بێشەڵان.
خمن:
خَمَّنَ: قَدَّرَ/ قەبلانی، خەملانی.
تخمين: تقدير/ قەبلاندن، قەرینە.
مُخَمَّن: مُقَدَّر/ قەبلێنراو.
مُخَمِّن: مُقَدِّر/ قەبلێنەر.
خن:
خَنَّ. خَنْخَنَ: خَنَفَ. اخرج الكلام من انفه/ بەلوت قسەی کرد، منگەی هات، منگانی.
خُنَّة. خَنين: خَنَف/ منگە منگ کردن، بەلوت قسەکردن.
اخَنّ: اخنف/ منگەمنگەکەر، بەلوت قسەئەکا، منگن.
خنث:
خَنِثَ. تَخَنَّثَ: انُثَ. كان على صوره الرجال و أحوال النساء/ ژنانی بو، نێرەکورکە بو.
خَنِث. مُخَنَّث. مخناث: انيث/ نامەرد، ژنانی.
خُنثى: ذكر و انثى في آن واحد/ نێرەموك.
خنج:
خَنجر. خِنجر: مِدْيَة/ خەنجەر.
خند:
خُنْدُب: سيء الخلق/ بێئابرو، رەوشت خراپ.
خُنْدُع: خسِّيس في نفسه/ ناپیاو.
خَندَقَ الخَنْدَقَ: حَفَرَه/ خەندەقی (هەڵ کەند، لێدا) خەرەندی لێدا.
خَنْدَق: حُفْرَة مستطيله/ خەندەق، کەندر، سپێر، کەندەك، خەرەند.
خنز:
خنزير: حيوان مَعروف/ بەراز، خوگ، وەراز.
– : ذكر الخزير/ یەکانە.
– بَرِّي/ بۆرە.
صغار أوجرو الخنزير/ بێوڵە، پارکولە.
صوت الـ –/ مرقاندن.
خنزيرة: انثى الخنزير/ مالۆس، دەر، شەکە.
خنص:
خِنْصِر. خِنصَر: الاصبع الصغرى/ پەنجەتوتە.

خِنـوّص: ولـد الخنزيـر/ پـەڵغ، بەچـكە بـەراز، تولەبەراز، كودەڵە.

خنع:

خَنَعَ له و اليه: خَضَعَ و ذَلَّ/ سەری بۆ شۆڕكرد.

خُنـوع: خُـضـوع و ذِلـّة/ سەرشـۆڕكردن، نۆكـەری كردن.

خَنَع: ذُلّ/ سەرشۆڕی، نۆكەری.

خانع و خَنوع: الفاجر المريب/ داوێن پـيس، بێبـار، ريايی كەر، سەرشۆڕ.

خُنْعَة: ريبةو عار/ رسوايی، سوكی.

خنف:

خَنَفَ: خَنْخَنَ. خَنَّ/ منگەی هات.

خَنَف: خُنَّة/ منگە منگ.

اخنف: اخَنّ/ منگن.

خُـنْفُس. خِـنفس. خُنفـساء. خُنْفُـسه: حَـشَرَة/ كارۆڵك، سفره برە، قالۆنچە، گوخلێنكە.

خنق:

خَنَقَ. خَنَّقَ: شَدّ على حلقه حتى يموت/ دەسـتی نايە بينی، تاسانی، پەنگەموسی كرد.

— الرايَـة: نكـسها علامَـة للحـزن/ ئـاڵای هێنايـە ناوەڕاست بۆ پرسە، ئاڵای دانەواند.

— : حَـبَس الـنَفَس/ تاسـانی، خنكـانی، هەناسـەی بڕی، پەنگەموسی كرد.

— ـه العِزات: غَـصَّ بالبكـاء/ هەنسكیدا وەختـەبو بخنكێ.

خَنَّقَ الإناءَ: مَلأه/ پڕی كرد، خەفەی كرد.

إختَنَقَ. إنخَنَقَ/ خنكا، تاسا.

خانَقَ. تَخانَقَ: تَشاجَر/ چو بەگژيا، شەڕی كرد.

مَخنـوق. مُخْتَنِـق. خَنيـق. خَنِـق/ خنكـاو، تاسـاو، خەفە، پەنگەموس.

خَنْق: حَـبْسُ الـنَفَس/ خنكانـدن، هەناسـە لێ بـڕين، تاساندن.

خِناق: مايُخنَق به كالحبل/ پەتی خنكاندن.

— : طوق الثوب/ يەخەی كراس، يەخە.

— : العنق/ مل، بينەقاقا، گەردن.

— : زقاق/ كۆلان.

اَخَذَ بـ ـــه/ يەخەی گرت بينەقاقای گرت.

ضَيِّقَ الـ – على/ دەستی نايە (بينی، بينەقاقای).

تضييق الـ – : مُضايقه: ظلم/ ستەم، زۆرداری، جەور، تـەنگ پێهەڵ چنين.

خُنُقَة اليد: رسغ/ مەچەك.

خانِقُ: الذي يَخْنِق/ خنكێنەر، خنكێن.

إختناق: فَطس/ خنكان، هەناسەبڕين، تاسان.

— : إنعقاد و إنسداد/ تەنگی، خەفەبون، خنكـان بـەهۆی پڕبون و زۆريەوە.

— دموی: اسَن/ خنكان بەهۆی نوكـەڵ يـا بـۆن و هـەوای پيسەوە.

خُناق. خانوق: دفتريا/ وەناق.

خانوق الدجاج: مرض/ باڵەشۆڕێ.

خَناقَة: عِراك/ شەڕ، بەگژاچون.

خَنّاق: من شانه الخنق/ خنكێنەر.

خنا:

خَنا. خَنِیَ. اخْنى: اَفْحَشَ فی الكلام/ قسەی قۆڕو ناشـيرينی بە دەما هات.

اخنى عليه الدهر: اهلكه/ زەمانە پەكی خست، رۆژگـار پـەكی خست.

خَنى: كلام قبيح/ قسەی (قۆڕو ناشيرين، بێجێ).

خاخ:

خاخ العُشب: قَلّ. خَفيَ/ گياو سەوزە نەما، كەم بووەوە.

خَوخ (نبات و ثمر)/ قۆخ.

خَوخَة/ قۆخێك.

— :منوَر. كُوَّة السقف/ كلاورۆژنە.

— : باب صغير في الباب الكبير/ دەرگای ناودودەری.

خوخاء. خَوخاة: احمق/ گێل، كەر، كەودەن، گەمژە.

خود:

خَوَّدَ: سار مُسرِعاً/ خێرا رۆيشت.

تَخَوَّدَ الغُصنُ: تَمايل/ لاريووەوە، شنيەوە.

خَوْد: المراة الشابَة/ ژنی گەنج.

خوذ:

خاوَذَهُ الى الشيء: خالفه/ دژاودژ كەوتن.

تَخَوَّذَ: تَعَهَّدَ/ پەيمان يا بەڵێنی دا.

خواذ: حُمَّى/ تا.

خُوذة: غِطاء راس المحارب/ كلاو ئاسن.

خار:

خار البَقَرُ: صاح/ بۆڕانی، قۆڕانی.
– عَزمَه: فَشَلَ/ روخا، زەوق و ئارەزوی نەما، وەرەی بەردا.
– ت قِواه: ضَعُفَ/ لاواز بو، هێزی نەما، پەکی کەوت.
– . إستخار: إستعطف/ پاڕایەوە، نزای کرد.
خُوار: صوت البقر/ بۆڕە، بۆڕەبۆڕ.
– العَزم/ روخان، ئارەزو نەمان.
– القوی/ لاواز بون، هێز نەمان، پەك کەوتن.
خَوّار: خائر العزم/ روخاو.
– : سهل الإنقياد/ دەستەمۆ، کەوی.
– : الضعيف الرخو/ نەرم و لاواز.
– : جَبان/ ترسنۆك.
خَور: خليج صغير/ کەنداوێکی بچکوك.
– : مُخفَضَ من الارض/ زەوی نزم و چاڵ.
خوري: كاهِن/ پیاوی ئایین.
خاس:
خاست الجيفَةُ: اَرْوَحت/ بۆگەنی کرد، بۆنی کرد.
– البضاعَةُ: كَسدَت/ بازاری شکا.
خاس العَهْدُ و بالعَهْدِ: نَقَضَهُ/ پەیمانی شکان.
– بالوَعْدِ: اخلف/ لە بەڵێن لایدا.
خوص:
خاوَصَ و تخاوَصَ: اَغمَضَ عينه قليلاً و حَدَقَ/ بەچاوی وەك نوقاوەوە سەیری کرد.
اَخْوَصَ النخل: اخرج الخوص/ گەڵای دەردا، پەلکی کرد (دارخورما).
خوص: ورق النخل/ گەڵای دارخورما، پەلکی دارخورما.
اَخْوَصُ: ضَيِّق العينين/ چاوبچوك، چاوكونە سوژن.
خاض:
خاضَ. خَوَّضَ الماءَ: دَخَلَهُ/ خۆی خستە ئاوەکەوە، خۆی تێ خست.
– في الحديث: تَعَمَّق/ قوڵی کردەوە، درێژەی پێ دا، چوە بنج و بناوانی.
– المَنايا: إقْتَحَمَها/ خۆی خستە مەترسیەوە.
مَخاضَةُ النهر: مَوضع الخَوض/ بوار، دڕ، تەنکاو.
خاف:

خاف. تَخَوَّفَ: فَزَعَ/ ترسا، تۆقی، زراوی چو، زارەترەك بو، رۆحی چو، زەندەقی چو، ئەترەش بو.
– . – منه/ لێی ترسا، رۆحی لێ چو.
– . – عليه/ بۆی ترسا.
خَوَّفَ. اَخاف: جَعَلَهُ يَخاف/ ترسانی، تۆقانی، رۆحی برد.
خوف: ضِد أمن/ ترس، باك، بیم، تۆقین، رۆح چون، پەروا، سام.
بدون – / بێ باکی، نەترسان.
خَوفاً من/ لەترسی ئەوەی.
خَوّاف. خَوِّيف: ضَد شُجاع/ ترسنۆك، نەوێر.
خائف: ضِد آمِن/ ترساو.
– على/ لێی ترساو.
يَخاف الله: تَقي/ لەخواترس، پیاوچاك.
لا – / ناترسێ، بێباك، بێ بیم.
إخافَة. تَخويف/ ترساندن، تۆقاندن.
مَخُوف: يُخْشي او يُخاف منه/ جێ ترس، جێ مەترسی.
مُخيف: مُرعِب/ ترسناك، ترسێنەر، ئەرژەنگ، بەسام، سامناك.
خاف: شديد الخَوف/ ترسنۆك.
تَخويف/ ترسان، تۆقان، زراوبردن.
تَخَوُّف/ ترسان، ترس لێ نیشتن، سام (کردن، گرتن، لێ نیشتن).
مَخاوف/ مەترسی.
مَخوف. ما يُخاف منه/ ئەوەی لێی ئەترسێ، جێی مەترسیە.
خال:
خالَ: ساس/ هەڵی سوڕان، بەڕێوەی برد.
– على اهله: دَبَّرَ اُمورَهُم/ بردنی بەڕێوە، خاوەنداری کردن، کاروباری جێبەجێ کردن.
خَوَّل: فَوَّض/ دەسەڵاتی دایە.
تَخَوَّل: تَفَوَّض/ دەسەڵاتی وەرگرت.
مُخَوَّل: مُفَوَّض/ خاوەن دەسەڵات، دەسەڵات دار، باوەڕ پێکراو.
تَخويل/ دەسەڵات پێدان.
خَوَل: الحاشِيَةُ/ دەست و پێوەند.
خال: صاحِب الشيء/ خاوەن.
– : اخو الأم/ خاڵ.
– : شامَة/ خاڵ.
خالَة: اخت الأم/ پور.

خُؤُولة: النسبة الى الخال/ خالّوان.

خام:

خام نسيج من القطن/ خام.

– اسمر/ خام، خامی بۆر.

– ابيض/ بلوری.

خان:

خانَ: كان خائناً/ ناپاك بو.

– الرجلَ: غدر به/ دەست بەرداری بو، ناپاكی لەگەڵ كرد.

– العهدَ: نَقَضَهُ/ بەڵێنی شكان.

– عَهْدَهُ: هَجَرَهُ/ دەستی لێ بەردا، وازی لێ هێنا، بەجێی هێشت، دەستی لێ هەڵگرت.

– الأمانةَ: طمع فيها/ دەست پیسی و ناپاكی كرد.

– ه الدهر: غَيَّرَهُ الى الاسوأ/ تێشكا، نەیهێنا.

– ته رجلاه: لم يقدر على المشي/ نەی توانی بروات، قاچی نەی هێنا.

خَوَّنَه: نسبه الى الخيانة/ بوختانی بۆ كرد، بەدەست پیسی دانا.

إستخان: حاول الخيانة/ ویستی ناپاكی و دەست پیسی بكات.

خائن: ضِد امين/ ناپاك، دەست پیس.

– : خَوُون. خَوّان: غَدّار/ زۆردار، ستەم كار.

خَـوّان: كـثير الخيانـة/ ناپـاك و دەسـت پیسی بەردەوام.

خِيانَة: ضِد امانَة/ ناپاكی.

– : غَدر/ زۆرداری، دەست درێژی.

– عُظمی/ وڵات فرۆشتن، خیانەت لە وڵات و لەگەل.

– الأمانَة/ دەست پیسی.

– العهد/ بەڵێن شكاندن، بێ بەڵێنی.

خان: حانوت/ دوكان.

– : محل نزول المسافرين. فندق/ خـان، میوانخانە.

خانَة: عمود. حقل/ خانە، ستون.

– : مربع/ خانە.

خِوان: مائدة/ سینی و خوان.

– مستدير/ خوانی خڕ.

– مَدّاد/ خوانی لاكێش، سفرە.

خوى:

خَوَى. خَوِيَ: فَرَغَ و خلا/ چۆڵ بو، بەتاڵ بو، هیچی تیا نەما.

– . – . اخوى الرجل: خلا جوفه و جاع/ برسی بو، سكی هیچی تیانەما.

خَوَى. خَواء: خلو الجوف من الطعام. جوع/ برسیەتی، خورێن.

– . – : فراغ/ چۆڵی، بەتاڵی، بۆشایی.

خَوِى: خال البطن/ برسی.

خاوٍ: خالٍ. فارغ/ چۆڵ، بەتاڵ، بۆش.

خاب:

خاب: فَشَلَ/ نائومێد بو سەرنەكەوت، پرزە براوبو.

– امله: إنقطع/ هیوابراو بو.

خَيَّب. خيبَ امله: رَدَّهُ خائباً/ هیوای بری، نائومێدی كرد.

– طلبه: رَفَضَهُ/ دەستی بەڕویەوە نا، گەڕانیەوە.

– مَسعاه: أحْبَطَهُ/ رەنجی بەبادا، شكانی، بەزانی.

خَيْبَة: فشل/ سەرنەكەوتن، نشستی.

– الأمل/ هیوابڕان، نائومێدی، دەست لێ شتن.

خار:

خارَ: صار ذا خير/ خێردار بو.

– : إختار. تَخَيَّر. خَيَّرَ على: فَضَّلَ/ پەسەندی كرد، بە باشی زانی.

– . خـايَرَ: جعلـه يختـار/ سەرپـشكی كـرد، كـردی بەسەرپشك.

إختار. تَخَيَّر: إنتقى/ هەڵی بژارد.

إختر لنفسك ما يَحلو/ هەڵ بژێرە بە ئارەزوی خۆت.

خَير. ضِد شَرّ/ چاكە، باشە.

– : فائدة/ سود، فەڕ، كەڵك.

– : مال/ سامان، پیت.

– من . اخير: افضل/ باشتر، چاك تر.

– : كَرَم/ بەخشندەیی.

– : شَرَف/ ناموس، ئابرو.

فِعْلُ ال – : إحسان/ چاكە كردن.

خَيْراً: حَسَناً/ باشە.

خَيِّر: مُحْسِن. كريم/ پیاوچاك، خێرەوەمەند، بەخشندە.

خَيري. لأجل الخير او نفع الخير/ بۆ چاكە.

خَيريَّة. الجَودة و الفضل/ چاكێتی، باشی.

خيره. خِيار: افضل الشيء/ هەڵ بژێرراو، باشەکان.
خيار. إختيار: إنتخاب/ هەڵ بژاردن.
— : حُرِيَّة أو حَقّ الاختيار/ مافی هەڵ بژاردن.
اخْيَر: افْضَل/ باشتر، چاکتر.
إختيار. إنتخاب/ هەڵ بژاردن.
رَجُل — : شَيْخ مُسِنّ/ پیاوی پیر، بەساڵاچو.
إختياراً: طوعاً/ خۆبەخشانە، خۆرەس، لەخۆوە.
— : عن طيب خاطر/ بە ئارەزو، لەناخی دڵەوە.
إختياري: طوعي/ لەخۆوە، هەوەس.
— : إرادي/ ئارەزومەندانە، بە ئارەزو.
مُختار: مُنتَخَب/ هەڵ بژێرراو.
— : شيخ البلد/ موختار، کوێخا.
مُخَيَّر: غير مُسيَّر/ خۆکرد، هەوەس کار.
خِيار: نبات/ خەیار، ئارو.
— ماء/ ترۆزی.
خاس:
خاسَ: فَسُدَت الرائحة. تَعَفَّنَ/ بۆگەنی کرد.
— : نَقَص/ کەمی کردەوە.
— البيعُ: كَسَدَ/ فرۆشت نەما، بازاڕ شکا.
— بالعَهْد: نكث و غَدَرَ/ پەیمانی شکاند.
— بالوعد: أخلف/ لە بەڵێن لایدا.
— : ذَلَّ/ رسوا بو.
— : تَلَفَ/ رزی.
خياس: تَلَفَ/ رزین، بۆگەن کردن.
خايس: تالِف/ رزیو، بۆگەن.
خاش:
خاشَ: أخرج ما في الوعاء/ دەری دا، بەتاڵی کردەوە، هیچی تیا نەهێشت.
خَيَّش: طَرَّز بالقَصَب/ قامیش بەندی کرد.
خَيْش: الرجل الدنيء/ پیاوی خراپ، رسوا، ترۆ.
— : نسيج خَشِن من الكتان/ گونیە، گوش.
خَيشَة: خَيمَة/ دەوار، رەشماڵ.
— : غِرارَة/ گونیە، مۆر، خەرار، جەواڵ، تێرك.
خَيّاش: بائع و صانع الخَيش/ گونیە فرۆش.
خاط:
خاطَ. خَيَّط الثوب و غيره/ دروی.
— . — الشَقّ أو الجُرح: رَتَّقَهُ/ پینەی کرد، درویەوە.
— . إختاط. إختطى اليه مَرّ عَلَيه مَرّة واحدة أو سَريعَة/ سەرێکی لێدا.
خَيَّط. تَخَيَّطَ الشيبُ في رأسه: بدافيه الشيب/ سەری سپی تێ کەوت.
خَيْط. فَتْلَة/ پەت، دەزو، بەن، کنز، بەکرە، کشتەك، زی.
— : سلك/ پەت، تەل، تاڵ.
— البَنّاء: ميزان اعتدال الحائط/ تەناف، شاوڵ.
— القِنَّب/ گوش.
— الصوف/ بەن.
— القطن/ دەزو.
الـ — الابيض: بياض الصُبح/ بەرەبەیان.
الـ — الاسود: سواد الليل/ تاریکی شەو.
مِخْيَط. خِياط: إبرة/ دەرزی، سوژن.
خَيّاط. خائط. تَرزي/ بەرگ درو.
مَخيوط. مَخيط/ درواو.
خِياطَة: حِرفَة الخَيّاط/ درون، بەرگ درون، بەرگ درو.
مكنه — / مەکینەی درومان.
خِياط/ درومان، درومان کردن.
خيف:
خَيَّفَ عن القتال: نكص/ کشایەوە، کوڵی دا، پەکی کەوت.
اخْيَفَ الواناً: تنوعت الوانه/ هەمەرەنگ بو، رەنگاورەنگ بو.
اخْيَف. خَيفاء: عين زرقاء و اخرى كحلاء/ چاو دو رەنگ.
اخياف: مختلف/ جیاجیا.
بَنو — . اخْوَة — : أمهم واحدة و الاباء شَتّى/ برای دایکی، برای باوك جیا، زڕبرا.
خال:
خالَ: ظَنَّ/ وای زانی، باوەڕی وابو، واتێگەیی، پێی وابو، لای وابو.
إخال و اخالَ (المضارع من خالَ): يَظُنّ/ وا ئەزانێ، باوەڕی وایە.
خَيَّلَ. رَمَحَ بالحصان/ غاری دا، تاوی دا، رم بازی کرد.
تَخَيَّلَ: تَصَوَّرَ/ شێوەی کرد، هەستی وابو، وای هات بە خەیاڵدا، واهات بە بیریا.
— . تَخايَلَ. إختال: تَبَختَرَ و تَكَبَّرَ/ لەخۆی بایی بو، بەفیز بو.
تَخَيُّلَه: تَفَرَّسَه/ دیقەتی لێ کرد، سەرنجی لێدا.

خَيِّلَ اليه و له كذا: تـوَهَّمَ انـه كـذا/ واى هـات بـه خەياڵدا، خۆی بە شت زانی.
خايَلَ: فاخَرَ/ خۆی هەڵ كێشا.
خَيَّلَ: حَيَّرَ النظر/ بەشـەوارەكەوت، چاوی ڕێشكەو پێشكەی كرد.
– : حَيَّرَ خَبَلَ/ گێژی كـرد، شـڵەژانی، چەواشـەی كرد، سەری لێ تێك دا.
خَيـال. خـال: الظَـنّ و التـوهم/ خـەياڵ، ئەندێـشە، خەياڵ پلاو.
– : سحابٌ لا يَخْلُفُه مطر/ هەوری بێ باران.
– : طَيْف/ تارمايى، شێوە.
– : شـخض الرجـل و طلعتـه/ زەلام، زەلامەكـەی خۆی.
– : ظِلّ/ سێبەر.
تَخَيُّل: تَصَوُّر/ خەياڵ كردن، شێوە كردن.
خَيالى. تَخَيُّلى: تَصَوُّرى/ خەياڵ پەرست، ڕيش گاو.
– : ضِد حقيقى/ ناڕاست.
مُخَيِّلَـة و الخياليـة: القـوة التـى تُخَيِّـل و تمثـل الاشياء/ خەياڵ كردنەوە، بيركردنەوە.
خال: شامَة فى البدن/ خاڵ.
– : اخو الأم/ خاڵ.
– : الجبـل الـضخم/ شـاخى بلنـد، چيـاى گـەردن كەش.
– : الثوب الناعم/ كراس و بەرگى نەرم و شل.
– : لَجام الفرس/ لغاو.
– : الكفن/ كفن.
– : كِبر/ گەورەيى.
– . خائل. اُخائل: الرجل المتكبر/ پيـاوى بـەفيز، ڕۆح زل.
= : الرجل السَمِح/ پياوى لێبوردە.
خُيَلاء: عُجُب/ لەخۆبايى بون، خۆپەسەندى.
خَيْلان: إبْنَةَ البحر او الماء/ پەرى دەريا.
مُختـال: مُعْجَـب بذاتـه/ خۆويـست، خۆپەرسـت، لەخۆبايى.
خَيل: جماعَة الافـراس/ ئەسـپ، چـارەوێ، وڵاخـى بەرزە.
– اعوج الرجلين/ چوێڵ.
خَيّال: فارس/ سوار.
خَيّالَة: فرسان/ سوارە.
خام:
خام. خَيَّم: اقام بالمكان/ نيشتەنى بو، هەڵيدا.
خَيَّمَ. تَخَيَّمَ. نصب الخيمة/ (دەوار، چادر، خێـوەت)ى هـەڵ دا.
– عليه الظلام/ تاريكى بەسەراهات.
خَيْمَة: بيـت مـن الخـيش و غـيره/ چـادر، دەوار، خێـوەت، ڕەشماڵ، سەيوان.
عمود الـ –/ چەڵاك.
خِيام: هَوادج/ كەژاوە.
خَيّام: ساكن الخيم/ دەوارنشين.
– : صانع الخيم/ دەوارو چادر دروست كەر.
مُخَيَّم: مكان نصبت فيه الخيام/ چادرگا، هـەوار، هـەوارگا، خێوەتگا.
خام: مواد لم تتناوله يد الصناعَة/ كەرەستەى خاو، خاكە.
– : ساذَج/ غەشيم، ساويلكە، ساكار.
– : غير مَصقول/ دەسكارى نەكراو، زبر، خاو.
خامات: مواد اوليَّه/ كەرەستەى خاو.



داب:

دَأَبَ فـى العمـل: جَـدَّ و تَعَـبَ/ رەنجـى دا، تێکۆشـا، هەوڵیدا، هیلاك بو.

– فى العمل: إستمر عليه/ بەردەوام بو، کۆڵی نەدا.

– فـى الـشَّرِّ: إنهمك فى الـشَّرِّ/ خراپـەو شـەڕی کـردە پیشەو خوی پێوەگرت، دەستی دایە خراپە.

دَأْب. دَأَب: مُواظِبَة. مُثابَرَة/ کۆڵ نەدان، بەردەوامی.

– . – : جَدَّ و تَعبَ/ رەنج دان، تێکۆشـان، شـەکەتی، هەوڵ دان.

– : عادَة/ خو، رەوشت و خو.

دائِب. دَؤُوب: مُثابِر. مُجِدّ/ تێکۆشـەر، رەنـج دەر، کۆڵ نەدەر، بەردەوام.

دَئِب: تَعِب/ هیلاك، شەکەت، ماندو.

داء (فى دوأ) دائرة (فى دور) دابر (فى دبر) دابَّـه (فـى دَبَّ) داجـن (فـى دجـن) واحـس (فـى دحـس) داخ (فـى دوخ) دار، دارّ (فـــى دور) دارِ. داری (فـــى دری) داس (فى دوس) داع (فى دعو) داعب (فى دعب) داعـر (فـى دعر) داعی (فى دعو).

دال:

دَأَل: خَدَعَ/ فێڵی کرد، گزی کرد، ساختەی کرد.

داءَلَـهُ: خاتلـه. خَدَعَـهُ/ فێڵـی لێ کـرد، گـزی لێ کـرد، خەڵەتانی، هەڵی خەڵەتان.

دُؤَل. دُئل. دالان. ابن آوی/ چەقەڵ.

دُؤلول: داهِيَة/ زۆرزان، فێل باز.

دام. داما (فى دوم) دان (فـى ديـن) داهيـه (فـى دهـى) داوم (فى دوم) داوی (فى دوی).

دَب:

دَبّ: سری/ تەنیەوە، تێێ چو.

– . مَشَى. زَحَفَ/ خشا، خشکا، بەسەر سنگ رۆی.

– : حَبا/ کاکۆلکێی کرد.

– الشِقاق بينهم/ ئاژاوە یان تێ کـەوت، نـاکۆکی کەوتـە ناویانەوە.

– فيه الفساد/ خراپەی تێ کەوت، بۆگەنی کرد.

دَبوب. ديبـوب: السمين من كل شيء/ قەڵەو، خـرپن، گۆشتن، تێك سمڕاو.

– . – : نَمّام/ بوختان کەر، فیتنە، دوڕو، زۆربڵێ، دوزمان، بەدەمەوە هەڵ بەست.

داب. زاجِف/ خشۆك.

دابّة: ماشية/ گیانەوەر، ئاژەڵ، زیندەوەر، دەعبا.
دَواب: مواشي/ ئاژەڵ.
دُوَيْبَة: حَشَرَة/ مێرو، جانەوەر، دەعبا.
دُبّ: حيوان/ ورچ.
الـ – الاكبر: بنات نعش الكبرى/ حەوتەوانە.
الـ – الاصغر: بنات نعش الصغرى/ حەوتەوانەی بچوك.
دَبّابَة: آلة حربية/ تانك.
– : حيوان زاحف/ خشۆك.
دَبْدَبَ الحافر: صَوَّت/ سمكۆڵی كرد، تەپە ودەنگی سمی هات.
– برجله: صَوَّت/ تەپەی پێی هات.
دَبْدَبَة: وَقع الاقدام/ تەپەی پێ.
دَبدوبَة: طَرَف/ نوك.
دبخ:
دُبّاخ: لُعبَة النطّ/ سنگەوباز، دایماسۆن.
دبر:
دَبَرَ. أدبَرَ: وَلّى. إنصرم و مَضى/ رۆی، تێپەڕی، لێ بوەوە، تەواوبو.
أدبَرَ. وَلّى الادبار. وَلّى/ هەڵات، رای كرد، تێی تەقان، بۆی دەرچو.
– : مات/ مرد، گیانی دەرچو.
دَبَّرَ: رَتَّبَ/ ڕێكی خست.
– : هَيَّأَ. أعَدَّ/ ئامادەی كرد، پێكی هێنا، جێبەجێی كرد.
– : أوجَدَ و قَدَّمَ/ هێنایە كایەوە، پێشكەشی كرد، دۆزیەوە.
– : ساسَ/ بەڕێوەی برد.
– : إقتصدَ/ پاشەكەوتی كرد.
– تُهمَةً: لَفَّقَها/ بۆی هەڵ بەست.
– خِطَّةً: وضع خطه/ نەخشەی كێشا، تەگبیر كرد.
– مكيدة: دَسَّ على/ پیلانی گێڕا.
تَدَبَّرَ الأمرَ: تفكر فيه و نظر في عواقبه/ كارەكەی سازكرد بە بیركردنەوە، سازاندی، پێكی هێنا.
– في ماله/ گوزەرانی كرد.
تدبير: ترتيب/ ڕێك خستن.
– : سياسه. إدارة/ رامیاری، بەڕێوەبردن.
– : إيجاد و تقديم/ هێنانە كایەوە، پێشكەش كردن.
– : إقتصاد/ ئابوری، پاشەكەوت.
– المنزل/ ماڵداری، ماڵ بەڕێوەبردن.
– مكيدة/ پیلان گێڕان، تەگبیركردن.
مُدَبِّر: مُرَتِّب/ ڕێك خەر، بەڕێوەبەر، پێكهێنەر.
– مكائد/ پیلانگێڕ، تەڵەكەباز، داونەرەوە، تەگبیركەر.
مُدَبَّر: مُرَتَّب/ ڕێك خراو.
– : مُهَيَّأ. مُعَدّ/ ئامادەكراو.
دابر: آخر كل شيء/ ئەوپەڕ، كۆتایی.
– : أصل/ رەگ، سەرچاوە، بنەڕەت، بنەچە، رەسەن.
– : ماضٍ/ رابوردو.
قَطَعَ دابِرَهُ: إستأصل شأفته/ ریشەی دەرهێنا، لە بنا هەڵیكەند، بنەبڕی كرد.
قَطعُ الدابر: إستئصال/ بنەبڕكردن، ریشە دەرهێنان، بن بڕكردن.
دُبُر: مَقْعَد/ كۆم، كون، قنگ.
– : مُؤخِرة/ پاش، كۆتایی، بن.
دَبّور. دَبْرَة: زنبور/ زەردەواڵە.
دَبور. ريح غربية/ بای خۆرنشین.
دبر. دبر: مَوت/ مردن.
دبس:
دَبَّس الشيء: أخفاه/ شاردیەوە، بۆسەیدا.
– الشيءُ: إختفى/ ون بو، دیارنەما، شاردرایەوە.
– العنبُ: إشتدت حلاوته/ باش گەیی، شیرین بو.
– العصير المغلي: صار دِبساً/ خەست بوەوە، بو بە دۆشاو.
دِبس: عسل العنب و التمر/ دۆشاو، دۆشاوی (خورما، تری).
دَبّاس: صانع و بائع الدبس/ دۆشاوگر، دۆشاوفرۆش.
دَبْس: كثير/ زۆر، مشە، فرە، زەبەندە.
دَبّوس/ دەمبوس، دەرزی سەرخڕ.
– انكليزي/ دەرزی سنجاق.
– رسم/ دەرزی سەرپان.
– شَعر/ تەوقە.
دوباس النخيل: آفة/ مێرو، مێروی خورما، مێش قەسپ.
دبغ:
دَبَغَ الجِلدَ: لَيَّنَهُ و أزال ما به من رطوبه ونتن/ پێستەی خۆش كرد، دەباخی كرد، تاڵی دا، تالاوی كرد.
– : صَبَغ/ بۆیەی كرد، رەنگی كرد.

دبغ. دبغَة. دباغ. دباغَة: مايُدبَغ به الجلد/ کەرەستەی پێستە خۆش کردن.

دَبغ. مدبوغ/ پێستەی خۆش کراو، تاڵ دراو.

دباغَة: مِهْنَة الدبّاغ/ پێستە خۆش کردن، دەباخچێتی.

دبّاغ: الذی یَدبغ الجلد/ پێستە خۆش کەر، دەباخچی.

مَدبَغَة: موضع الدبْغ/ دەباخانە، دەباخ خانە.

دَبْغ الجلود/ پێستە خۆش کردن، تاڵاوکردن، تاڵ دان.

دبق:

دَبِقَ الطیرَ. دَبَّقَه: صادَهُ بالدِبْق/ راوی کرد بە قاچ پیالکان.

دَبِقَ به: لَصِقَ/ پیانوسا پیالکا.

تَدبَّقَ الطیرُ: اصطید بالدبق/ بە قاچ پیالکان گیرا.

– الشیء: تَلَزَّج/ لینج بو.

دَبِق: لَزِج/ لینج، لکێنەر.

دبق. دابوق. دَبوقاء: غِراء أخضر اللون/ کەتیرەی سەوز، غرێ.

– . – : نبات/ دەموکانە.

دبل:

دَبَلَ: سَمَّدَ/ پەینی کرد.

دُبال: سَماد/ پەیین.

دَبْل: طاعون/ رشانەوە.

– . دَبْلَة: دُمَّل باطنی/ دومەڵی (نادیار ناوەوە).

– : ثقب الفاس/ کونی تەور.

دُبْلَه: اللقمه الکبیرة/ پاروی زل.

– : کُتلَة/ تۆپەڵ.

دبلَة: خاتم بلا فصّ/ ئەڵقە، ئەموستیلە.

دبور (فی دبر) دبوس (فی دبس)

دبی:

دُبِّیَت الارض: اکل الدَبی نباتها/ کوللە مسکە یا کوللە پێ کورە هەموی خوارد.

دَبی. دَباة: حوریات الجراد/ کوللە مسکە، پێ کورە.

دثر:

دثر. إندثر: إمَّحی/ سڕایەوە، کوژایەوە، لەناوچو، پوکایەوە.

إدَّثَر: إقتنی دثراً/ زۆری کۆکردەوە، پارەو ماڵی چاکی نایە سەریەك.

دَثَّرَ: مَحَّی/ لەناوی برد، کوژانیەوە، سڕیەوە، پوکانیەوە.

– : غَطّی/ دای پۆشی، پیایادا.

دثار: غِطاء/ داپۆشەر، سەرەخەر، لیفە بەتانیە جاجم.

دُثور. إندثار: إمّحاء/ سڕینەوە، کوژانەوە، لەناوچون.

مُتَدَثِّر. مُدَثَّر: مغطاة/ داپۆشراو.

دَثْر: المال الکثیر/ سامان.

إندثار. تقلیل القیمة و النوعیة/ لە نرخ کەم بونەوە، پوکانەوە، کەم بونەوە.

دَثور. دَثاری: الکسلان الخامل/ تەمەڵ و تەوەزەل.

– . – : نَؤوم/ خەوخۆش، زۆرنەنوێ، خەمۆك.

دج:

دَجَّ القومُ: دَبّوا ساروا سیراً ثقیلاً/ لەسەرخۆ تێپەڕین، بەهێواشی ڕۆیشتن.

– البیتُ: قَطَرَ سقفه/ دڵۆپەی کرد.

دَجَّجَ. تَدَجَّجَ بالسلاح: لَبِس السلاح/ چەکی لەخۆی دا، چەکی بەست، خۆی پڕچەك کرد.

– ت السماء: تَغَیَّمَت/ هەوری کرد، بەری ئاسمان بە هەور گیرا، بو بە هەورو هەڵا.

مُدجَّج. مُدَجِّج: اللابس السلاح/ پڕچەك.

– : قُنفُذ/ ژیشك.

دُجَّة. ظلمة شدیدة/ تاریکی، شەوەزەنگ، نوتەك، ئەموستە چاو.

لیلة دیجوج. لیل دَجوجی: مُظلِمَة/ شەوەزەنگ، تار.

دَجاج: دُجاج. دِجاج: طیور داجِنَة/ باڵندەی ماڵی.

– : طیر الدَجاج/ مر، مریشك، مامر.

– بَرّی/ مرەباخی.

– الهند او الحَبَش: ترکی، رومی/ قەلەمون، عەلی شیش.

دَجاجة: طیر/ مریشکێك، یەك مریشك.

– الارض/ مرە لارە.

دَجاجی: مختص بالدجاج/ پسپۆڕی باڵندەی ماڵی.

دجر:

دَجِرَ: حار/ تیاما، سەری سوڕما.

دَجِر. دَجران: حائر/ تیاماو، سەرسوڕماو.

دَیجور: ظلام/ تاریکی.

دجل:

دَجَلَ: کَذِب/ درۆی کرد.

— : طلاهُ بالدَّجيل/ چەوری کرد، تاری تێ هەڵسو، بە قەتران هەنوی.

دَجَّلَ: طلاهُ بالدَّجال/ زێرپۆشی کرد.

— الارض: اصلحها بالدَّجال/ پەینی تێ (کردن، دا).

— : طَلّی/ دای پۆشی، بۆیەی لێدا، رەنگی کرد.

— عليه: خَدَعَهُ/ هەڵی خەڵەتان، خەڵەتانی، فێڵی لێ کرد.

— : إدّعی السحر/ جادوی کرد.

دُجَيل. دُجالَة: قطران/ تار، قەتران، رۆنی هەندێ درەخت.

دَجّال: ماء الذهب/ زێرپۆش، روکەش، زەرکەفت، زەرکفت.

— : كَذّاب/ درۆزن، جامباز، دەست بڕ.

— : عَرّاف/ جادوگەر، فاڵچی.

دَجال: سَرجين. الزبل/ پەیین، تەپاڵە، رجین، زبڵ.

دجن:

دَجَنَ: اَلِفَ و استانس/ ماڵی بو، هۆگر بو، کەوی بو.

— ادجَنَ الليلُ: إسوَدّ/ تاریك داهات، تاریکی کرد، بو بەشەو.

داجَنَ: داهَنَ و خاتَلَ/ مەرایی کرد، ماستاوی کرد، مامەحەمەیی کرد.

مُداجَنَة: مُلاطَفَة/ نەوازشت.

ادْجَن. دَجناء: مُظلِم. سواد/ تاریك، رەشی.

دَجن: غيم مُظلِم/ هەوری تاریك.

— : المطر الكثير/ بارانی زۆر، خوڕ، لێزمە.

دُجنَة: ظُلمَة/ تاریکی.

داجِن: بَيتي: اَليف/ ماڵی، هۆگر، کەوی، رام.

حيوانات داجِنَة/ ئاژەڵی ماڵی، کەوی.

طيور داجِنَة/ باڵندەی ماڵی، کەوی.

تدجين: تاليف. تدريب/ راگرتن، ماڵی کردن، رام کردن.

دجا:

دَجا الليلُ: إظلَمَ/ تاریکی کرد، تاریك داهات.

داجی: داری و ساتَر العَداوَة/ ریایی کرد، درۆی کرد، مەرایی کرد، قوزکەشی کرد.

— : لاطف و ساير/ کاڵتەی لەگەڵ کرد، بەدەمیەوە پێکەنی.

دُجی. دُجيَة: ظلام/ تاریکی، نوتەکی.

دياجي: ظلمات/ تاریکستان.

مُداجاة: تَزَلُّف. خُشوع/ مەرایی، نەوازشت، دەست بڕین، خەڵەتاندن.

دح:

دَحْدَح: قصير و سمين/ کورت و قەڵەو.

دحر:

دَحَرَ: هَزَمَ/ شکانی، بەزانی، بۆڕی دا.

مَدحور: مَغلوب/ شکاو، بەزیو، بۆڕدراو.

دَحْر: هَزم. تهزيم/ شکاندن، بەزاندن، بۆڕدان.

إندحار: هزيمة/ شکان، بەزین، تێشکان، بۆڕخواردن.

دَحْرَجَ. تَدَحْرَجَ الشيء: إنقلب على نفسه/ (تل، گل، خل، گلۆر، تلۆر، خلۆر) بوەوە.

تَدَحرُج. دَحْرَجَة/ گل، تل، خل، گلۆر، تلۆر، خلۆر) بونەوە.

دُحروجَة: مايُدَحرِجه الجُعَل/ ئەو تەرسەقولەی کە قالونچە تلی ئەدا، خلێنکە.

دحس:

دَحَسَ بَينَ القوم: افسد/ ئاژاوەو کێچەڵی نایەوە.

— : مَلأَ/ پڕی کرد.

— يَدَهُ: ادْخَلَها/ دەستی تێ خست، چنگی پیاکرد.

دَحِسَ الأصبُع: اصابهُ الداحوس/ موی لێ هات.

داحِس. داحوس: وَرَم حار في طرف الاصبع/ مو، دومەڵ.

— — : عقدة القدم/ بزمارە.

دحض:

دَحَضَ. دَحَّضَ. ادْحَضَ الحُجَّة: ابطلها/ بەتاڵی کردەوە، بەدرۆی خستەوە، بیانوی بڕی.

— عن الأمر: بَحَثَ/ لێی کۆڵیەوە، بۆی گەڕا.

— ت رجله: زلقت/ پێی هەڵ خلیسکا.

— إندَحَضَ: بَطُل وزال/ بەتاڵ بوەوە، بەدرۆکەوتەوە.

دَحْض: تفنيد و ابطال/ بەتاڵ کردنەوە، بەدرۆخستنەوە.

— دَحَض: المكان الزلق/ خلیسك.

لايُدحَض: لايُنقَض/ ناگۆڕێ، نەمێنێتەوە وەك خۆی.

مَدحَضَه: مَزلَقَة/ خلیسکە.

دخس:

دَخَسَ الشيءَ في الرماد: دَسَّهُ/ کردی بەژێر خۆڵەمێشەوە.

دَخْس: السمين المكتز/ قەڵەوی تێك سمراو.

دَخَس: ورم فـي حـافر الدابَّة. مـرض تعفـن الظلـف/ دەردێکه له سمی وڵاخدا، سم گەنین، ئارنگ، شەلکە.

دُخَس: دلفین/ دولفین.

دخل:

دَخَلَ: ضد خَرَجَ/ چوه ناوی، تێی چو، خۆی پیاکرد، هاته کایەوه.

— : حَلّ. إبتدأ/ دەستی پێ کرد، تێ هەڵ چوه.

— في: إخترق/ سمی، کونی کرد، پیاچو، پیاتێپەڕی.

— عليه: زاره و واجهه/ سەری دا، چوه لای.

— ضمن كذا: صار مَع/ چوه ئەو کۆمەڵەوه، لەگەڵ ئەوانەدا بو.

— بلا استئذان: إقتحم. تَطفّل/ بێ پرس خۆی (پیاکرد، تێخست، تێهەڵ قوڵتان).

— الجمعية/ بو بە ئەندام.

— على زوجته/ چوه لای ژنەکەی، چوه پەردەوه.

دَخَلَهُ الشك. إرتاب/ گومانی کرد، دڵی پیس کرد.

دَخّلَ. أدْخَلَ: جعله يدخل/ پیاکرد، خستیە ناوی.

— . — : دَسّ/ تێی ئاخنی، تێی فڕێدا، تێی خست.

— . — : سَمَحَ بالدخول/ ڕێیدا، ڕێی بۆ کرد، کردیە ژورەوه.

— : صَحِب و قاد الى الداخل/ پێشی کەوت، ڕێی نیشان دا

تَدَخَّلَ: في الأمور: أدخل نفسه فيها/ خۆی تێ هەڵ قوڵتان.

— الشيء: دخل قليلاً قليلاً/ وردە وردە یا کەم کەم پیاچو، چوه ناوی.

دُخِلَ في عقله: داخله الفَساد/ تێك چو، هۆشی نەما، شێت بو.

تَداخَلَ: دخل بَعْضَه في بعض/ چو بەناویەکدا، ئاڵۆزا، ئاڵۆزکا، تێ هەڵ کێش بو.

— بينهم. تَدَخَّلَ: تَوَسَّطَ/ کەوتە بەینیانەوه، ناوبژی کردن.

دُخول: ضد خُروج/ چونەناو، چونەژور، هاتنەکایە.

— : إختراق. نُفوذ/ پیاچون، پیاتێپەڕین.

دُخوليَّة: أجرة الدخول/ کرێ یا مزی چونە ژور، دەرگانە.

داخِل: ضد خارِج/ ئەچێتە ناو.

— الشيء: ضد خارجه/ ناو، ناوەوه، ناوەکەی.

من الداخل/ له ناوەوه.

داخلاً: نحو الداخل/ بۆ ناوەوه.

داخلي: ضد خارجي/ ناوەکی، ناوخۆیی، لەناوخۆدا.

— : خصوصي/ تایبەتی.

مَدرَسَة داخلِيَه/ قوتابخانەی ناوخۆیی.

مُشاغَبات داخلية/ ئاژاوەی ناوخۆیی.

وَزارَة الداخلية/ وەزارەتی ناوخۆ، شالیارێتی ناوخۆیی.

وَزير الداخلية/ وەزیری ناوخۆ، شالیاری ناوخۆ.

داخلياً: في الداخل/ لەناوخۆدا.

تداخُل: تَدَخل. مُداخَلَة/ دەست تێ خستن.

— / بەیەکداچون، ئاڵۆزکان، تێ هەڵ کێش بون.

خاصيَّة التداخل/ تێکەڵ بون.

خاصية عدم التداخل/ تێکەڵ نەبون.

مُتَداخل في ما لا يعنيه/ خۆی له هەمو شت هەڵ ئەسوێ، خۆی تێ هەڵ ئەقوڵتێنێ.

— : غليظ مكتز/ تێك سمراو.

— / بەیەکاچو، تێکەڵ و پێکەڵ.

مَدخَل: موضع الدخول/ گوزەر، ڕاڕەو، شوێن چونە ناو.

تَدَخُّل/ خۆتێهەڵ قوڵتان.

دُخْلَة. لَيْلَة الدُخْلَة. زفاف/ پەردە، شەوی پەردە، چونە پەردە، شەوی (زاوایی، بوکێنی).

دَخْل: رِيبَة. شَك/ گومان، ترس.

— . دَخَل: فَساد العقل/ تێك چون، شێتی.

— : مَدخول: ربح. إيراد/ دەستکەوت، بەرهەم، دەرامەت.

ضَريبَة الـ — / باجی دەستکەوت.

دَخيل: غريب/ نامۆ، دەرەکی، ناوەکی.

— : ضد أصيل/ نارەسەن، ناکەس، هەرچی و پەرچی.

داء — : مرض باطني/ دەردی ناوسك.

دَخيلك: من فضلك/ تکایە، دەستم دامێنت.

دخيلة المرء: باطنُهُ و نيَّتُهُ/ هۆش و ڕا، شاراوه، مەبەست.

— الأمر: سِرُّهُ/ نهێنی.

دخمس:

دَخْمَس: خَدَع/ مەڵی خەڵەتان، فێڵی کرد، خەڵەتانی.

دَخْمَسَة: خِداع/ مەڵ خەڵەتان، فێڵ کردن، خەڵەتان.

دخن:

دَخَنَ. ادْخَنَ. إ. إدَّخَنَت النارُ: خرج دُخانها/ دوكەڵی لێ هەڵسا، ئاگرەكە دوكەڵی كرد.
دَخِنَ. دَخِنَ الطعام: أصابَهُ الدخان في حالة طهية/ بۆنی دوكەڵی گرت.
– ت.– ت : أدخنت النار: هاج دخانها/ دوكەڵی كرد.
– خُلُقُه: ساء و فَسُدَ و خَبُثَ/ خراپەی كرد، رەفتاری تێك چو، رەوشت و خوی خراپ بو.
دَخَّنَ. تَدخَّنَ: صَيَّر الدخانَ يعلوه/ دوكەڵاوی كرد، دوكەڵ دای پۆشی، دوكەڵی گرت.
– التبغ/ جگەرەی كێشا.
دَخَن. دُخان: دُخَّان/ دوكەڵ.
– . – : بُخار/ هەڵم.
دُخان. دُخَّان: تبغ/ توتن.
دَخِن: فيه رائحة الدخان/ بۆدوكەڵ، بۆنی دوكەڵی لێ دێ.
أدخن. دَخناء. داخن. مُدْخِن. دَخنان: مايغشاه الدخان/ دوكەڵاوی، دوكەڵ دایپۆشیوە.
داخِنَة. مَدْخَنَة: مايَخرُج منه الدخان/ دوكەڵ كێش.
مدخَنَة. مِجْمَرَة/ ئاگردان.
دُخنة: لون الدُخان/ دوكەڵی، رەنگ دوكەڵ.
دَخاخني: بائع التبغ/ توتن و جگەرە فرۆش.
– : عمل دُخَّان/ دوكەڵ كردن، قانگ دان.
مُدخِّن: شراب السجاير/ جگەرەكێش.
تدخين: شُرب السجاير/ جگەرەكێشان.
– : عمل دُخَّان/ دوكەڵ كردن، قانگ دان.
دَخَن: فساد/ خراپەو دڵ پیسی.
دُخْن: نبات/ هەرزن، گاریس، گاڵ.

دد:

دَدُ. دَدَن: لَهو ولَعِب/ یاری و گەمە، لاقرتێ.
– : حين/ ماوە، كات.
دَيْدَن: الدأب و العادة/ خو، راهاتن، نەریت.

در:

دَرَّ. إستَدَرَّ الحليب و العرق و البول. كَثُرَ/ زۆربو.
– ت الدنيا على نهلها: كثر خيرها/ دنیا پڕ خێرو خۆشی بو، هەرزانی بو.
– السِراجُ: أضاء/ شەوقی دایەوە، درەوشایەوە (چرا).
– وجهُهَ: حَسُنَ بعد العِلَّة/ رەنگ و روی (تێ كەوت، كرایەوە).
– السوقُ: راجَت و نفق متاعها/ بازاڕ گەرم بو.
– الفرسُ: عدا شديداً/ تاوی دا، دایەغار، ماینەكەی رەتاند.
دَرّ. دِرَّة. لَبَن/ شیر.
– . – : كثرة اللبن/ شیر زۆری.
دارّ. دَرور: كثيرة اللبن/ ئاژەڵی شیر زۆر.
مدرار: غزير السيلان/ زۆری لێ دێ.
عَيْنٌ – : تَدُرُّ بالدمع/ چاوی بە فرمێسك.
سماء – : تَدُرُّ بالمطر/ باراناوی، ئاسمانی بە باران.
دِرَّة: ضَرع/ گوان.
لله دَرُّهُ، دَرُّهُ: مَرحى/ ئافەرین، چاكی كرد.
دُرّ. دُرَّة: جَوهرة/ گەوهەر.
– . – : لؤلؤة/ مرواری.
دُرَّة: ببغاء صغير/ توتی بچوك.
– : جُمانة/ مرواری.
– يَتيمَة/ گەوهەرو مرواری بێ هاوتا.
دُرّي: مُضيء/ درەوشەدار، بەشەوق، تیشكدار.
كوكب – / ئەستێرەی درەوشەدار.
مُدِرّ للبول/ میزهێن، میزی پێهێنا.
– للحليب/ شیرهێن.
إدرار بَول/ میز.
– الحليب/ شیردان.

درأ:

دَرَأ: دَفَعَ. صَدَّ/ گێڕایەوە، دوری خستەوە، لەخۆی دورخستەوە.
دَرْء: دَفْع/ دورخستنەوە.
دريئة: هَدَف/ نیشانە، مەبەست، نیشان.
– : مايَستَتِرُه الصائد ليخدع الصيد/ داهۆڵ، بەرەڕەت، نێچیر خەڵەتێن.

درب:

دَرِبَ به. تَدَرَّب عليه: تَمَرَّنَ/ مەشقی لەسەر كرد، پێی فێربو.
– . تَدَرَّب بالشيء و عليه: إعتاده/ پێی راهات.
دَرَّب في الأمر و عليه: مَرَّنَ و عَوَّدَ/ مەشقی پێ كرد، فێری كرد، رای هێنا.
تدريب: تَمرين/ مەشق كردن، راهێنان، فێركردن، رام كردن.

دُربه: تَمَرُّن وخبرة/ راهاتویەتی و زانیاری، فێربون.

مُدَرَّب. مُتَدرِّب: مُتَمَرِّن/ راهاتو، فێر، مەشق کردو.

مُدَرِّب: مُعَلِّم. مُرَوِّض/ مەشق کار، فێرکار، راهێنەر.

دَرب: طریق/ رێگا، رێڕەو.

– : طریق فی الجبل/ رێگەی ناوشاخ.

– : خارج الدار/ دەرەوە، کۆلان.

درج:

دَرَجَ: مَشی/ رۆی، تێپەڕی، پێشکەوت.

– . إنـدَرجَ القومُ: مـاتو و إنقرضـوا/ مـردن، نـەمان، ناویان کوێر بۆوە، لە ناوچون، فەوتان.

– الأمرُ: إنتشر/ بڵاوبوەوە، بو بە باو.

– الزيُّ: أصبح دارِجاً/ بو بەمۆدە، بو بەباو.

– . درَّج: طوی/ قەدی کرد، پێچایەوە، لولی کرد.

دَرجَ: مَضی لسبیله/ بەرێ و شوێنی خۆیەوە رۆی.

– : تَدَرَّجَ: صَعَد فی المراتب/ پلە پلە سەرکەوت.

دَرَّج: قَسَّمَ الی درجات/ بەش بەشی کرد.

– الی کذا: تحرك و صعد تدریجیاً/ پلە پلە سەرکەوت.

تدرَّجَ الی کذا: تَقدَّمَ شیئاً فشیئاً/ پلە پلە سەرکەوت.

دَرَّجَ البناء: جعل له درجاً/ پلیکانە یا پەیژەی بۆکرد.

أدرجَ الشيء فی الشيء: أدخله ضمن/ تـێ هـەڵ کێشی کرد.

إندرج فی کذا: دَخَلَ/ تێ هەڵ کێش بو، تـێ کـەوت، تێـی چو.

إستدرجه: رَقّاه بالتدریج/ بـە شێنەیی پێشی خـست و بەرزی کردەوە.

– : خدعه/ مەڵی خەڵەتان، خەڵەتانی.

– : قَرَّبَه الی کذا/ لێی نزیك کردەوە.

– الی الأقرار بالحقیقة/ پێی درکان، لێی دەرهێنا.

دَرَج: طریق/ رێ، رێگە.

– : السُلَّم/ پلیکانە پەیژە، قالدرمە.

أدراج (جمـع درج). رجعـت أدراجـي: أي فـی الطریـق الذي جئت منه/ بەرێی خۆما هاتمەوە.

دَرَجَة: رُتبَة. منزلة/ پایە، پلەی کۆمەلایەتی، پلە.

– : طور. دَور/ قۆناغ.

– : عَلامَة. رقم/ نیشانە، ژمارە.

– : مکان. صَفّ/ پۆل، پلە.

– المرقاة/ پلە، پلەپەیژە.

– فی القیاس/ پلەك، ۱\۳٦۰ بەش لە چێوەی گۆ.

– السیر أو التقدم/ تێکرایی.

– أولی / یەکەم، لە هەموان باشتر.

– الحرارة/ پلەی (گەرمایی، گەرمی).

– الانجاد/ پلەی بەستن.

– الاتقاد/ پلەی کڵپە.

– الغلیان/ پلەی کوڵان.

– الانصهار/ پلەی (شل بونەوە، تواندنەوە).

تَدرُّج. تَدریج/ پلەپلە، یەك لە دوای یەك.

تدریجاً. بالتدریج: شیئاً فشیئاً/ بەریز، بـە شـێنەیی، بە پلە، کەم کەم.

مُـدَرَّج: مُقَسَّم الی درجات و أقسام/ پلەپلە، خانەخانە، تەلان تەلان.

مَدرَج. مَذهب و مسلك/ رێ باز.

– المطار/ نیشتگە.

دَرّاجَـة: عَجَلَـة/ پایـسکل، پاسـکیل، دوچـەرخە، ئەسـپە ئاسنینە.

دَرْج. ادراج (ذهب دمه دَرْج أو أدراج الریاح): هَوداً/ بـە فیڕۆ، خوێنەکەی بە فیڕۆ رۆیشت.

– : طومار/ تۆمار، نوسراوی لولەکراو.

دارِج: مُتَداوِل/ ئەوە ی لە ناوایە.

– : مألوف/ باو، ناسراو.

– : عادي/ ئاسایی.

– علی الزي المألوف/ باو.

طفل – : یَـدُبّ/ کاگۆڵکـێ ئـەکا، خەریکـە پـێ ئـەگرێ، پێ‌رەوکە (ساوا).

دُرج: جارور/ چاوی مێز، چەکمەجە.

دُرّاج: طیر/ سوێسکە

درد:

دَرِدَ: ذَهَبَت أسنانه/ دانەکانی نەمان.

أدْرَدَهُ. أدْرَدَ أسنانه: أذْهَبَها/ دانی پێوە نەهێشت.

أدْرَد. دَرْداء: أهْتَم. لا أسنان له/ بێ‌دان، دەم پوچەڵ.

دَرْدَ بیس: عجوز/ پـیر، پـەك کـەوتو، پـەرپوت، نەنکـە قوتەڵە.

– : داهِیَة/ دانا، زۆرزان.

دَرْدَار: شَجَر/ دارە رەش، رەشەدار، داربناو.

دُرْدُور: دَوّامَة/ مزراح.

دُردي: عَكر/ نیشتو، لیخن، شێلەو.

درز:

دَرَزَ: خاط خياطة مُتَلَزِزَة/ چنی، بەوردی دروی، سفت چنی.

دَرْزَة: غُرْزَة/ تەقەڵ، تیك.

دَرزي: خَيّاط/ بەرگ درو.

تدريز: خياطه/ درون، درونەوە، تەقەڵ تێ هەڵ دان.

درس:

دَرَسَ: مَحي/ سرپەوە، کوژانیەوە.

ـ : بَلِيَ/ کۆن بو.

ـ العلم أو الكتاب: أقبل عليه يَحْفَظَهُ/ خوێندی، کۆششی کرد.

إنْدَرَسَ: إمَّحى/ سرایەوە، کوژایەوە.

دَرَّسَ. ادرس: عَلَّمَ/ فێری کرد، وانەی وتەوە.

دَرْس. دُروس: مَحو/ سرینەوە، کوژانەوە.

ـ (الجمع دروس): ما نتعلمه/ وانە.

ـ . دراسة: مُطالَعَة أو فحص/ خوێندن، پشکنین، فێربون، توێژینەوە، لێکۆڵینەوە.

ـ . دِراس الحنطة: دَقّها/ کوتان.

ـ . دِرس. مَدْروس: الثوب البالي/ جلەشڕ، کۆنە.

مَدرسَة: مكان التعليم/ قوتابخانە، فێرگە.

ـ جامعية/ زانکۆ.

ـ عالية أو كلية/ کۆلیج.

مُدَرِّس: مُعَلِّم/ مامۆستا، فێرکار.

دِراسَة/ خوێندن، کۆشش، کۆڵینەوە.

آلة الدراس: نورج/ جەنجەر.

دَرّاسَة: ماكنه الدراس/ کۆمباین.

دَريس: برسيم مجفف/ گرزە، هەڵیس، گیشە، وێنجەو سێپەرەو گژوگیای وشك کراوە.

درداس: كلب كبير الراس/ سەگی کەللەزل.

درع:

دَرَعَ: سَلَخَ/ گروی.

ـ . إندرع العظم: إنخلع/ لەجێ چو (ئێسقان).

دُرِعَ. أدرعَ الماء: أكل كل شيء قريب منه/ رای‌دا، راپێچی دا.

دَرَّعَ. أدرع. تَدَرَّعَ: البس الدرع/ زرێی پۆشی.

دِرع: قميص من زرد الحديد/ زرێ، قەڵغان.

دارِع. مُدَرَّع: عليه دِرع/ زرێ پۆش.

مُدَرَّعَة. دارِعَة/ زرێدار، زرێپۆش.

درف:

دَرَفٌ: جانب/ تەنیشت، لا.

دَرفَة: صِفق. أحد مصراعي الباب أو الشباك/ تاك.

درق:

دَرَقَة: ترس من جلد/ سەڵتە، سەڵتەی چەرم، زرێی چەرم.

دورق: إبريق كبير/ مەسینەی دوو قوڵفی بێ لولە.

ـ : قارورَة/ کەمۆڵە، تیان، کەشکۆڵ، قاپ، گوم گومە.

دَرّاق: من الاشجار/ چەقالە.

دَرّاقن: صنف من الخوخ/ جۆرێکە لە قۆخ.

دَرَقي الشكل/ چەقالەیی.

الغُدَة الدرقيَه/ چەقالو.

درك:

دَرَكَ المطر: تتابع قَطْرهُ/ بێ وچان باری.

دارَكَ: تَبِعَ. لاحَقَ/ شوێنی کەوت، بەدوایا رۆی.

أدرك الثَمَرُ: نَضَجَ/ پێ گەیشت، میوەکە پێگەیشت.

ـ : بَلَغَ/ گەیشت، کاتی خۆیەتی.

ـ : عَلِمَ/ زانی، پێی زانی، هەستی کرد، سەری لێ دەرکرد، پەی پێ برد.

ـ : فَهِمَ/ تێگەیی، تێگەیشت.

ـ : لَحِقَ/ شوێنی کەوت.

ـ : نال/ دەستی کەوت.

ـ الولد: ناهز البلوغ/ وا پێئەگا. لە بلوق بونایە.

ـ الشاب: بلغ سِنّ الرشد/ پێگەیشت، بلوق بو، بو بە هەرزەکار.

ـ المعنى: فَهِمَهُ/ زانی، ماناکەی زانی، تێی گەیشت.

لايُدْرَك: بعيد المنال/ دەست ناکەوێ.

إستدرك. تَدارَكَ الأمْرَ: أصلحة/ پینەی کرد، جوبەجێی کرد، رابی کرد.

ـ مافات: تَدارَكَهُ/ تۆڵەی رابوردوی کردەوە، راستی کردەوە.

ـ عليه: حَصَرَهُ/ بەستیەوە، سنوری بۆ دانا.

تَدارك مافاتَهُ: تلافاه/ تۆڵەی رابوردوی کردەوە، راستی کردەوە.

ـ : تَلاحَقَ/ شوێنی کەوت.

– الخطأ بالصواب: إتَّبَعَهُ/ راستی کردەوە.

دَرَكٌ: لحاق/ شوێن کەوتن.

– . دَرَك: قَعْر. اقصى قعْر الشيء/ بن، بنی بنەوە.

– الخفير أو الحارس: منطقة عمله/ ماوەو شوێنی ئیش و ئێشك گرتن.

إدراك: بلوغ/ پێگەیشتن.

– : نَيْل/ دەست کەوتن.

– : عقل/ هۆش، بیر، زرنگی.

– : فهم/ تێگەیشتن، سەرلێ (دەرکردن، دەرچوون)، پێزانین، پەی پێ بردن.

– : نضج/ پێگەیین.

– : سِنّ البلوغ/ هەرزەکاری.

– . بلوغ سن الرشد/ گەیشتنە (تەمەنی، سێرەی) هەرزەکاری.

إستدراك: اصلاح مافات/ راست کردنەوە، پینەکردن.

مُدرِك: عاقل/ تێگەیشتو.

– : بالغ سِنّ الرشد/ هەرزەکار.

مُدركات: الحواس/ هەستەکانی مرۆڤ.

درم:

دَرِمَ: ذهبت اسنانه/ دانەکانی نەمان، کەوتن.

دَرَّمَ اظافيره: قَلَّمها/ نینۆکی کرد، رێکی خست.

تَدريم الاظافير: قَصُّها و تسويتها/ نینۆك کردن، رێك خستن.

اندَرَم. اندرد/ بڕدان، دەم پوچەڵ.

درن:

دَرِنَ. اندَرَنَ: إتَّسَخَ/ پیس بو، چلکن بو، چلکی گرت.

اندَرَنَتْ الماشية: رَعَت الدَّرين/ گیای تەڕو شێداری خوارد.

دَرَّنَ. تَدَرَّنَ: تَعَجَّرَ/ گرێیاوی بو، گرێ گرێ بو.

دَرَن: وَسَخ/ پیسی.

– : دَرَنَة: عُقدة. عُجرَة/ گرێ، سەلك.

تَدَرُّن: سُلّ/ نەخۆشی سیل، دەردەباریکە.

مُتَدَرِّن: مُتَعَجِّر/ گرێ گرێ.

دَرين: مابَلى من الحشيش/ گیاو لەوەری تەڕو شێدار.

– : الثوب البالي/ جلەشڕ.

دری:

دَرَى الأمر و بالأمر: تَوَصَّلَ الى علمه/ فێربو، زانی، پێی زانی، ئاگاداربو.

أدرى الرجل بكذا: اعلمه به/ پێی وت، ئاگاداری کرد، فێری کرد، تێی گەیاند.

– : أعْلَم/ باشتری ئەزانێ.

داری: لاطف/ بە تەنگیەوە هات، ئاگای لێ بو.

دَرَّى: ذَرَّى/ شەنی کرد، بە بای (دا، کرد).

دِراية: علم/ زانیاری، تێبینی، رێپێ بردن، زانین، پەی پێ بردن.

– : خبرة/ پسپۆڕی، وەستایی، کارامەیی.

دارٍ بالأمر: عالم به/ ئەزانێ، ئاگادارە.

مُداراة: مُلاطَفَة/ بەتەنگەوە هاتن، ئاگالێ بون.

مِدراة: مِدْرَى: مشط/ شانە.

مِدرة. مِذرى/ شەن.

دس:

دَسَّ. دَسَّسَ: ادخل و أخفى/ ئاخنی، تێ ئاخنی، تێی خست.

– عليه: کادَ له/ داوی بۆ نایەوە.

– الدسائس: دَبَّرَ المكايد/ پیلانی گێڕا.

– أو حَشَرَ انفه فی الأمر: تَدَخَّلَ/ خۆی تێهەڵ قوڵتان.

إنْدَسَّ: إندفن/ نێژراو، داپۆشرا، تێ ئاخنرا، تێهەڵ کیش کرا.

– فی كذا: تدخل/ خۆی تێ (خست، هەڵ قوڵتان).

– بينهم/ چوە ناویانەوە، خۆی تێ فڕێ دان.

دسّاس: مُدَبِّر المكائد/ داونەرەوە، ئاژاوەگێڕ، پیلان گێڕ.

– : حَيَّة رَملية قصيرة/ کوڵەمار.

دسّاسة: كَمأ/ دومەلان.

دَسيس: مَن ترسله لياتيك بالأخبار/ گوێ هەڵ خەر، سیخوڕ، هەواڵ هێن.

دسيسه: مكيدة/ فێڵ، داو، پیلان، ئاژاوە.

دست:

دَسْت: مِرجَل كبير/ قازان، مەنجەڵی (زنجیرەدار، ساوەر کولان).

يا – : لعبة تستخدم فيها احدى عظام الدجاج/ چەڵەمەشکێنە.

دَسْتَة: إثنا عَشَر/ دەستە، دوانزە دانە.

دُستور: قانون أو نظام أساسی/ یاسای بنچینەیی.

– : نظام الحكم/ یاسای فەرمان رەوایی.

– : إذن/ ڕێدان.

دسر:

دَسَرَ: دَفَعَ و سَيَّرَ/ هانی دا، پاڵی پێوەنا، بردی بەڕێوە.

– : طَعَنَ/ بری، پیاکرد، لێی دا.

دسار: مسمار/ بزمار.

دَوسَر: زوان فی الحنطة/ مرۆر.

– : اسد/ شێر.

– : الجمل الضخم/ وشتری کەتە.

دسم:

دَسَمَ. اَدْسَمَ القارورة: سَدَّها/ سەری نایەوە، دای خست.

– الباب: اغلقه/ پێوەی دا، دای خست.

– . دَسِمَ المطر الارض: بَلّها/ باران زەویەکەی تەڕ کرد.

– . دَسِمَ. دَسَّمَ: سَوّدَ/ رەشی کرد.

دَسَم: كَثْرَة وَدَكَة/ بەزو چەوری نقد بو.

دُسْمَة. دِسام: مايُسَدّ به القارورَة و نحوها/ سەر، سەرقاپ، دەمەوانە، تۆپەوانە.

– : غُبْرَة الى السواد/ دێز، رەشباو.

دَیْسَم: سَواد/ رەشی.

– : ظلمه/ تاریکی.

دسِم: اَدْسَم: كثير الدَسَم/ چەور.

دَسَمْ: وَدَك من لحم أو شحم/ چەوری، رۆن، بەز و پیو.

دشن:

دَشَّنَ الثوب: لبسه لأول مَرّة/ بۆیەکەم جار لەبەری کرد.

– المكان: إفتتحه/ کردیەوە.

تدشین: استعمال و افتتاح لأول مَرّة/ بۆ یەکەم جار بەکارهێنان و کردنەوەو تێچوون.

داشِن: جَديد/ تازە، نوێ.

دَعْ (فی وَدَعَ) دعا. دُعاء (فی دعو) دعاره (فی دعر)

دعامة (فی دعم)

دعب:

دَعَبَ. داعَبَ: لاعَبَ و مازَحَ/ یاری کرد، گاڵتەی کرد، گەمەی کرد.

داعَبَ المراة: لاعبها و غازلها/ یاری و دەست بازی لەگەڵ کرد.

تَدَعَّبَ عليه: تَدَلَّلَ/ خۆی بەناز فرۆشت، نازی بەسەرا کرد.

دَعِب داعِب. دَعّاب: مُحِبّ للهو/ گاڵتەچی.

مُداعَبَة. دُعابَة: هزل. مزاح/ گاڵتە، گاڵتەکردن، یاری، دەست بازی.

دُعْبُب: لَعوب/ فێڵ باز، تەڵەکەباز.

– : الغلام الشاب البَضّ/ گەنجی تێك سمراو.

دُعبوب: الضعيف القصير/ لاوازی کورتە بالا، کوڵەسیسە.

– : احمق/ گێل، گەمژە، بلّح، گەلۆر، حەپۆلە.

– : مُخَنَّث/ نامەرد، ناپیاو.

– : نمل أسود/ مێروله رەشه.

– حبّة سوداء/ رەشکە.

ليله – : ليله سوء/ شەوی ناخۆش و شوم.

دعْبل: بيض الضفدع/ مێلکەی بۆق.

– : مُدَعْبَل: منحرف الصِحّة/ دەردەدار.

دُعْبل/ مەڵمات.

لُعْبَة الـ – / مەڵماتێن، موشێن، تیلی بەرانبەرێن.

مُدَعْبَل/ خرین، خرۆکە، خڕ، خرە.

دعر:

دَعَرَ. دَعِرَ: فَجَرَ/ خراپەو داوێن پیسی کرد.

دَعَرٌ. دَعارَةٌ. دِعارَة: الخبث و الفسق و الفساد/ خراپەکردن، داوێن پیسی.

دَعارَة. دَعّارَة. سوء الخلق/ بێئابرویی.

بيت الـ – : ماخور/ ماڵە خراپ.

دَعِر. داعِر: فاسِق/ سۆزانی، بێئابرو، داوێن پیس.

دعس:

دَعَسَ: داس. دَهَسَ/ پێی پیانا، بەسەریا رۆی، پانی کردەوە.

دَعْس: اثر/ شوێن، شوێن پێ.

دُعسوقه: أبو العيد/ خاڵخاڵۆکە.

دعك:

دَعَكَ: مَسَحَ و فَرَكَ و نَظّفَ/ پروانی، تەکانی، سڕی.

– الجلدَ: دَلَكَ و مَسَّدَ/ شێلای، دەستی پیاهێنا.

دعم:

دَعَمَ الشيءَ: اسنده لِئلا يَميل/ پاڵ پشتی بۆ دانا، کوڵەکەی دایەبەر، وەستانی، رای گرت.

– ه: أعانه و قوّاه/ پشتگیری کرد، یارمەتیدا.

– : صَدَمَ/ لێی دا، پیاکێشا.

إدّعَم: إستند على الدعامَة/ بەدار وەستاوە، كۆڵەكەی لە بەرایە.
دِعامَة. دِعْمَە. دِعام: الخشب المنصوب للعريش/ كۆڵەكە، پایە، دەستەك، دیرەگ، داریەند.
– : سند/ پاڵ پشت.
– القوم: سیدهم/ سەرگەورە، گەورەپیاو.
داعِم/ لێ دەر، پیاكێشەر.
مَدعوم/ لێدراو، پیاكێشراو.
دُعموص: فرخ الضفدع و أمثاله/ سەرمێكوتە.
دعا:
دعا:نادی/ بانگی كرد.
– الی: سَبَّب/ بو بەهۆی.
– الی ولیمه: طلب لیاكل عنده/ بانگی كرد، داوەتی بۆ كرد.
– علیه: طلب له الشَرّ/ نزای لێ كرد، نۆعای لێ كرد.
– له: طلب له الخیر/ نزای بۆ كرد، دۆعای خێری بۆ كرد.
– فلاناً و بفلانٍ: سَمّاه به/ بەناویەوە ناسراو بانگ كرا.
إدّعی الأمر: زَعَمَ/ وای پێشان دا، وای وت.
– بكذا: تظاهر. تَصنَّعَ/ خۆی وا نواند.
– علیه بكذا: إتهمه/ گوناه یا تاوان باری كرد.
– علیه كذباً: إفتری علیه/ بەدەمیەوە هەڵ بەست.
– الشيء أوبه: زعم انه له حقاً أو باطلاً/ كردی بە هی خۆی.
استدعی: صاح به. ارسل فی طلبه/ بانگی كرد، ناردی بە شوێنیا.
– : إستلزم/ وا پێویستی كرد.
– الإعجاب: استوجب/ جێی سەرسورمان بو.
– الی المحكمة: استقدم. استحضر/ لە دادگاوە بانگ كرا، داواكرا.
داعی: قاضی/ شكاتی كرد، سكاڵای كرد.
– : حاجَجَ/ بیانوی گرت، پەڵپی گرت.
تَداعی: آل الی السقوط/ خەریك بو بروخێ، بكەوێ.
دَعْوَة. دَعوی: قَضیَّة/ داوا، كێشە، خواست.
– . عُزومَة/ بانگ كردن.
نشر الـ – دعایه/ پرو پاگاندە.
دعوی. إدعاء. زعم. حُجَّة/ بیانو، داواكاری، پەڵپ.
دُعاء: نِداء/ نزا، لالانەوە.
– : طلب/ داواكردن، داخوازی، بانگ كردن.
– : دَعوة بالشر/ نزا لێ كردن، نزای خراپ لێ كردن، توك.
داعٍ. داعیَة: سبب. باعِث/ هۆ، هاندەر.
إدِّعاء: زَعم/ وا پێشاندان، داواكاری.
– : حُجَّه/ بیانو گرتن، بیانو، پەڵپ.
– : إظهار/ وا دەرخستن، پێشاندان.
– : شَكوی. تُهْمَة/ گوناه یا تاوان باركردن.
– العلم/ خۆبەزانا (زان، زانین).
– المرض/ خۆ نەخۆش خستن.
دِعایَة. دَعاوَه: نشر الدعْوَة/ پروپاگاندە، داكۆكی، چاوبڕاو، بازارگەرمی.
مُدَّعٍ. دَعی: زاعِم/ داواكار، واپیشان دەر.
– : رافع الدعوی/ شكات كەر.
– : مُطالِب/ داواكار، دادبەر، دادخواز.
مُدّعی علیه مُطالَب/ داواكراو.
– علیه: متهم/ تاوان لەسەر، تاوان باركراو.
– العام/ داواكاری گشتی.
– العلم/ خۆبەزانا زان.
مَدعاة: الداعیَة و السبب/ هۆ.
دغد:
دَغْدَغ: زَغزَغ/ ختوكەی دا.
– فلاناً بكلمة: طعنه بها/ توانجی تێ گرت، لاقرتی پێ كرد، پلاری تێ گرت.
دَغْدغَة: زَغْزَغَة/ ختوكە.
مُدَغْدَغ: مطعون/ توانج تێ گیراو.
دغر:
دَغَرَ. إندغر علیه: هجم/ پەلاماری دا، هەڵمەتی بردەسەر.
– الرَجُل: ساء خلقه/ رەوشتی خراپ بو.
دَغرٌ. دَغری: هُجوم/ پەلامار، هەڵمەت.
داغِر: الخبیث المُفسِد/ بەدرەوشت، رسوا.
دغش:
دَغَشَ: دَخَل فی الظلام/ تاریك (داهات، ی كرد).
دَغَشٌ. دُغشَة. دَغیشَة: ظلام/ تاریكی، تاریك داهاتن.
دغص:
دَغِصَ: إمتلأ من الأكل أو الغضب/ پڕبو، تورە بو، رقی هەڵسا، پێشی خواردەوە.

ادْغَصَهُ: مَلأه غيضاً/ پری کرد، تورەی کرد، رقی هەڵسان.

دَغصان: غضبان/ تورە.

داغـِضَة: اللحم المكتنز/ تێك سمراوی، قەڵەوی، شیشمان.

— : صابونة الركبة/ کلاوەی ئەژنۆ.

دغل:

دَغَلَ: دَخَل دُخول المريب/ بە شپرزەیی (تێی چو، هات).

ادْغَلَت الارض: كثر دغلها/ گژوگیای زۆر بو.

أدغل به: خانه و إغتاله/ ناپاکی لەگەڵ کردو کوشتی.

— بـه: وَشى بـه/ بوختـانی بەدەمەوە (کـرد، هـەڵ بەست).

دَغَلٌ: فَساد/ خراپە، ناپاکی، بەدرەوشتی.

— : شَجَرٌ كثير مُلْتَفٌّ/ بێشە، چرە، جەنگەڵ.

— : حَشائش/ گژوگیا.

دَغِلٌ: داغِل: فاسِد/ ناپاك، بەدرەوشت.

— . مُدْغِل: كثير الشجر/ بێشەلان، چرە.

دغم:

دَغَمَ. ادْغَمَ. إدْغَمَ الشيءَ في الشيءِ: تَوَحَّد. إنْضَمَّ/ بەیەکانوسان، تێکەڵ بون.

— . — . — الحَرف: دَمَجَ/ پیتەکان تێکەڵ و پێکەڵ کرد.

— : وَحَّدَ. ضَمَّ/ خستنیە پاڵ یەك، تێکەڵی کردن.

— . ادغم: غَشَى/ لێڵی کرد.

— . الإناء: ملأهُ/ پری کرد، لێوان لێوی کرد.

ادْغَمَ الله فلاناً: سَوَّدَ وجْهَهُ و اذَلَّهُ/ خوا روی رەش کرد، رسوای کرد.

إدغام: إدماج/ تێکەڵ کردن، بەیەکاکردن.

أدغم: أسود الأنف/ لوت رەش.

— : يتكلم من قبل انفه/ بەلوت قسە ئەکا.

دف:

دَفَّ: مَشى مشياً خفيفاً/ لەسەرخۆ رۆیی.

— . ادَفّ الطائر: حَرَّك جناحيه/ باڵی راوەشان.

دَفَّفَ: أسرع/ تاوی دا، خێرای کرد، پەلەی کرد.

— : ضَرَب بالدَفّ/ لە دەفی دا، دەفی لێدا.

دَفّ. دُفّ: آلة طَرَب/ دەف.

— . دَفَّة: جنب/ تەنیشت، لا، دیو.

دَفَّتا الطبل أو البرميل/ هەردو دیو، سەروبن.

دَفَّة المركب: مِقْوَد/ سوکانی کەشتی و بەلەم.

— الكتاب: غِطاء/ بەرگ.

— الباب أو الشباك: دَرفَة/ تاك.

دفأ:

دَفَأ. ادْفَأ: أسْخَنَ/ گەرمی کرد.

دَفِىءَ. دَفُوءَ: تَسَخَّنَ/ گەرم بو.

إدَّفأ. تَدَفَّأ. إسْتَدْفأ: تَسَخَّنَ/ خۆی گەرم کردەوە.

دِفء. دَفاءَة: نقيض حِدَّة البرد/ گەرمی.

— الحائط: ستره/ پەنا دیواری بەرخۆر، بەر بەرۆچکە.

دِفاء: كل يستدفأ به من الثياب و غيرها/ گەرم کەر کەل و پەلی زستانە.

— . دَفَّايَة. مدفأ/ گەرم کەر، سۆپا، سۆپە.

تدفئة: تسخين/ گەرم کردن.

الـ — المركزية/ گەرم کاری (ناوماڵ، ناوخۆیی).

دَفِىء. دَفآن. مُسْتَدْفِىء/ گەرم (بو، بوە، ی بۆتەوە).

دفت:

دفتر: كراسة/ دەفتەر.

دفر:

دَفَرَ: دَفَعَهُ في صدره/ کێشای بە سنگیا، پاڵی پێوەنا.

دَفِرَ: خَبُثت رائحته/ بۆگەنی کرد.

— : ذَلّ/ رسوابو.

دَفِر: زَفِر. خبيث الرائحة/ بۆگەن، بۆن ناخۆش.

دَفَر: رائحة خبيثة. زَفر/ بۆگەنی، بۆنی ناخۆش.

دفرَة: مالح/ ماڵە.

دفران: عَرعَر/ درەختی عەرعەر.

دفع:

دَفَعَ: رَدّ و أبعد/ دوری خستەوە، دەستی پێوەنا، دەری کرد، گەڕانیەوە.

— : ضد جَذَبَ/ پاڵی نا، پاڵی پێوەنا.

— الى كذا: حَمَلَ على/ هانی دا، ناچاری کرد.

— الى: بعثه على: أدخله في/ پێی کرد، تێوەی گلان، توشی کرد.

— الى: إضطر/ ناچاربو.

— القولَ: أبطله بالحُجَّة/ بەدرۆی خستەوە.

سدي:
سَدَّى. اسدى اليه. احسن/ (چاكە، پياوەتی) لەگەڵ کرد.
- . - اليه النصح/ ئامۆژگاری کرد.
أسدى الأمر: أهمله/ خستيه پشت گوێ.
سُدیً. باطلاً/ خۆڕایی، بەخۆڕایی، بێسود.
سُداة النسيج: خلاف لحمته/ تان، رایەڵ.
- : عضو التذكير في النبات/ دەزوی نێرینە، دەزولەی نێرەکی.
سذب:
سَذَب. سَذاب: نبات/ سپەند، پێچن.
سذج:
ساذَج: سليم النيَّة. بسيط/ ساویلکە، دڵ پاك، سادە، خۆش باوەڕ، بێنەوا، سانا.
سَذاجَة: بَساطة/ ساویلکەیی، دڵ پاکی، سادەیی.
سر:
سَرّ. أسَرَّ. سَرَّرَ: ابْهَجَ/ دڵشادی کرد، دڵی خۆش کرد.
سُرَّ بكذا: فَرِحَ/ دڵخۆش بو، پێخۆشحاڵ بو، دڵشاد بو، شادمان بو.
أسَرَّ اليه السرَّ. سَرَّرَهُ: باح له السرّ/ نهێنیەکەی لا درکان، پێی وت، لێی ئاشکرا کرد.
- السرَّ: كَتَمَهُ/ شاردیەوە، نەی درکان، قوتی دایەوە.
- اليه: حَدَّثَهُ به سراً/ بەدزیەوە پێی وت.
سرور. مَسَرَّة: فَرَحٌ و إبتهاج/ خۆشی، شادی، دەماخ.
مَسرور: فَرِح: فَرْحان/ دڵخۆش، دڵشاد، شاد، شادمان، بەدەماخ، گەشکەدار.
سارّ: مُفرِح/ خۆشی گەێن، دڵخۆشکەر.
سَرّاء: رفاهية. سعادة/ خۆشی.
في السَرّاء و الضراء/ لەخۆشی و ناخۆشیدا، لەخۆشی و تەنگانەدا.
سِرّ: ما يكتمه الانسان في نفسه. خافِيَة/ نهێنی، راز.
- : خَفاء/ نادیار، شاراوەیی، پەنهانی.
- غامِض أو خفي/ نهێنیەکی ئاڵۆز، پەنهان، کەس نەزان.
- المهنة/ پیشەگەری، نهێن پیشە.
- الليل. كلمة السِرّ/ وشەی نهێنی، نهێن وشە.
كاتم أو كاتب الـ - : سكرتير/ نهێن گیر، سکرتێر.

يَكتُم الـ - : كتوم/ نهێن گر.
لايَكتُم الـ - : مِذياع/ دەم شڕ، هەڵشەو هەڵوەڕ.
سِرّاً: ضد علانية/ بە نهێنی.
- : في الخفاء/ لە ژێرەوە، بەدزیەوە، بە تایبەتی.
- : باطناً. قلباً/ نهێنی.
سِرّي: ضد عَلَني/ نهێنی.
- : خَفي. غامِض/ نادیار.
- : خصوصي/ تایبەتی.
بوليس - / سیخوڕ، ئاسایش.
بيت - : بيت دَعارَة/ ماڵە (خراپ، سۆزانی).
حبر - / مەرەکەبی نادیار.
سَريرة: الذي يكتم السرّ/ نهێن گیر.
- : نيَّة/ دڵ، نیاز، مەبەست.
طَيِّب الـ - : سليم النيَّة/ دڵپاك، دڵسۆز، ساویلکە، نیاز پاك.
سُرّ. سُرَر. الحبل السُرّي/ پەتی ناوك.
سُرَّة البطن/ ناوك.
اسارير. سَرَر: سُرُر: الخطّ في الكَفّ أو الجبهة/ شەقڵی لەپ، لۆچی ناوچەوان.
- الوجه: خطوط الوجه/ چرچ و لۆچی ڕو.
- الوجه: محاسن الوَجه/ ڕو (خۆشی، گەشی، کراوەیی).
ابرقت أسرّته/ ڕوی کرایەوە.
سَرير: مضجع/ خەوگە، چەرپا، تەختەبەند، ڕەختی خەو.
سرأ:
سَرَأت الجرادَة أو السمكة: باضَت/ گەرای نا.
سَرء. سِرء. سَراة. سِراة: بيضة الجرادَة و السمكة/ گەرا.
سرب:
سَرَبَ الماءُ: جرى/ ڕۆی.
- . تَسَرَّبَ الماء من الإناء: سال/ تکا ئاوی لێ چو، ئاودزی کرد.
- . - : خَرَجَ خِلسَةً/ خۆی دزیەوە، فرتەی کرد.
تَسَرَّب في الشيء: دخل فيه/ تێی چو، چوە ناوی، خۆی پیاکرد، تەشەنەی کرد.
- الخَبَرُ: إنتشر/ بڵاوبوەوە، دەماودەم کەوت.

- الماءُ في الارض/ تەنیەوە، بڵاوبوەوە.
سَرَّبَ: ارسل أو اخرج قليلاً فقليلاً و خفيَةً/ بە دزیەوەو کەم کەم دەربازی کردن.
سَرَب: نَفَق/ تونێل.
- : قناة يَدخل منها الماء/ گونج.
- : جُحْر الوَحش/ کون.
مَسْرَب: مَصْرَف. مجرى ماء/ زێراب، گونج.
سَراب: خَيْدَع/ تراویلکە، چەوت بینی.
تَسَرُّب/ تەشەنە، تەشەنە کردن، بڵاوبونەوە.
سِرب. سُرْبَة: قطيع/ رەوە، ران، جەلە، گەلە.
- طيور/ پۆل، پۆلە مەل.
- طائرات/ پۆلە فرۆکە.
- : قلب/ دڵ.
واسع الـ - : رَخْي البال/ دڵ فراوان، دڵ کراوە.
سَرْبَلَ: أَلْبَس/ کردیەبەری.
تَسَرْبَلَ: لَبَس/ لەبەری کرد، لەبەرخۆی کرد.
سِربال: كل ما يُلبَس/ جل و بەرگ، پۆشاك.
سرج:
سَرَجَ: كَذَبَ/ درۆی کرد.
- . سَرَّجَ الشَعْرَ. ضَفَرَهُ/ هۆنیەوە.
- . - الثوبَ: شَرَّجَ.. خاطه خياطة متباعدة/ کۆکی گرت، تەریبی دا، بە تەقەڵی زل دروی.
سَرَّجَ الحديثَ: إختلقه/ هەڵی بەست.
- الشيء: حَسَّنَهُ/ جوانی کرد، رازاندیەوە، رێکی خست.
- . أسْرَجَ الحصان: شَدّ عليه السرج/ زینی کرد.
أسْرَجَ السِراجَ: أوقده/ دایگیرسان، هەڵیگیرسان، پێی کرد.
سَرَّاج: كَذّاب/ درۆزن.
- . سُرجي: صانع السروج/ زین درو.
سِراج: مصباح صغير/ فوتیلە، چرا.
- الليل: حَشَرَة الحُباحِب/ گوڵە ئەستێرە.
سِراجَة. سُرُجِيَّة: صِناعَة السروج/ زین درون، پیشەی زین درو.
- : شِراجَة: خِياطة متباعِدة/ درومانی بڵاو، تەقەڵی زل زل، کۆك.
مرض الـ - : رُعام/ سەقاو.

سَرج: بَرْذَعَة الخيل/ زین.
الـ - و توابعه: عُدَّة الخيل/ رەخت، رەختی ئەسپ.
سَيْرَج: دهن السمسم/ رۆنی کونجی.
سرح:
سَرَحَ: ذَهَبَ يرعى/ چو بۆ لەوەڕ، چو بۆ چەڕاندن.
- ما في صدره: اخرجه/ چی لە دڵیا بو (دەرکانی، دەری بڕی).
سَرَّحَ المواشي: أرسلها ترعى/ ناردی بۆ لەوەڕ، لەوەڕانی، ناردی بۆ چایەر.
- القوم: صَرَفَهم/ دەستی پێوەنان، دەری کردن.
- الجيش: صَرَفَهُ/ بڵاوەی پێ کرد، ئاش بەتاڵی کرد.
- الزوجَة: طَلَّقَها/ دەستی لێ هەڵ گرت، تەلاقی دا.
- الأمر: سَهَّلَهُ/ ئاسانی کرد.
- الشَعْرَ: مشطه/ دایهێنا، خاوی کردەوە، شانەی کرد.
تَسَرَّحَ من المكان: خَرَجَ/ دەرچو، چوە دەری.
- من الجيش: خَرَجَ/ لە سەربازی دەرچو.
سَرْح: ماشِيَة/ ماڵات.
- : فناء الدار/ حەوشە.
شَعر - / قژی خاو.
سارِح: راعي/ شوان.
- الفكر: شارد العقل/ رۆیشتو، بیررۆیشتو، پەژارە.
سَرَحان الفكر: شرودُهُ/ بیررۆیشتن، پەژارەیی.
سِرْحان: ذئب/ گورگ.
سِرحانة: انثى الذئب/ دێڵە گورگ.
سَراح: صَرْف او إطلاق/ بەردان، دەست پێوەنان.
إطلاق الـ - : صَرْف/ بەرەڵاکردن، بەردان.
أطلقَ - ـه: صَرَفَهُ/ بەرەڵای کرد، بەری دا.
تَسريح: مَشْط/ قژداهێنان، قژ رێك خستن، شانە کردن.
- من الجيش/ لە سەربازی دەرچون، بەربون.
مُسَرَّح من الجيش: اكمل الخدمة العسكرية/ دەرچو لە سەربازی.
تَسريحَة: ترتيب الشَعر/ قژداهێنان، قژ رێك خستن.
مِسْرَح. مِسْرَحَة: مشط/ شانە.
مَسْرَح: مَرعى/ لەوەڕ، لەوەڕگا، پاوەن، چایەر.
- : مكان التمثيل/ شانۆ.
خَشَبَة الـ - / سەرشانۆ.

مَسْرَحِيَّة: رواية تُمثَّل على المسرح/ چیرۆکی شانۆیی، شانۆگەری.

سرد:

سَرَدَ. سَرَّدَ: ثَقَبَ/ کونی کرد، هەڵی کۆڵی.

– الحديث: ساقَهُ/ گێڕایەوە، باسی کرد.

– الشواهد: ذكرها/ بەڵگەی هێنایەوە.

– تفاصيل الموضوع/ درێژەی پێدا، هەموی گێڕایەوە.

سَرْد: ذكر/ باس کردن، بەڵگەهێنانەوە.

– : مُتَتابِع بإنتظام/ هۆنراوە، یەك لە دوای یەك، بەرێك و پێکی.

سرداب. مخبأ تحت الارض/ سارداو، ژێرزەمین.

سُرادِق: خَيْمَة/ چادر، چادرگا، خێوەت.

سرط:

سَرِطَ. تَسَرَّطَ. إسترط: إبتلع/ قوتی دا، هەڵی لوشی، لرفی دا.

سِراط: سبيل/ رێگە، رێگا، رێ.

سَرَطان: حيوان مائى/ قرژاڵ، قرژانگ.

– : شديد الجرى/ بەگوڕ، بەتین، بەتاو.

– : ورم سرطانى/ شێرپەنجە.

سرع:

سَرُعَ: ضد بطيء/ خێرابو، پەلەبو، بەگوڕبو.

سارَعَ. تَسارَعَ. تَسَرَّعَ اليه: بادر. عَجَّلَ/ پەلەی کرد، دەست پێشکەری کرد، خێرایی کرد.

– فى الأمر: جَدَّ/ بەدڵ کردی، بەدڵ تێکۆشا.

اسرع فى العمل و المَشْى: ضد ابطأ/ (بە پەلە، خێرا، گورج و گۆڵ) بو، پێی هەڵ گرت، بەدەست و برد بو.

تَسَرَّعَ فى العمل: إندفع/ پەلەی لێ کرد، پەلەی کرد.

سَرْعان. سِرعان. سُرعان بمعنى اسْرِعْ (فعل الأمر)/ پەلەکە، خێراکە، زوکە.

– : السابقون/ پێشکەوتوان، گورج و گۆلان.

سُرعَة: عَجَلَة/ فرکە، فرکان، پەلە، خێرایی، زوکردن، تاودان، پەلەکردن، هەڵە داوان.

– السير: درجة سرعته/ پلەی خێرایی، گوڕ.

– الانجاز/ پلەی گورج و گۆڵی، رادەی هێنانەبەرهەم.

بـ – : بعجلة/ بە فرکە، بە فرکان، بەخێرایی، بەپەلە، بەگورجی، بەهەڵەداوان، بەگوڕ، بەتاو.

سريع: ضد بطيء/ خێرا، بەگوڕ، بەتاو، چوست.

– : مُعَجَّل/ بە هەڵمەت، گورج و گۆڵ.

– التاثر/ هەستیار.

– الجرى/ بەتاو، بەگوڕ، خێرا.

– الخاطر. – البديهية/ زیرەك، گورج بێژ.

– الزوال: زائل. عابر/ زونامێنى.

– العطب/ شکست، زوخراپ ئەبێ.

سريعاً: حالاً/ دەستبەجێ.

– : بسرعة/ بەخێرایی، بەگورجی.

تَسَرُّع: عجلة/ پەلەکردن، خێرایی، دەست و برد کردن.

– : طيش/ هەڵەشەیی، هەڵپەکردن.

مُتَسَرِّع: عَجول/ هەڵەشە.

مِسْرَع. مِسراع: السريع الى خير او شرّ/ هەڵەشە، پەلەکەر.

سرف:

أسْرَفَ المال: بَذَّرَ/ بەفیرۆیدا، دای لەبەرد، زۆری خەرج کرد.

– فى كذا: جاوز الحد/ لە رادەکردیە دەرەوە.

إسراف: تبذير/ بەفیرۆدان، دەست بڵاوی.

مُسرِف: مُبَذِّر/ بەفیرۆدەر، دەست بڵاو.

سَرَف: تجاوز الحَدّ و الاعتدال/ لە رادە کردنە دەرەوە.

سُرْفَة: يرقانه/ کرمۆکە.

– دودة القزّ/ قۆزاخەی کرمی ئاوریشم.

سرق:

سَرَقَ: اخذ ما للغير خِفْيَةً/ دزی، بردی.

– : نهب/ تالانی کرد، بردی.

– شخصاً: خَطَفَهُ/ فرانی.

سَرَّقَهُ: نَسَبَهُ الى السرقة/ بوختانی بۆ کرد، گوناهباری کرد، کردی بە دز، بەدزی دەرکرد.

سارَقَهُ النظر: نظر كل واحد منهما الى الآخر خلسة/ بە دیەزیەوە سەیری یەکتریان کرد.

إسترق السمع: استمع مخفياً/ بەرگوێی کەوت، گوێی هەڵ خست.

سَرِقَة: أَخْذ ما للغير خِفْيَةً/ دزین، دزی کردن، بردن.

– : الشيء المسروق/ دزراو.

– بإكراه: نهب. قَرْصَنَة/ تالانی، تالان کردن، جەردەیی، دزێتی.

– الاشخاص/ فراندن.
– المساكن/ ماڵ برین، دزین.
– الجیب: نشل/ گیرفان برین.
سارِق. سَرّاق: لِصّ/ دز، جەردە، ماڵ بڕ.
مَسروق/ دزراو، براو، تالانی، تالان کراو، فرێنراو.
سرك:
سَرِك: ضعف بَدَنُهُ بعد قُوَّة/ لاواز بو، توایەوە، پوکایەوە.
سرم:
سَرَّم. تَسَرَّم: قَطَعَهُ فتقطع/ بری، لەت لەتی کرد، لەت لەت بو.
سُرْم: صُرْم. طرف المعی المستقیم و الدُبر/ کۆم.
سَرْمَد: دائم/ نەمر، هەمیشە، جاوید.
لیلٌ – : طویل/ شەوی درێژ، شەوگار.
سرمدی: لا اول لە و لا آخر/ هەمیشەیی، هەتایی، نەسەری هەیە و نەبن.
سرا:
سَرا. تَسَرّی: تَکَلَّف المروءة و السخاء/ پیاوەتی کرد، دەست بڵاوی کرد.
سَرِی: صاحب الشرف و المروءة/ پیاو چاك، جوامێر.
سُری. إنسَری عنه الهَمَّ: إنکشف/ خەمی رەویەوە، حەوایەوە.
سَرو: شجرة الحیاة/ ئارەوەن، سەرو.
سَرْوَلَ. تَسَرْوَلَ: لبس السروال/ (دەرپێ، شەرواڵ) ی لەپێ کرد.
سروال. سِرویل: لباس/ دەرپێ، ساتان.
– . – : بنطلون/ پانتۆڵ.
– . – : شروال/ شەرواڵ، رانك.
سری:
سَری: ذَهَبَ. جَری/ رۆیی، رۆیشت، چو.
– مفعوله: اثَّرَ/ کاری کرد، کاریگەر بو.
– الأمرُ: عُمِلَ به/ پەیرەوی کرا.
– علیه الأمرُ: طُبِّق علیه/ بەسەریا سەپێنرا.
ساری صاحِبَهُ: سار مَعَهُ/ لەگەڵی رۆیشت.
اسری: سار لیلاً/ بەشەو رۆیشت.
– به: سَیَّرَهُ لیلاً/ بەشەو ناردی.

سُری. سَریان. سُرْیَة: سیر اللیل/ شەو رۆیشتن، شەوگەڕ.
سریان/ تەنینەوە.
– المفعول/ کارساز، کاریگەر.
سَرِیَّة: قطعه من الجیش/ پەل.
سارِیة. الأمراض الساریة/ درم، پەتا.
– المرکب/ دارئاڵا.
سراة: أعلی کل شیء/ رو، سەر، پۆپە، لوتکە، تەوق.
سرای. سَرایا. سَرایَة: صَرْح/ کۆشك، سەرا، باڵەخانە.
سطب:
مِسْطَبَة. مَسْطَبَة: مِصطبە/ تەنەفە.
– . – : سندان الحَدّاد/ دەسگای ئاسنگەر.
سطح:
سَطَح. سَطَّح: سَوّی/ تەختی کرد.
– : اضجَعَ/ پاڵی خست.
– : بَسَطَ/ بڵاوی کردەوە، هەڵی خست.
– : مَدَّدَ/ درێژی کرد، پاڵی خست.
تَسَطَّحَ. إنْسَطَحَ: إنبسط/ تەخت بو، بڵاو بوەوە، هەڵ خرا.
– . – : إستلقی علی ظهره/ بە گازی پشتدا کەوت.
سَطْح: أعلی الشیء. وَجه/ رو، سەر.
– : ظهر البیت/ سەربان، بان.
– مستوی فی الهندسة/ روی تەخت.
– مائل فی الهندسة/ روی لار.
المساحَة السطحیة/ روبەری رو.
سطیح. مُسَطَّح: منبسط/ تەخت، روتەخت.
– . – : مُمْتَدّ/ راکشاو، پاڵ کەوتو.
سَطحی: خارجی/ بەشی دەرەوە، روی دەرەوە.
– : غیر عمیق/ تەنکاو، تەنك.
– . مَعْرِفَة سطحِیَّة/ سەرزاری، ناسیاویەکی سەرزاری.
تَسَطُّح: إنبساط/ تەخت کردن، پان کردن.
– : تَمَدُّد/ درێژکردن، پاڵ خستن.
سِطاح: ما إفترش و إنبسط من النبات/ لق و پۆپی راکشاو.
مِسْطَح: ما یُبسط به الخبز/ تیرۆك.

مسطاح: موضع التجفيف/ شوێن هەڵ خستن.
مُساطَحَة: تسوية/ بانەوانی.
مُسَطَّح. منبسط/ تەخت، پان، بەرین.
سطر:
سَطَرَ. سَطَرَ: كتب/ نوسی، نوسیەوە.
– . – بالمسطر: خَطَّطَ/ هێڵی كێشا.
– : قطع/ بڕی.
سَيطَر. تَسَيطَرَ علی: تَسلَّطَ/ زاڵ بو، دەستی بەسەراگرت، بردی بەڕێوە.
سَطر: الخَطّ و الكِتابَة/ نوسین، نوسینەوە.
– : خَطّ اوصَفّ/ هێڵ، ریز.
اسطورَة: حِكايَة/ چیرۆك، بەسەرهات، داستان، ئەفسانە.
اساطیر الأقدمین: حدیث الاقدمین/ داستان، ئەفسانە، بەسەرهاتی رابوردو.
مِسطَرَة. مِسطَرَة: مخطاط/ راستە، هێڵ كێش.
مُسَطَّر: علیه اسطر/ هێڵ هێڵ.
سَيطَرَة: تَسلُّط/ زاڵ بون، دەست بەسەراگرتن.
– : سُلطَة/ فەرمان رەوایی، ركێفە.
مُسَيطِر: مُتَسلِّط/ زاڵ.
– : حاكم/ فەرمان رەوا، داوەر.
ساطِر: سَطّار: قصّاب/ سەربڕ.
ساطور: مايُقطع بە اللحم. سكين كبير/ كێرد، قیمەكێش، سیكارد.
سطع:
سَطَعَ النورُ: اضاءَ/ شەوقی دایەوە، درەوشایەوە، تیشكی دایەوە.
– الغبارُ: إنتَشَرَ/ بو بە تەپ و تۆز، تۆز و خۆڵ بەرزبوەوە.
– ت الرائحةُ: إنتشرت/ بۆن هات، بۆن بڵاوبوەوە.
– الأمرُ: ظهر وَوَضَحَ/ ئاشكرابو، دەركەوت، رون بوەوە، دیاریدا.
– راسَهُ: رَفَعَهُ و مَدّ عُنُقَهُ/ سەری بەرز كردەوە، ملی درێژكرد.
– بیدیه: صفق بها/ چەپڵەی لێدا، دەستی دا بەیەكدا.
سَطْع: كل شيء إرتفع و إنتشر/ هەمو شتێ كە بەرز ببێت و بڵاو ببێتەوە.
– . سطوع النور/ شەوق دانەوە، درەوشانەوە، بریقانەوە، تیشك دانەوە.
– . سطوع الرائحة و الغُبار/ بڵاوبونەوەی بۆن، بەرزبونەوەی تۆز، تۆزو بۆن هەڵسان.
ساطع: مُضيء/ شەوق دار، درەوشەدار، بریقەدار.
– : ظاهر و واضح/ دیار، ئاشكرا، رون.
سَطَعْ: تصفیق/ دەست بە یەكدادان، چەپڵە.
– : صَوت الرِمیَة/ شلپە، دەنگی شت فرێدان.
سطل:
سَطَلَ: اسكر/ مەستی كرد، سەرخۆشی كرد، گێژی كرد، كەیلی كرد.
– ه: دَهَشَهُ و بَهَتَهُ/ واقی ورمان، وڕی كرد.
إنسَطَلَ: سَكَرَ/ مەست بو، سەرخۆش بو، گێژبو.
مَسطول: ابله/ گێژ، گێژو وێژ، وڕ.
– : سكران/ مەست، سەرخۆش، كەیل.
سَطْل: جَردَل/ سەتڵ.
اسطول: مجموعَة/ كۆمەڵ، گەلە.
– بَحري/ كەشتیگەل، گەلەكەشتی، زێباڵ.
سطم:
سَطَمَ: سَدّ/ دای خست، دەمی نایەوە.
– الباب: رَدَّهُ و أغلقه/ پێوەی دا، جوتی كرد.
– فاه: سَدَّه/ دەمی داخست.
– الثقب: شَدَّهُ/ گرتی، پڕی كردەوە، كونەكەی گرت.
سِطام: سَدّادَة القارورة/ سەرقاپ، دەمەوانە، پشك.
– . إسطام: مِحراك النار/ كوڵەوژ.
سطا:
سَطا علیه و بە: وَثَبَ علیه و قهره/ پەلاماری داو شكانی، هێرشی بردەسەر، هەڵی كوتایە سەری، چوە سەری.
– علی المكان: دَخَلَهُ عُنوَةً/ بەزۆر خۆی پیاكرد، هەڵی كوتایە سەر.
سَطو: هجوم/ پەلامار، هێرش، چونەسەر.
– لاجل السرقه/ هەڵ كوتانەسەر، خۆپیاكردن بۆ دزی.
سِطوَة: نُفوذ. سُلطَة/ كاربەدەست بون، زاڵی، رایە.

س

سَعْتَر: صَعْتَر/ جاتره.

سعد:

سَعِدَ. سُعِدَ: ضد شَقِيَ/ بەختيار بو، كامەران بو.

ساعَدَ: عاوَنَ/ يارمەتى دا.

– : مَدَّ يَد المُساعَدَة/ دەستى يارمەتى درێژ كرد.

– على: افضى إلى/ پشتى گرت.

اسْعَدَهُ على الأمر: عاونه/ يارمەتى دا، پشتگيرى كرد.

– : جعله سعيداً/ بەختيارى كرد، كامەرانى كرد.

– ه الله: جعله سعيداً/ خوا بەختيارى كرد.

سَعْد: نقيض النحس/ بەختەوەر.

سعادَة: ضد شَقاء/ كامەرانى، بەختيارى، بەختەوەرى، خۆشى.

سَعادَتكم/ جەنابتان، بەرێزتان.

صاحِب السَعادَة/ جەنابى...، پايەبەرز، پايەبلند، خاوەن رێز.

سعيد. مُسْعَد. مَسْعود: بَخيت/ كامەران، پايەبلند، خاوەن رێز.

مساعِد. مُعاوِن/ (يارمەتى، ياريدە) دەر، ئاريكار، ياوەر، ئاوەڵ، دەستيار، دەستگير.

مُساعَدَة: مُعاوَنَة/ يارمەتى دان، ياريدەدان، ئارى كارى، مور، كۆمەك كردن.

– : تعضيد/ پشتگيرى، دەست گرتن، دەستگيرى.

مَدّ يَدّ الـ – / دەستى يارمەتى درێژكردن، يارمەتى دان.

ساعِد: رئيس/ سەرگەورە.

– : ما بين المرفق و الكَفّ/ باسك.

– : ما يُلبس على الساعد/ بازيبەنگ.

ساعِد الطير: جناحاه/ باڵ.

سعدان: قرد كبير/ مەيمون، مەيمونى گەورە.

سَعدانه: حمامَة/ كۆتر.

– الثدي: حلمته/ گۆى مەمك.

– الباب/ دەسكى دەرگا.

سَعدان. سُعْد: نبات/ جۆرە گيايەكە بۆ لەوەڕ، سملّ.

سعر:

سَعَرَ. سَعَّرَ. اسْعَرَ النارَ: اشعلها/ ئاگرى كردەوە، كرديەوە، هەڵى گيرسان.

سُعِرَ الرجلُ: ضربته السموم/ گرە (بردى، لێى دا).

– . إنْسَعَرَ الكلبُ: كَلَبَ. إسْتكلب/ هاربو.

– : جُنَّ/ شێت بو، كەڵلەيى بو.

تَسَعَّرَ. إسْتَعَرَ: إشتعل/ داگيرسا، هەڵ گيرسا، پێ بو.

سَعَّرَ السلعَةَ: عَيَّنَ له سِعراً/ نرخى بۆ دانا.

– : ساعَرَ: إتفقَ على سِعر. ساوم على سِعر/ رێك كەوتن لە سەر نرخ، پێك هاتن.

سَعْر. سُعار: حَرّ/ گەرما.

– . – : الجوع الشديد/ برسێتيەكى زۆر.

سُعْرَة: وَحْدَة قياس كمية الحرارة/ گەرمۆكە، تاوزە.

سعير: لهب النار/ كڵپەى ئاگر.

ساعور: نار/ ئاگر.

مِسْعَر: مُوقِد النار/ چاوگە، ئاگر داگيرسێن، چاوگ.

– . مِسعار: محراك النار/ كوڵەوژ.

– : آلة لقياس كمية الحرارة/ گەرمۆكە پێو، گەرماپێو.

مَسعور: الحريص على الاكل و إن إمتلأت بطنه/ زۆرخۆر، بەمەڵپە لە خواردنا، چلێس.

– : مجنون. كَلِب/ هار، شێت.

سُعْر. سُعُر: جنون/ شێتى، هارى، كەلەيى.

سِعْر: ثمن/ نرخ.

تسعير: تَثمين/ نرخ دانان، نرخ برين، نرخاندن.

سعط:

سَعَطَ. سَعَّطَ. اسْعَطَ الدواءَ: ادخله فى انفه/ كردى بە لوتيا، هەڵى مژى، بۆنى كرد.

إستعط السَعوط و غيره/ هەڵى مژى، برنوتى هەڵ مژى.

سَعوط: نَشوق. عَطوس/ برنوتى، خاكەى توتن، پژمێنەر.

مسعَط. مُسْعَط: عُلْبَة النشوق/ قوتوى برنوتى.

مُسعاط. سعيط: حِدَّة الرائحَة/ بۆن تيژى.

سعف:

سَعَفَ. اسْعَفَ بحاجَته: قضاها له/ راى پەڕان، بۆى جێبەجێ كرد، چارەى كرد، چارەسەرى كرد، چارى كرد.

– . اسعف: اعان و ساعَدَ/ يارمەتى دا، پشتگيرى كرد، كۆمەكى كرد، فرياى كەوت.

سَعَفَت: تَشَقَّقَت اصابعه حول اظفاره/ پەنجەكانى قلّيشا.

إسعاف. سَعَف: نَجْدَة/ فرياكەوتن، يارمەتى، پشتگيرى، چارەكردن، چارەسەرى.
إسعافات أوليَّة/ فرياكەوتنى سەرەتايى، چارەزو.
سَعَفَة. سَعَف: قُروح تَخْرج في الراس و الوجه/ زيپكه، هەڵ زڵەپان.
سُعاف. سَعاف: تَقَشُّر حول الظفر/ قڵيشان، پێست هەڵ دان.
سَعَف النخيل: جريد النخيل/ گەڵاى دارخورما، سەعف.
سعل:
سَعَلَ: كَحَّ/ كۆكى.
سُعال: كَحَّة/ كۆكە، كۆكين.
– ديكى/ كۆكە رەشە.
سعه (في وسع)
سعي:
سَعى: عمل/ تێكۆشا، كردى، هەوڵى دا، تەقەلاى دا.
– : سار او مَشى/ رۆيى، رۆيشت، تێپەڕى.
– للأمر: إهْتَمَّ بتحصيله/ هەوڵى بۆدا، كۆششى بۆ كرد.
– الى المكان: قَصَدَه/ بۆى چو، ملى بۆ نا.
– في حاجَة الرجل: تَسَبَّبَ له في قضائها/ بۆى تێكۆشا، بۆى جێبەجێ كرد.
– لعياله: كسب لهم/ بۆى پەياكردن.
– بفلان. وشى به. نَمّ عليه/ بوختانى بۆ كرد، لە پاش ملە باسى كرد.
سَعْيٌ. مَسْعى: إجتهاد/ تێكۆشان، هەوڵ دان، كۆشش، بۆچون، تەقەلادان، تەلاش كردن.
ساعي. ساعٍ: رسول/ نێرراو.
– البريد/ پۆستەچى، نامەبەر، تەتەر، چاپەر.
ساعٍ. واشٍ. نَمّام/ بوختان كەر، بەدەمەوە هەڵ بەست.
سِعايَة: وِشايَة/ بوختان كردن، لەپاش ملە باس كردن، بەدەمەوە هەڵبەستن.
سغب:
سَغَبَ. سَغِبَ: جاعَ/ برسى بو.
ساغِب. سَغِب. سَغْبان: جوعان/ برسى.
سَغَبٌ. سَغابَة: جوع/ برسێتى.
سف:
سَفَّ. اسَفَّ الخُوص: نَسَجَهُ/ چنى، گەڵاى دارخورماى چنى.
– . – الطائر أو السحاب: مَرّ على وجه الارض/ تێپەڕى.
– الشيءَ: الصق بعضه ببعض/ بە يەكيەوە نوساني، خستيە پاڵ يەك، جوتى كردن.
سَفيف. سَفيفَة: ما يُنسَج من الخوص/ حەسیر.
سفاره (في سفر سفاهه (في سفه)
سفح:
سَفَحَ الدمَّ: سَفَكَهُ و اراقَهُ/ خوێنى رژان.
– الدمعَ: اراقَه/ فرمێسكى رشت.
سافحا. تَسافحا: زَنَيا/ زينايان كرد، داوێن پيسيان كرد.
سِفاح: سَفك الدماء/ خوێن رژتن.
– : زِنى/ زينا، داوێن پيسى.
سَفّاح: مُريق الدماء/ خوێن رێژ، پياوكوژ.
سَفح الجبل: اصله و اسفله/ قەدپاڵ.
سفد:
سَفَدَ. سَفِدَ. سافَدَ الذكر انثاه: جامَعَها/ گاى، سوارى بو، كەڵى دا، لاقەى كرد.
سَفَدَ اللحم: نَظَمَهُ في السفود للشواء/ گۆشتى كرد بە شيشەوە.
تَسفيد: تلقيح/ چاك كردن، كەڵدان، پەڕاندن.
سَفود: سيخ/ شيش، سيخ، كۆڵەوژ.
سفر:
سَفَرَ. سَفَّرَ: ارسله الى السَفَرَ/ ناردى بۆ گەشت، بەرێى كرد، رەوانەى كرد.
– . – البضائع: ارسلها/ ناردى.
– . – عن وجهه: كَشَفَهُ/ روى خۆى (ئاشكرا كرد، دەرخست)
– . – الصُبْحَ و الوجه: اضاء/ رون بوەوە، روناكى دايەوە، شەبەقى دا.
أسفر عن كذا: انتج/ ئەوە ئەنجامى بو، لێى وەشايەوە.
سافَرَ: مَضى/ رۆى، چو، چو بۆ گەشت، سەفەرى كرد.
– : مات/ كۆچى كرد، مرد.
– ت عنه الحُمّى: تَرَكَته/ بەرى دا، خاوبوەوە، تاكەى لە كۆڵ بوەوە.
– الريحُ الغيمَ: كشطه/ رەوانيەوە، با هەورەكەى رادا.

س

سَفَر: رحيل/ چون، رۆيشتن، رۆين، كۆچ.
سَفْرَة: نُزْهَة/ گەشت، سەيران، گەڕان.
مُسافِر: مُرْتَحِل/ گەشتيار، رەوەنـد، رەووك، رێبـوار، رەوتەنى.
– الوجه: مايَظهر منه/ رووديار، رووبەڕەلا.
مِسفار: كثير الأسفار/ گەڕۆك، رەووك.
مَسفور: مَن اصابه جُهْد السَفَر/ كفتى رێگە، كەشـەنگى رێ.
سُفرَة: طعام المُسافر/ توێشو.
– : مائدة الأكل/ خوان، سفرە.
سافِر: كاشِف الوَجه/ رووبەڕەلا.
الـ – : الكاتب/ نوسەر.
تسفير: ترحيل/ خستنەڕێ، ناردن، رەوانەكردن، بەڕێ كردن.
سفير: رَسول مصلح بين القوم/ ناوبژى كەر، نێرراو بۆ ئاشت كردنەوەو رێك خستن.
– دولى/ باڵيۆز.
– : الساقط من الشعر و الورق/ وەريو، هەڵ وەريو.
سِفارَة: وِساطَة/ ناوبـژى كـردن، كەوتنـە بەينـەوە، روڵێنان.
– . سَفارَة: مركز السفير السياسى/ باڵيۆزخانە.
– . – : إيقاع الصلح/ ئاشت كردنەوە.
سِفر: كتاب/ پەرتوك، نوسراو، تۆماركراو، كتێب.
– : جزء من اجزاء التوراة/ بەشێكى تەورات.
سَفَرْجَل: شجر و ثمر/ بەهێ، بەى.
سفلس: مرض/ ئاتەشەك.
سفط:
سَفَطَ السَمَكَ: قَشَر سَفْطَهُ/ پولەكەكـەى لێ كـردەوە، پاكى كرد.
سَفَط: قشر السَمَك/ پولەكەى ماسى.
سَفَط: سَلّة كبيرة/ سەوى، قوڵينە، سەبەتە.
سفع:
سَفَعَ الحَرُّ او السمومُ وَجْهَهُ: لَفَحَتْهُ/ گرە بردى، گـەرما بردى، هەڵ كزا.
– : ضَـرَبَ ولطـم/ زللـەى وەشـان، تێـى سـرەوان، پياكێشا.
سُفْعَة: بُقعة سوداء/ پەڵەى رەش.

اسْفَعُ اللـون: اسْـوَدُ مائـل الى الحمـرة/ رەش تاڵـەى سورباو.
سفق:
سَـفَقَ. اسْـفَقَ البـاب: رَدَّهُ بِـصَدْمَة/ داى بەيەكـدا، دەرگاكەى توند دا بەيەكدا.
– لَطَمَ/ پياكێشا، لێيدا، تێى سرەوان، زللـەى لێ دا، چەپۆكى پياكێشا.
سَفْقَة: اللطَمْ و الصَفق/ پياكێشان، لێدان، تێسرەوان، زلله، چەپۆك، لێدان.
سفك:
سَفَكَ: اراق/ رژانى، خوێنى (رژان، كرد).
– : صَبّ/ رشتى، ئاوى رشت.
سَفْكُ الدم: إراقة الدم/ خوێن (رژتن، كردن)، كوشتن.
سَفّاك: سَفّاح/ خوێن (رێژ، خۆر)، پياوكوژ.
سفل:
سَفَلَ. سَفِلَ: نقيض علا/ نزم بو، ماتەخوار.
– . – : كان نذلاً/ بێ ئابڕو بو، سوك بو، ترۆ بو.
تَسَفَّل: تَدانى/ نزم بوەوە.
سِفل. سُفل. سُفالَة: نقيض العلو/ نزمى، قوڵى.
– . – . – الشيء: اسفله/ بن، خوارو، دامێن.
سَفالَة: دَناءَة/ بێئابرويى، سوكى، ترۆيى.
سافِل: واطيء/ نزم.
– : دَنيء/ سوك، بێئابرو، ترۆ، گومڕا، ناپياو.
اسفل: قاع/ بن، خوارو، دامێن.
– من: اوطأ/ نزم تر، خواروتر.
– السافلين: ارذل حالة/ خوارخوارو.
سُفلى: نقيض العلوى/ خوارو، لاى خوارو، بنـى بنـەوە، هەرە بنەوە.
سفن:
سَفَنَ الشيءَ: قَشَرَهُ/ پاكى كرد، توێكڵەكەى لێ كردەوە.
– ت. سَفَنَت الريحُ: هَبَّت/ هەڵێ كرد، با هەڵێ كرد.
سَفَنَهُ: نَحَتَهُ و لَيَّنَهُ/ نەرمى كرد، كوتاى، داى تاشى.
سَفَن. صَنْفَرَة/ سمارتە، سمارتە كردن.
سفنَة: قشرة كقشرة الحمصِ و الباقلاء/ توێكڵى تۆو، پێلە، قەلاس.
سفين. إسفين: وَشيط/ مێخ، پواز.
سفينه: مَركب/ كەشتى.

- شراعية/ کەشتی چارۆکەدار، کەشتی با.
- الدجاجة: صَدرها/ سنگی مریشك.

سَفّان: صانع السُفن/ کەشتی دروست کەر.

سِفنج. سَفَنج. إسفَنج/ ئیسفەنج، کەفی دەریا، هەور.

سفه:

سَفَه. سَفَهَ نَفسَهُ: اذلّها و إستَخَفَّ بها/ خۆی (رسوا، سوك، کەر) کرد.

سَفُهَ. سَفَهَ: کان سفیهاً/ ترۆبو، کەربو.

سَفَّهَ الرجُلَ او الرای: نَسَبَهُ الی السَفَه/ گاڵتەی پێ کرد، گاڵتەی پێهات، بێ نرخی کرد، نابرۆی برد.

سَفَه. سَفاهَة: حَماقَة. جَهل/ کەرێتی، گەوجی، بێ ئەقڵی، کەودەنی، گەمژەیی، گەلۆری.

- . - : إسراف و تبذیر/ دەست بڵاوی، بەفیرۆدان.

- - : رَداءة الخُلق. وقاحَة/ بێنابرویی، ترۆیی.

سفیه: احمق/ کەر، گەوج، بێ ئەقڵ، کەودەن.

- : بَذیءِ اللسان/ دەم پیس، جنێو فرۆش، چەتون، چەقاوەسو، لەوچە، روهەڵ ماڵراو.

- : مُسرِف. مُبَذِّر/ دەست بڵاو، بەفیرۆدەر.

سفی:

سَفَی. اسفی الریح التُراب: ذَرَّتْهُ او حَمَلَتْهُ/ کردی بە تۆزو خۆڵ، خۆڵ هەڵی کرد، بو بە خۆڵ باران.

سافیاء: غُبار/ تەپ و تۆز، تۆزو خۆڵ.

سفا السنبل: شوکه/ پژان، داسك، قەڵاس.

سفیر (فی سفر) سفین. سفینه (فی سفن) سفیه (فی سفه)

سقر:

سَقَرَتْه الشمس: آذت دَماخَهُ بِحَرِّها/ خۆر بردی، هەتاو بردی، خۆر گێژی کرد.

سَقرَة: شِدَّة وقع الشمس/ خۆربردن، گێژبونی بەر هەتاو، گەرما بردن، شەرا لێدان.

ساقور: حَرّ/ گەرما.

- : حدیدَة تحمی بها الحیوان/ داخ، شیشی داخ کردن.

سَقَر: جَهَنَّم/ دۆزەخ، جەهەننەم.

سقط:

سَقَطَ: وَقَعَ/ کەوت، وەری، روخا، رما، گلا.

- من عَینی: لم اعد اعتبره/ لەبەرچاوم کەوت.
- : اخطأ. ذَلَّ/ پێی هەڵ خلیسکا.
- فی الامتحان: لم یَنْجَح/ دەرنەچو، کەوت، مایەوە.
- فی الکلام: اخْطأَ/ لە دەمی دەرچو، هەڵەی کرد.
- علیه الأمر: ضَیَّعَهُ/ لە کیسی چو، لە کیس خۆی دا، لە دەست خۆی دا.
- من یَدِه: نَدِمَ/ پەشیمان بوەوە.
- علی ضالَّته: عثر و وقع علیها/ دۆزیەوە، کەوت بەسەریا.
- الولد من بطن امّه: خَرَجَ/ لە دایك بو، لەبارچو.

سُقِطَ و اُسقِطَ فی یَدِه: تَحَیَّرَ/ سەری سورما، سەرسام بو.

اسقط: اَوقَعَ/ خستی، (دای، کوتای) بە زەویدا، گلانی.

- من الحِساب: طرح/ لێی دەرکرد، دەری هێنا، دای شکان.
- حَقّاً: اضاع حَقّاً/ مافی ون کرد، کردی بەژێر لێوەوە.
- الدَعوی: اوقف السیر فیها/ وەستانی، رای وەستان، رای گرت.
- الرجلَ: عالجه لکی یَبوح بما عنده/ هەڵی خەڵەتان، لەگەڵی خەریك بو تا پێی درکان.
- ت المرأة: اجهضت/ لەباری چو.
- ت الدابة: طرحت/ بەرەکەی فرێدا، ترەکی.
- إمراة حبلی: سَقَّطَها/ لە باری چوان، پێی فرێدا.

تَسَقَّطَ الخبَر: جَمَعَهُ/ کۆی کردەوە، هەواڵی کۆکردەوە.

تساقَطَ: تتابع سقوطه/ یەك بەدوای یەکدا کەوتن.

سِقط. سُقط: الذی یسقط من بطن امه لغیر تمام او میتاً/ لەبارچو، ناتەواو.

- : ناقص الخلق/ ناتەواو، بێنابرو، نامەرد.

سَقطَة: وَقعَة/ کەوتن.

- : عَثرَة و زَلّة/ هەڵ نوتان، هەڵ خلیسکان.

ساقط. سَقوط. واقع/ کەوتو، وەریو، روخاو، گلاو.

- فی الامتحان: راسب/ دەرنەچو، کەوتو.
- : سافل. دنیء/ سوك، نزم، ترۆ، رسوا، بێنابرو، نامەرد.

إسقاط: إیقاع/ خستن، روخاندن، گلانن.

س

– : حَذف. طرح/ لابردن، لێدەرکردن، پەڕاندن، داشکاندن.

– الجنین: إجهاض/ لەباربردن، بەرپێ فرێدان، پێ ترەکاندن.

مَسْقَط. مَسقط: محل السقوط/ شوێن کەوتن.

– هندسی/ جێکەوت.

– الراس: محل الولادة/ شوێنەزا، شوێنی لە دایك بون.

سقوط: وقوع/ کەوتن، گلانن.

– : خَراب/ روخان، وێران بون، کاول بون، فەوتان، نەمان، رمان.

– الحَق/ ماف سوتان.

– الدعوی/ پوچ بونەوەی داوا.

یَسقط: فعل مضارع/ بروخێ.

فلیسقط/ بابروخێ.

سَقْط: سَقَط: بَرَد/ تەرزە.

سَقَطْ: مُعَطل/ پەك کەوتو، لەکار کەوتو، سەقەت.

– : مالا خیر فیه من کل شيء/ بێکەلك، کۆنە، تلپ تیا نەماو.

سَقْطی: تاجر الثیاب القدیمة/ کۆنەفرۆش.

سقع:

سَقَعَهُ: ضَرَبَهُ بباطن کَفَّه/ زللەی لێدا، شەقازلەی لێدا، لێی دا.

سُقْع: صُقْع. ناحیَة/ هەرێم، ناوچە.

سقف:

سَقَفَ. سَقَّفَ. البیتَ: جعل له سَقْفاً/ سەری گرت، سەربانی بۆ کرد، دارەڕای کرد.

– . – بیدیه: صَفَّقَ/ چەپلەی لێدا.

– . –: صار اسْقُفاً/ بو بە قەشە.

– ت الرجلُ: مالت/ گێربو.

سَقْف: سَمك. المقابل للأرض/ بنمیچ، ساپیتە، بنەبان، دارەڕا.

– خارجی: سطح/ سەربان، روی دەرەوە.

– الحلق: حَنَك/ مەلاشو، ئاسمانەی دەم.

سقیفة. تسقیفة: مَظلَّة/ کەپر.

مُسَقَّف/ سەرگیراو.

اُسْقُف: فَوْقَ القَسِّ/ قەشە، (لەقەشە گەورەتر).

صولجان– : عُکّاز/ گۆچان، گالۆك، داردەستی قەشە.

اسْقُفیَّة: مرکز الأسْقُف/ قەشەیەتی، پایەی قەشە.

اسْقَف: غلیظ العظام/ ئێسك ئەستور.

سقم:

سَقِمَ. سَقُمَ: مَرَضَ/ نەخۆش کەوت، دەردی گرت.

– . إنْسَقَمَ: هَزَلَ/ لاواز بو، لەڕ بو.

سَقَّمَ. اسْقَمَ: اعَلَّ/ نەخۆشی خست، نەخۆش کەوت.

– . – : ضایَقَ/ بێزاربو، قێزی هاتەوە، تەنگاو بو.

– . – : هَزَّلَ/ لاوازی کرد، لەڕی کرد.

سُقم. سَقَم. سَقام: مَرَض/ نەخۆشی، دەرد.

– . – : نُحول الجسم/ لاوازی، بێ هێزی، چروسانەوە.

سقیم: مریض. علیل/ نەخۆش، دەردەدار.

– : هَزیل/ لەڕ، لاواز، چروساوە.

– الغرام/ گرفتاری دڵ.

– الصدر: حاقد/ دڵ پیس، رقاوی، دڵ رەش.

کلامٌ – : خلاف الصحیح/ قسەی (نادروست، شەق و شڕ)، درۆ دەلەسە.

مکان – : فیه خَوْف/ ترسناك.

سقی:

سَقی. اسْقی الرجلَ: اعطاه ماءً لیشرب/ ئاوی دایە.

– الدابَّة و الزَرْعَ/ ئاوی دا.

ساقی: شَرِبَ مَعَهُ/ لەگەڵی خواردەوە.

إستَقی: طلب ما یشربه/ داوای خواردنەوەی کرد.

– الخَبَرَ: حصل. جمع/ هەواڵی (پێگەیی، زانی، کۆکردەوە).

سِقاء: قِرْبَة/ کوندە، کوننە، جەوەندە.

سَقّا. سَقّاء: ناقل الماء/ ئاوکێش، سەقا.

سَقی: رَیّ. إرواء/ ئاودان.

– . إستسقاء: مرض/ ئاوبەنگ.

ساقٍ: مُقَدِم الشراب/ مەی گێڕ، ئاوگێڕ، ئاودەر.

ساقِیَة: خادمة الحانة/ مەی گێڕ.

– : نَهر صغیر/ جۆگە، جۆگەلە، چەم.

مَسقًی: مَروی/ ئاودراو.

سك:

سَكَّ البابَ: اغْلَقَه/ دای خست، کلۆمی دا.

– الرجُلُ صَمَّ/ خۆی کەڕ کرد، کەڕبو.

— النقود: ضَرَبَها/ پارەی لێدا، پارەی دروست کرد، سکەی لێدا.

أسَكّ: أصَمّ/ کەڕ، بێگوێ.

— . سُكاك: صغير الاذن/ گوێ بچوک.

سَكّ النقود: ضَرَبَها/ پارە لێدان، پارە دروست کردن، سکە لێدان.

سِكّة: عُملَة مسكوكة/ دراو، پارە.

— : طريق/ ڕێ، ڕێگە، ڕێگا.

— : شارع/ شەقام، جادە.

— المحراث/ گاسن.

— الحديد/ هێڵی ئاسن، ئاسنەڕێ، ڕێگەی ئاسن.

سُكاك. سُكاكة: طبقة الجو العليا/ حەوا.

سكب:

سَكَبَ: صَبَّ/ تێی کرد، ڕۆی کرد، ڕژتی، ڕژانی، ڕشتی.

إنسَكَبَ: إنصَبَّ/ ڕژا، ڕۆکرا، تێکرا.

إنسكاب: إنصباب/ ڕشتن، ڕژاندن.

مُنسَكِب: مُنصَبّ/ ڕژاو، ڕۆکراو، تێکراو.

سَكْب: صَبّ/ ڕۆکردن، تێ کردن، ڕژاندن.

سكت:

سَكَتَ: صَمَتَ/ بێدەنگ بو، خامۆش بو، خپ بو، کپ بو.

— : مات/ مرد، کپ بو، واقەی لێ بڕا، تقەی نەما.

— الغَضَبُ: سَكَنَ/ نیشتەوە، هێواش بوەوە، دامرکایەوە، دامردەوە (توڕەیی).

سَكّتَ. أسكت: جعله يسكت/ (بێ دەنگ، دەم کوت، خپ)ی کرد.

— . — : عَقَدَ لسانه/ زمانی (گرێدا، بەست).

سُكِتَ: اصابته السَكْتة/ توشی بێ دەنگی بو، لێی دا، توشی سەکتەبو.

سَكْت. سُكات. سُكوت: صَمْت/ بێدەنگی، قسەنەکردن، وس بون.

— . سِكِّت. سَكوت. سِكيت: قليل الكلام/ کەم دو، کەم قسە، نەدو.

سَكْتة: صَمْت/ بێدەنگی، قروقەپی.

— : داء السكتة: تعطل الاعضاء عن الحِسّ و الحركة/ لە کار کەوتن.

— قلبية: توقف القلب/ دڵ وەستان، بەلادا هاتن.

ساكِت: صامت/ بێدەنگ، ژیر.

— : ساكن/ هێمن، کپ بو.

مُسكِت: كاتم الصوت/ بێدەنگ کەر، بێ دەنگ کار.

سُكاتة: جواب مُسكِت/ وەلامێکی بێ دەنگ کەر.

سكر:

سَكَرَ الاناء: ملأهُ/ پڕی کرد.

— ت الريح: سكنت/ هێواش بوەوە، باکەی خست.

— : سَكَرَ الباب: سَدَّهُ/ دای خست، کلۆمی دا، پێوەی دا.

— . اسكَرَهُ الشراب: جعله يَسكر/ (خومار، مەست، سەرخۆش، کەیل) بو.

سَكَّر: حَلّى بالسُكَّر/ شیرنیی کرد، شەکری تێ کرد.

سُكْر: ثَمَل/ مەستی، خوماری، سەرخۆشی، کەیل بون، سەرخۆش بون.

سُكَّر: مادة التَحلية المعروفة/ شەکر.

— رؤوس/ شەکری (کەڵلە، کڵۆ).

— ناعم/ شەکری وردە.

داء الـ — / نەخۆشی شەکر.

قَصَبُ الـ — / قامیشی شەکر.

سُكَّري: نسبة الى السكر/ شەکری، شەکرین.

مرض البول الـ — / میزە شەکرە.

مُسكِر. سَكَّر: شرابٌ مُسكِر/ مەستکەر سەرخۆشکار.

سُكَّرِيَّة: وعاء السكر/ شەکردان.

سَكْرَة: المرة من سكر/ خواردنەوەیەك، دانیشتنێك.

— الموت: شِدَّته/ سەرەمەرگ، گیانەلا.

سَكران. ثَمِل/ خومار، مەست، سەرخۆش، کەیل.

— قليلاً/ خەیاڵی هەیە، چۆتە ژێری، گرتویەتی.

سِكِّير. سَكور: كثير السُكر/ زۆر خۆرەوە، بەدمەست.

سَكَّرين: مادە سكرية/ ڕۆحی شەکر، سوکەرین.

سكرتير: كاتب السِرّ/ نهێن نوس، نهێن گیر، سکرتێر، رازنوس.

سكرتارية: وظيفة كاتب السرّ/ نهێن نوسی، رازگە.

— : ديوان السكرتير/ نهێن نوس نشین، رازگە.

سكع:

سَكَعَ. تَسَكَّعَ: مَشى على غير هداية/ گەڕا بە بێ هۆدە، ئەڕۆیشت بێ ئەوەی بزانێ بۆ کوێ.

تَسَكَّعَ الظُلمَة: خبط فيها/ پەلی کوتا، بە تاریکی پەلی کوتا.

– في امره او سيره: لم يهتد لوجهته/ تیاما، نەی ئەزانی چی بکا.
**رَجُلٌ سُكَّع:** مُتَحَيِّر/ تیاماو، سەرسام، شپرزە.
**ساكِع. سَكَع:** الرجل الغريب/ نامۆ.
**مُتَسَكِّع**/ گەریدە، گەرۆك، خوێڕی.

**سكف:**

**اسْكَفَ:** صار إسكافًا/ بو بە (پێلاو درو، پینەچی).
**سَكّاف. اسكاف:** صانع الخِفاف و الأحذية/ پێلاو درو، کەوش درو.
– . – : صِرماتی/ پینەچی.
**سَكافَة:** حِرفَة السكّاف/ پێلاو دروێتی، کەوش دروێتی، پینەچێتی.

**سكن:**

**سَكَنَ:** إنقطع عن الحركة/ وەستا، راوەستا، ئارامی گرت، سرەوت، خپ بو، جوڵەی تیا نەما.
– : هَدَأ/ هێمن بوەوە، دامرکایەوە، هێواش بوەوە، دابین بو، خامۆش بو.
– عنه الوجع: فارقه/ ئێشی نەما، ئازاری شکا.
– الدار: اقام فيها/ تیا دانیشت، لە ماڵەکەدا نیشتەجێ بو، (نیشتەنی، نیشتەجێ) بو.
– اليه: إرتاح/ بە دڵی بو.
– الحرف/ پیتەکە راوەستا، بزوێنی نەما.
– . اسْكَنَ: صار مسكينًا/ هەژار کەوت.
**سَكَّنَ:** هَدَّأ/ وەستانی، رای وەستان، هێمنی کردەوە، دابینی کرد.
– الالم/ ئازاری شکان، ئێشی نەهێشت.
– الجوع و الشهوة و الغضب/ برسیەتی و ئارەزو و قینی (دامرکاندەوە، هێمن کردەوە، هێواش کردەوە).
– الحَرْف/ زەنەی بۆ کرد، پیتەکەی وەستان.
– الرَوْع/ ترسی دەرکرد، ترسی لە دڵدا نەهێشت.
– . اسكن الدار: جعله يسكن فيها/ خستیە خانوەکەوە، نیشتەنی کرد، دابینی کرد.
**يُسْكَن:** قابل للسكنى/ بۆ ژیان ئەشێ.
**ساكَنَ. سَكَن مع/** پێکەوە دانیشتن، لەگەڵێ دانیشت.
– : عاش مع/ پێکەوە ژیان، لە گەڵی ژیا.
**تَمَسْكَنَ:** إدعى الفقر/ خۆی هەژار پیشان دا.
– : صار مسكينًا/ هەژار کەوت.

– . إستكن: تَذَلَّل/ خۆی رسوا کرد.
**سَكَنٌ. سُكنى:** إقامَة/ دانیشتن، مانەوە، نیشتەجێ بون، نیشتن.
– . مَسْكَن: محل الاقامَة/ ماڵ، خانو، جێگە.
**ساكِن:** عكس متحرك. هادیء/ وەستاو، راوەستاو، هێمن، دامرکاو، دابین، خامۆش، خپ.
– كذا: مقيم فيه/ لە.. ئەژی.
– : قاطن/ دانیشتو، نیشتەجێ، نیشتەنی.
**حَرف –** / پیتی (بێ بزوێن، وەستاو).
**مَسْكَن. سَكَن:** بيت/ ماڵ، خانو، زێد، خەڵوەتگە.
**مَسكون:** بِهِ سُكّان/ خەڵکی تیایە، دانیشتوانی تیایە.
– : عامِر اوآهِل بالسكان/ ئاوەدان.
– بالجِنّ/ خێوی (لێیە، هەیە، تیایە).
**المسكونة:** العالَم/ جیهان، گێتی.
**سُكّان.** جمع ساكِن: قاطنون/ دانیشتوان.
– : أهل البلد/ دانیشتوانی شار.
– المنزل او العمارة السكنية/ خەڵکی ماڵ، دانیشتوانی ماڵ و بالاخانو.
– المركب: دَفَّة/ دەسەدۆی کەشتی.
– السيّارة: مِقْوَد/ دەستەدۆ، سوکان.
**كثير الـ –** : عامر/ ئاوەدان، قەڵەباڵغ، زۆر ئاوەدان.
**سُكُون:** هُدُوء/ هێمن، هێواش، ئارام گرتن، سرەوت، خامۆشی، خپ بون.
– : سكوت/ بێ دەنگی.
– : جَزْم الحرف/ پیت وەستان.
– : ضد الحركة/ وەستان، راوەستان.
**سكينة:** الوقار و الطمانينة/ دڵنیایی، هێمنی، ئاغری، لەسەرخۆیی.
**مُسَكِّن.** مُهَدِّیء/ هێمنکەر، هێمنە، دامرکێن، ئارام بەخش.
**مِسكين:** فقير/ هەژار، نەبو، کەم دەس، لات، لەوار.
– : ذليل مقهور/ بێ دەسەلات، خەم بار، رژد، بەدبەخت، کەساس.
**مَسكَنَة:** فَقر/ هەژاری، نەبونی، کەم دەستی، لاتی، لەواری.
– : ذُلّ و تعاسَة/ بێ دەسەلاتی، کەساسی، بەدبەختی.

مُساكَنَة: زيجة غير شرعية/ نۆست.
سِكّين. سكّينَة: آلة القطع/ چەقۆ كێرد، قەڵەم بڕ.
سَكّان، سكاكيني: صانع السكاكين/ چەقۆكر، چەخماخ ساز.
سل:
سَلَّ. إستَلَّ: إنتزع برفق/ دەری هێنا، رای کێشا، هەڵی کێشا.
تَسَلَّلَ. إنسَلَّ: إنسحب خفية/ خۆی دزیەوە، بەدزیەوە بۆی دەرچوو.
سُلَّ. إنسَلَّ: مَرِضَ بالسِلّ/ سیلی گرت، توشی سیل بو.
– . – الى المكان: دَخَلَ/ خۆی پیاکرد.
سَلّال. أسَلّ: سارق/ دز، گەنگەدز.
– : صانع السَلّة و بائعها/ سەبەتە (فرۆش، چن).
سليل: مِن نَسل/ لە رەگەزی، لە خێزانی، جسن، توخم.
– . مسلول: مُصاب بالسِلّ/ سیلاوی.
– . – . مُستَلّ (كالسيف)/ راكێشراو، دەرهێنراو، شمشێری روت، هەڵ کێشراو.
سُلالَة: نَسل/ نەوە، وەچە.
– : أصل. جنس/ رەگەز، تیرە، نەتەوە، نەژاد، بنە (رەت، چە، ماڵە).
– : عائلة/ خێزان، بنەماڵە، خانەوادە، بەرەباب.
عِلم السلالات البشرية/ رەگەزناسی، رەگەزناسین، نەژاد شوناسی.
سُلالي: مختص بسلسلة النسب/ رەگەز ناس، نەژاد شوناس.
مِسَلّة: إبره كبيرة/ سوژن، سوزن.
– بناء: برج مُستَدَق الطرف/ کەلوی قوچ، هەورەبانی قوچ.
سِلّ. سُلّ. سُلال: هُزال/ سیل، دەردەباریکە، دەغەزاری.
سَلّة. سَلّ: سَفَط/ سەبەتە، قولینە، سەوی.
– المهملات/ (تەنەکە، سەبەتەی) خۆڵ.
– : السرقة الخفيفة/ گەرەدزی، ناخونەك.
لعبة كُرة الـ – / یاری باسکە.
سَلّال: صانع السلال/ سەبەتە چن.
سَلسَلَ الشيء بالشيء: أوصله به/ بەیەکی گەیان، گەیانیەیەك.
– : رَبَطَ بالسلسلة/ بە زنجیر بەستیەوە.
– النسب الى/ رەگەزی گەیاندەوە بە..
– الماءَ: صَبَّهُ في حدُور/ کردی بە لێژیدا، بەخوڕ رژانی.
تَسَلسَلَ الماءُ: جرى/ بە خوڕ رۆیی.
سَلسَلَ: شلال صغير/ تافگەی بچوك، ئاوی خوڕ.
– : ماء عَذب/ ئاوی پاك و رون.
سِلسِلَة: زنجير/ زنجیر، زریزە.
– : برقٌ مُسَلسِل في السحاب/ زنجیرە بروسکە، بروسکەی یەك لەدوای یەك
– : اشياء متتابعة/ زنجیرە، یەك لەدوای یەك.
– اكاذيب/ کۆمەڵە درۆ.
– جبال/ زنجیرە شاخ، تیفەشان، تیرەشان.
– النسب/ بنەچە زنجیرەی رەگەز.
– الظهر/ بڕبڕەی پشت، مورەگەی پشت.
تَسَلسُل: تتباع/ یەك لە دوای یەك، بەدوای یەکدا، رێچکە، ریز، رێزە.
بالـ – : بالتتابع/ بەریز، یەك لە دوای یەك، بە رێچکە.
مُسَلسَلَة: روايةُ مُتَسَلسِلَة/ چیرۆکی زنجیرەیی.
مُتَسَلسِل: مُتتابِع/ بەرودوا، یەك لەدوای یەك، بەریز.
رقم – / ژمارەی یەك لەدوای یەك.
رواية – ـة/ چیرۆکی زنجیرەیی.
سلأ:
سَلأَ. إستَلأَ السَمْنَ: صَفّاه/ پالاوتی، دۆکەکەی گرت.
– السمسم: إستخرج دهنه/ رۆنەکەی (گرت، دەرهێنا).
– الجِذعَ: نزع شوكه/ دڕکەکانی (لێ کردەوە، تاشی).
سلاء: سَمْن. سَمْنَة/ رۆنی پالێوراو، داخ کراو.
سَلاء: سُلاءَة. سِلاّيَة. شَوك النخيل/ چقڵ.
سلب:
سَلَبَ. إستَلَبَ الشيءَ: إنتزعه قهراً/ روتی کردەوە، تالانی کرد، بەزۆر لێی سەند، زەوتی کرد.
سَلَبَت. أسلَبَت المراةُ: اجهضت/ لەباری چو.
سَلَبَ: لَبِسَ السلاب/ رەشی لەبەرکرت، رەشی پۆشی.
سَلَب. مايُسلَب/ تالانی، یەغما.
– : نَهب/ تالان کردن، روت کردنەوە، راووروت.

س

– : نفي. ضد إيجاب/ نەرێ.
علامة الـ – او السالب (–)/ نیشانەی نەرێ.
سَلبي. سالِب: ضِد موجَب/ بێ‌ئەرك، سارد، بێ‌جێی، ناڵەبار.
– : نفي/ نەرێ.
سِلاب: ثياب الحداد/ رەش پۆشی، بەرگی رەش.
سَلّاب. سالب. مُغتَصِب ما للغير/ تالانی کەر، جەردە، زەوت کەر.
اسلوب: كيفية/ چۆنیەتی، رەفتار، سەمت.
– : نمط/ شێواز، رێگە، شێوە.
سلت:
سَلَتَ سَلَّ. سَحَبَ/ دەری هێنا، رای‌کێشا، هەڵی کێشا.
– ملابِسَهُ: شلحها بسرعه/ دای‌کەن، خۆی روت کردەوە.
– و استلت القصعَة: مسحها باصبعه/ لستیەوە، پەنجەی پیاهێنا.
إنسَلَتَ: إنسحب خِلسَةً/ خۆی دزیەوە، بە دزیەوە دەرچو.
– منه: هَرَبَ/ لە دەستی دەرچو، فرتەی کرد.
– القماش: تَفَكَّكَ/ شیبوەوە، پوکایەوە، هەڵ وەشا.
سلج:
سَلَجَ. إستَلَجَ: إبتلع/ قوتیدا.
سلجم: لفت/ شێلم.
سلح:
سَلَحَ الطائرُ: رَمى بسلحه/ ریقنەی کرد.
سَلَّحَ: جَهَّزَ بالسلاح/ چەکی دایە.
تَسَلَّحَ: لبس السلاح/ چەکی لەخۆی دا، چەکی هەڵگرت.
سَلْح الطيور: نَجْوَها/ ریقنە، جیقنە.
سلاح: آلة قتال/ چەك، تیغ.
– الدفاع: درع/ قەڵغان، زرێ، چەکی بەرگری.
– المحراث: حديدته/ گاسن.
– المطوى او السكين: شفرَة/ دەم، دەمەچەقۆ.
تحت الـ – : في الخدمة العسكرية/ سەرباز.
نَزْع او تجريد السلاح/ چەك کردن، چەك داماڵین.
سَلَّمَ سلاحَهُ/ چەکی دانا.
أخَذَ سلاحَهُ/ چەك کرا.
مُسَلَّح: مجهز بالسلاح/ پر چەك، چەکدار، چەك رێژ.

خرسانه مُسَلَّحَة/ کۆنکرێتی موسەلەح.
تسليح: تجهيز بالسلاح/ پرچەك کردن.
سُلَحفاة. سِلحَفاة: من البر مائيات/ کیسەڵ، رەقە.
– البحر/ جلە.
سلخ:
سَلَخَ الذبيحَة: نزع جلدها/ گروی، پێستەکەی گرو.
– البشرة: جَلَطَ/ دای ماڵی، پێستەکەی داماڵی.
– الثعبانُ: إنسلخ من قشره/ کاڵێ فرێدا.
– . إنسلخ الشهرُ: مَضى/ مانگ تەواو، رابورد.
إنسَلَخَ الجلد: كَشط/ پێستی فرێدا، قلیشا، توێژی داماڵی.
– من ثيابه: تَجَرَّدَ/ روت بوەوە.
سَلْخ. سِلخ. سِلاخ الحيَّة. قِشرَها/ کاڵێ مار.
– : نَزْع الجلد/ داماڵین، گرون، فرێدان، پۆست گرتنەوە، توێژ داماڵین.
– الشهر: آخره/ دوایی مانگ، بنی مانگ، کۆتایی مانگ.
سِلخ: جلد الحيوان المسلوخ/ پێستەی گرواو.
سَليخ: مَسيخ. بلاطعم/ بێ‌تام.
– . مَسلوخ. مُنْسَلِخ/ گرواو، داماڵراو.
سلاخَة: مَساخَة/ بێ‌تامی.
سَلَخانه. مَسلَخ: مَذبَح/ قەسابخانە.
سلس:
سَلِسَ: كان ليِّناً مُنقاداً/ گوێ رایەڵ بو، نەرم بو، دەستەمۆ بو.
– بِحَقّي: أعطاني إيّاه بسهولة/ بە ئاسانی دامیەوە.
سَلِس. سالِس: مطواع/ گوێ رایەڵ، نەرم، دەستەمۆ.
كلام – : سهل. طلق اللسان/ قسەی (نەرم، شیرین)، زمانی (لوس، پاراو، رەوان).
سَلاسَة: ليونَة/ نەرمی، ئاسانی، رەوانی.
– الكلام: طلاقة اللسان/ زمان (لوسی، پاراوی، رەوانی).
– البول: عدم المقدرة على ضبط النفس/ (خۆ مین) رانەگرتن، میزەچورکێ.
سَلَس: السهولة و الإنقياد/ گوێ رایەڵی، بە ئاسانی ماڵی کردن و بەڕێوەبردن.

— : عَدم إستمساك البول/ میز رانەگرتن، میزەچۆرکێ.

سَلسبیل: شَراب اهل الجَنَّة/ خواردنەوەی ناو بەهەشتیان.

— : الماء العذب. السهل المساغ/ ئاوی سار.

سلط:

سَلِطَ. سَلُطَ: کان طویل اللسان صدیده/ زمانی درێژو پیس بو.

سَلَّط علی: اطلق له السُلطَة/ دەسەلاتی دایە.

— علی: حَرَّضَ/ هانی دا.

— : وَجَّه. فَرَضَ/ ئاراستەی کرد، سەپاندی.

تَسَلَّط علی: تَغَلَّبَ علیه/ زاڵ بو بە سەریا.

— علی: حَکَمَ/ دەسەلاتی بە سەراگرت، فەرمان رەوایی کرد.

سَلْط: طویل اللسان/ زمان درێژ.

سلاطَة: وَقاحَة/ بێحەیایی، بێئابرویی، چوختێتی.

سلیط: وَقِح/ بێحەیا، بێئابرو، بەزەبر، چوختی.

— : زیت الزیتون/ رۆن زەیت.

تَسَلُّط: تَغَلُّب/ زاڵ بون، سەپاندن.

— : حُکم/ فەرمان رەوایی.

مُتَسَلِّط: مُسَیطِر علی/ زاڵ، دەسەلات دار.

مُسَلَّط/ ئاراستەکراو، سەپاو.

سُلطَة: قُدرَة. قُوَّة/ توانایی، هێز.

— : حُکم/ فەرمان رەوایی.

— : نفوذ/ دەسەلات، کارڕەوایی.

— روحیه/ فەرمان رەوایی ئاینی.

— زمنیه/ هێزی کاتی.

— مُطلَقَة/ دەسەلاتی تەواو.

— قضائیة/ فەرمان رەوایی یاسایی.

— القضاء/ دەستەی دادوەری.

— التشریع/ دەستەی یاسادانان.

سَلطَنَة: مَملَکَة/ ولات، سولتان نشین.

سُلطان. سُلطَة: حاکم/ فەرمان رەوا، سولتان، شا.

— . — : قُوَّة/ هێز، توانایی.

— . — : حُکم/ فەرمان رەوایی.

— . — : نفوذ/ کارڕەوایی، دەسەلات.

سُلطانَة: زوجَة السلطان/ شاژن، ژنی سولتان.

سُلطانی: نسبة الی السلطان/ شایانە.

— : عظیم. فخم/ بزورگ، مەزن، شکۆمەند.

سُلطانیة: وعاء الطعام و غیره/ لەگەن.

سَلَطَة: کامخ/ زەلاتە.

مِسلاط: سِن المفتاح/ زمانەی کلیل، دانی کلیل.

سُلاطِح. مُسلَطِح: ضد غَویط/ تەنکاو، بوار.

سلع:

سَلَعَ الارض: تَشَقَّقَ/ قلیشا، درزی تێ بو.

سلعت. إنسلعت قدمه: تَشَقَّقَت/ پێی قلیشا.

سَلَعَ: احرق/ سوتانی، چزانی بە ئاگردا، ئاگری پیاچزان.

سَلْع: شَقّ/ قلێش، قلیشاوی، درز.

— . سِلع: المِثل و التِرب/ وەك یەکی، لەیەك چون، هاو.

اسلَع: مُتَشَقِّق القدم/ پێ قلیشاو.

— : الذی اصابته النار/ سوتاو، پێست سوتاو.

سَلَع: آثار النار فی الجلد/ سوتاوی.

سِلعَة: بضاعَة/ کەل و پەل، شت و مەك.

— کاسدَة/ کەل و پەلی بێبازار، شکاو، نافرۆشرێ.

— . سَلْعَة. سَلَعَة: عَلَق الماء/ زەرو.

— . — . — : کیس شحمی تحت الجلد/ لو، چەورە لوی ژێر پێست.

سِلعام: واسع الحلق/ دەم پەل، دەم زل.

— : عظیم البطن/ ورگن، ورگ زل، ورگ داکەوتو.

— : طویل الأنف/ لوت شۆر، لوت درێژ، لوتە.

— : ذئب/ گورگ.

سلف:

سَلَفَ. أسلَفَ الأرض: سَوّاها/ چاکی کرد، تەختی کرد، خۆشی کرد، تەختەی لێدا.

— : تَقَدَّم و سَبَقَ/ پێش کەوت.

— : مَضی/ تێپەری، رابورد.

سَلَّفَ. أسلَفَ: اقرض/ قەرزی دا، وامی دا.

تَسَلَّفَ. إستلف: إقترض/ قەرزی کرد، خوازتی، وامی کرد.

مِسلَفَه: اداة لتمهید الارض بعد حرثها/ تەختە.

سَلَف: مَن تَقَدَّمَك من آبائك/ باپیران، پێشین، باوان.

— : ضِد الخلف/ رابوردو، پێشو، دێرین.

— : قرض بلا فائدة/ قەرزی بێ سود.

سَلَفاً: مقدماً/ پێشەکی.
سالِف: متقدم/ پێش کەوتو.
– : سابق. ماضٍ/ تێپەڕیو، رابوردو، پێشو، پێشین، دێرین.
– الذكر: مَذكور آنِفاً/ ناوبراو، باسکراو.
في – الزمان/ لە زەمانی کۆندا.
سالفا: سابقاً/ لەوەوپێش، زو.
سُلْفَه: قَرض. دَين/ قەرز، خوازتن، وام.
– مستديمة/ قەرزی درێژخایەن.
– الحذاء: فَرش/ ناوفەرش.
سُلاف: اجْوَد الخمور/ باشترین مەی، شەرابی کۆنی چەند ساڵە.
سِلْف: زوج اخت الزوجه. عَديل/ ئاوەڵ زاوا.
– : اخو الزوج/ شوبرا.
سِلْفَه: زوجَة الأخ/ براژن.
سلق:
سَلَقَ اللحم و غيره: اغلاه و طبخه/ کوڵانی، لێی نا.
– : سَمَطَ. احرق بماء حار/ دای ماڵی، لێی کردەوە.
– بالسوط: ضرب الى ان نزع جلده/ ئەوەندەی لێدا تا پێستەکەی داماڵی.
– باللسان او بالكلام: زَجَرَهُ. آذاه/ سەرزەنشتی کرد، قسەی پێ وت.
– الشيء بالماء الحار: اذهب شعره/ توك و پەڕەکەی لێ کردەوە، هەڵی پروکان، ئاوەڕوتی کرد.
– الحَرَّ او البردَ النبات: احرقه/ سوتانی، هەڵی پروکان.
– : صَرَعَ. وَقَعَهُ على الارض/ (کوتای، دای) بە زەویدا.
– . تسلق: صَعَدَ/ سەرکەوت، پیا سەرکەوت، پیا هەڵ زنا.
تَسَلَّقَ: نام على ظهره/ بە گازی پشتدا کەوت.
– الشجرة او الحائط و غيرها/ سەرکەوت، پیاسەرکەوت، پیا هەڵ زنا، سەرکەوتەسەری.
استلقى على ظهره: نام عليه/ بە گازی پشتدا کەوت، لەسەر پشت کەوت.
إنْسَلَقَ اللسان: اصابه تَقَشُّر/ زمانی قڵیشا، هەڵ زڵەپی، داپلۆخا.

سَلْق: مصدر (سَلَقَ)/ کوڵان، کوڵاندن.
– . سَلَق: اثر الجرح/ جێ برین.
– . سِلْق: نبات يُطْبَخ/ سڵق.
مَسلوق: مطبوخ/ کوڵاو.
تَسَلُّق: صعود/ سەرکەوتن، هەڵ زانان.
متسلق/ سەرکەوتو، هەڵ زناو.
نبات – / روەکی سەرکەوت، روەکی هەڵ زن.
سَلوقي. سلاقي: كلب الصيد/ تانجی، تاژی.
سُلاق: بثر تخرج على اللسان/ زمان هەڵ زڵەپان، پیزۆکە.
سَلاقَة اللسان: بَذاءَة/ زمان پیسی، زمان درێژی، دەم شڕی.
سليقة. مسلوق. مسلوقة/ کوڵاو.
– : طبيعة/ نەژادی خۆرسك، لەخۆوە.
سلك:
سَلَكَ المكانَ: دَخَلَ فيه/ تێی چو.
– الطريق: سار فيه/ پیاڕۆی، پیاتێپەڕی، گوزەری کرد.
– الشيء في الشيء. أسلك: ادخله فيه. نَظَّمَ/ تێی خست، تێی پەڕان، پێوەی کرد، هۆنیەوە.
– : سار. تَصَرَّفَ/ رەفتاری کرد.
– بموجب كذا/ بە گوێرەی.. رەفتاری کرد.
سَلَّكَ الخيطَ: لَفَّهُ/ هەڵی کرد.
– الخيطَ: حَلَّ عُقْدَهُ/ خاوی کردەوە، کردیەوە، گرێکەی کردەوە.
– الأمر المُعَقَّدَ: ازال الابهام/ ئاسانی کرد.
– الاسنان: خَلَّلَها/ دانی ئاژنی.
سِلك: خيط/ کشتەك، بەن، پەت، دەزو.
– معدني/ تەل.
– نباتي. اظفور/ تەرز.
آلة الحزم بالـ – / تەل بەست.
الـ – العسكري/ سەربازی، سەربازی گەری.
الـ – الدبلوماسي/ باڵیۆزگەری.
لاسلكي/ بێتەل.
مَسْلَك: طريق/ رێ، رێگە، رێوبان، رێباز.
سالك: غير مَسْدود او معرقل/ کوناودەر، دەرنەچێ.
سُلوك: تَصَرُّف. سَيْر/ کردار، رەفتار، کردەوە، رەوشت.

حَسَن الـ – / رەفتار چاك، رەفتارچاكی.
سوء الـ – / رەفتار خراپی.
سلاكة الاسنان/ خەلیلە، دان ئاژنە.
سلم:
سَلِمَ مِن خَطر: نَجا/ رزگاری بو.
– من عیب: بریءَ منه/ روسور بو.
سَلَّم علی: حَیَّا/ سڵاوی كرد.
– الی: ناوَلَ/ دایە، پێیدا، دایەدەستی.
– الأمر الی: أعطاه/ فرمانەكەی دایە دەست.
– أمْرَهُ الی الله/ كاری دایە دەست خوا.
– بالأمر: قَبِلَ/ پێی رازی بو، قایل بو، ملی درێژكرد.
– : إنقاد و أذعَنَ/ ملی شۆڕكرد.
– . إستلم الی العَدو/ خۆی دا بەدەستەوە.
– من خَطَر: نَجا/ رزگاری كرد.
– سلاحَهُ/ چەكی دانا، دەستی هەڵ بڕی.
سَلِّم سَلاحَك/ چەك دانێ، دەست هەڵ بڕە.
– (لی) علیه/ سڵاوی لێ بكە، سڵاومی بكەیەنێ.
سالَمَ. تَسالَمَ: تَصالَحَ/ ئاشت بوەوە.
أسْلَمَ الی: إنقاد/ ملی شۆڕكرد.
– : خَذَلَ. خانَ/ ناپاكی كرد، فرۆشتی، خۆی فرۆشت.
– أمره الی الله. سَلَّمَهُ/ كاری دایە دەست خوا.
– الروح: تَوَفّی/ گیانی (دا بەدەستەوە، سپارد، دەرچو)، مرد.
– : تَدَیَّن بالاسلام/ ئیسلامی كردە ئاینی، بوو بە ئیسلام.
تَسَلَّمَ. إستلم: تناوَل/ وەری گرت.
– : صار مسلماً/ بو بە ئیسلام.
– منه: تَبَرَّأ/ لێی بێبەری بو.
إستَسلَمَ: إنقاد/ ملی شۆڕكرد، خۆی دا بەدەستەوە، ملیدا.
سَلَعَتْهُ الحَیَّة: لَدَغَتْهُ/ مار پێوەیدا.
سِلْم. سلام: سَكینة/ هێمنی، بێ دەنگی.
– . – : ضد حرب/ ئاسایش، ئاشتی، ئاسودەیی.
– . – : سَلامَة: امن/ ئاسایش، ئاسودەیی.
سلام: تَحیَّة/ سڵاو، درود.
– : نشید وطنی/ سرودی نیشتمان.

دار الـ – : جَنَّة/ بەهەشت.
دار او مدینة الـ – : بغداد/ شاری بەغداد.
نهر الـ – : دجلة/ روباری دیجلە.
الـ – علیكم/ سڵاو، سڵاوتان لێ بێ، رۆژباش.
سَلامَة: الخُلو من العیوب/ چاكی، پاكی، بێوەیی.
– النیَّة: إخلاص/ دڵسۆزی، دڵپاك.
بـ – النیَّة/ بە دڵسۆزانە، بەنیەتی پاك.
سلیم. سالم: لیس به أذی/ هیچی نیە، بێوەیە.
– . – : صحیح/ تەواو، دروست.
– . – : لیس به عیوب/ بێخەوش، بێگەرد.
– . – البُنْیَة/ لەش ساخ.
– . – العقل/ هۆشیار، هۆشمەند.
– . – من كذا: خالٍ منه/ بێ خەوش.
– . – من الآفات و الامراض/ بێدەرد. ساخ.
– : صائب الرأی/ راست، راراست.
– العافیة/ لەش ساخ، تەندروست.
– النیَّة/ نیەت پاك، دڵسۆز.
– : لَدیغ/ ماران گاز.
سالماً غانماً/ رزگاری بەدەسكەوت، سەركەوتوی بەدەسكەوت.
استلام. تَسَلُّم: اخذ/ وەرگرتن.
إستسلام: إنقیاد/ رام بون، قایل بون، خۆبەدەستەوەدان، مل (دان، شۆڕكردن).
مُسَلَّم به: مقبول/ دان پیانراو، پێ‌لێنراو.
– به: لا نزاع فیه/ بێگرێ و گرفت، مشت و مڕ هەڵنەگرتن.
مُستَلِم: آخذ/ وەرگر.
مُسالِم: مُحِبّ السلم/ ئاشتی خواز.
– : مُتَسامِح/ میهرەبان، لێبوردە، نەرم، ئاسان.
تسلیم: قبول و رضا/ قایلی، قایل بون.
– : إذعان/ سەرشۆڕكردن.
– : مُناوَلَة/ دان، پێدان، دانەدەست، بەدەستەوەدان.
– : إلقاء التحیَّة/ سڵاو، سڵاوكردن.
– الی العَدو/ خۆبەدەستەوەدان.
– : إعتراف/ پێ لێنان.
شروط الـ – فی الحرب/ مەرجی بەدەستوەدان.

س

إسلام: دين مشهور/ ئیسلام.

– . مسلمین/ موسڵمان.

– : إنقیاد/ بەرێوەچون، سەرشۆڕکردن.

مُسلِم: محمدی/ موسڵمان.

سلیمانی: عَقار سام/ ژار، ژارجیوە.

سُلَم. سُلَّمَة: دَرَجَة/ پەیژە، قالدرمە، پلیکانە، پـێ پلیکانە، پایە.

إتخذه سُلَّماً/ پیا سەرکەوت، کردی بە پەیژە.

سُلامی. سُلامیة: عظمة الاصبع/ گرێی پەنجە، پـل، پلۆچکە.

سلمون. سلمون مرقط: سمك نهری/ ماسیە خاتونە.

سلا:

سَلا. سَلِيَ الشيءَ و عنه: نَسِيَهُ/ لەبیری چوەوە، لەبیری کرد، سەبوری خۆیدا.

سَلّی. اسْلی: الهی/ ئاسودەی کرد، دڵی دایەوە، دڵ نەوایی کرد.

– . – : عَزّی/ سەرخۆشی کرد، دڵی دایەوە، بەسەریاهات.

تَسَلّی: تَلَهّی/ خۆی خەریك کرد، سەبوری بەخۆیدا، خۆی ئاسودە کرد.

سُلو. سُلوان. سَلْوی: نسیان/ لە بیرچونەوە، لەبیرکردنەوە.

– . – . – : عَزاء/ پرسە، سەرخۆشی.

سُلْوَة. تَسلِیَة: لَهو/ رابواردن، کەیف کردن.

– . تسلیة لقتل الوقت/ بۆ رابواردن، کات کوشتن.

فی – من العیش: فی رغد منه/ خۆش گوزەرانی.

مُسَلّ: ملّه/ خەریك کەر، رابوێر، بۆ رابواردن، خەم رەوێن.

مَسْلاة. أماکن اللهو/ شوێن گەشت، گەشتگە، شوێنی رابواردن.

سَلْوی: کُلّ ما یُسلّی/ گەمە، گەشت، رابوێرە، خلافاندن.

– : سُمّن. طائر/ شیلاقە.

سم:

سَمَّ. سَمَّمَ الطعامَ: جعل فیه سُمّاً/ ژاراوی کرد، ژاری تێکرد.

– هُ: سَقاهُ السَمّ/ دەرمان خواردی کرد، ژاری دایە.

– القارورةَ: سَدَّها/ سەری نایەوە.

– الشيءَ: أصلَحَهُ/ چاکی کردەوە.

– بینهما/ اصلح/ رێکی خستن، ئاشتی کردنەوە.

– ت الریح: احرقت/ سوتانیەوە، گرە سوتانی.

سَمَّمَ الرَجُلَ: سقاهُ السَمّ/ دەرمان خواردی کرد، ژاری دایە.

– : لَوَّثَ و افسد/ پیسی کرد، ژاراوی کرد.

تَسَمَّمَ الرَجُلُ: تناوَل السُمَّ او دخل السم فی جسمه/ ژاراوی بو، دەرمان خواردبو، ژاری خوارد.

– الجرحُ: فَسَدَ الجرحُ/ لێی پیس کرد، توشی گانگرین بو.

سَمَّ الیومُ: إشتَدّ حَرَّهُ/ گەرمای کرد.

– النباتُ: احرقته السموم/ گرەسوتانی، گرە بـردی، شەرا لێیدا.

سُمّ. سَمّ. سِمّ: قَشَب/ ژار، ژەهر، زەهر.

– الفار: شَك/ مەرگەموش.

– قَتّال: ممیت. مُهلك/ ژاری بکوژ، ژاری هەلایل.

– : ثُقب/ کون، چاو.

– : جمع مَسام. منفذ الاوراق النباتیة/ وردیلە کون.

سامّ. مُسِمّ: ذو السَمّ/ ژاراوی، ژەهرین، بکوژ.

– ابرص: ابو بریص/ شەوگەرد.

یوم – و مُسِمّ و مَسموم: ذو سَموم/ رۆژی زۆر گەرم و گراوی.

تَسَمُّم: / ژاراوی بـون، ژارگـرتن، ژار لێـدان، دەرمـان خوارد.

– بولی/ میزەژار.

– دَمَوی/ خوێنەژار.

– ذاتی/ خۆژار.

اعراض ال – / نیشانە ژار.

مَسموم/ ژاراوی، ژەهرین، ژارین.

سَموم: الریح الحارّة/ گرە، سەبون، شەرا.

مَسام الجلد: ثُقَبَهُ و منافِذَه/ وردیلە کونی پێست، کونۆچکە، کونیلە.

سامی: ذو مسام/ کون کون.

سَمامَة: سنونو/ پەرەسێلکە.

سِمسِم: جلجلان/ کونجی.

سَمسَم: ثعلب/ رێوی.

– : ذنب گورگ.
– : نَمل أبيض أوناعم/ میروله‌سوره، ورده.
**سمت:**
**سَمَتَ. سَمَّتَ:** لَزَم السَمْت/ ڕێگه‌که‌ی گرت.
– . تَسَمَّتَ الشيءَ و نحوه: قَصَدَهُ/ بۆی چو.
**سَمْت:** طريق/ ڕێ، ڕێگه.
– : هيئَة/ بار، دۆخ.
– الـراس (فلك)/ ئه‌وپه‌ڕی ئاسمـان، که‌شکه‌شـانی فه‌له‌ك.
**سمج:**
**سَمُجَ:** قَبُحَ/ چه‌په‌ڵ بو، پیس بو.
**سَمَّجَ.** جَعَلَهُ سَمِجاً/ چه‌په‌ڵی کرد، پیسی کرد.
**سَمِج. سَميج:** قَبيح/ چـه‌په‌ڵ، پـیس، نـه‌گریس، زل (حۆرت، حین).
**سَماجَة.** قُبح/ چه‌په‌ڵی، پیسی، نه‌گریسی.
**سمح:**
**سَمُحَ:** كان سميحاً/ به‌خشنده‌بو، سنگ فراوان بو.
**سَمَحَ بكذا:** جادَ/ به‌خشی.
– بكذا: اذِنَ/ ڕێی دا، هێشتی، چاوپۆشی کرد.
– . سَمَّحَ: ساهَلَ ولانَ/ چاوپۆشی کرد، دڵی نه‌رم بو.
لا – الله: مَعاذ الله/ خوانه‌کا، خوانه‌کرده، دوربا، دوربێ، خوانه‌خواسته.
**سامَحَ:** صَفَحَ عن/ لێبورد، به‌خشی.
**تَسامَحَ:** تساهَلَ/ نه‌رم و نیانی نواند.
**إستَسمَحَ:** طلب السَمْح/ داوای لێبـوردن و به‌خـشینی کرد.
– : إعتذر/ پۆزشی هێنایه‌وه.
**سَمْح. سَماحَة:** جود/ به‌خشنده‌یی، میهره‌بانی.
– . سميح: من اهل السَماحَة/ به‌خشنده، میهره‌بان، سنگ فراوان.
**سَماح. سَمْح:** صَفح/ چاوپۆشـی، لێبوردن، به‌خـشین، لێخۆش بون.
– : إجازة/ ڕێدان، هێشتن.
**سَماحَة:** سعة الصدر/ سنگ فراوانی، میهره‌بانی.
**تَسامُح:** تَساهُل/ چاوپۆشی، لـه دڵ ده‌رچـون، به‌زه‌یی، میهره‌بانی، دڵ نه‌رمی.

**مُسامَحَة:** صفح/لێبـوردن، چاوپۆشـی کـردن، بـه‌زه‌یی پیاهاتنه‌وه.
**سَمحاق:** قِشرة رقيقة فوق عظم الراس/ پێستی سه‌ر.
**سمد:**
**سَـمَدَ:** رَفَـع راسَـهُ و نَـصَبَ صَـدرَهُ تكـبراً/ ســنگی ده‌رپه‌ڕان، خۆی قیت کرده‌وه.
**اسمـد:** إنـتفخ غيـضاً/ پـیـشی خـوارده‌وه، خـۆی گـیف کرده‌وه.
**سَمَّدَ الارض:** سَبَخَها/ پـه‌ینی کـرد، پـه‌یینی پێـوه‌کرد، په‌ینی دا.
**سَماد:** سِباخ/ په‌یین، سنێر، سه‌نێر.
**سميد:** دقيق ابيض/ ئاردی سپی.
**سمر:**
**سَمَرَ:** لم يَنَم و تَحَدَّثَ ليلاً/ شه‌و رای بوارد، شه‌وکۆڕی گرت.
**سـامَرَ. تَـسامَروا:** تَحَـدَّثوا لـيلاً/ بـه شـه‌و دوان، شـه‌و رایان بوارد، ده‌مه‌ته‌قێیان کرد.
**سَمِرَ. سَمُرَ. إسمَرَّ:** صار اسمر/ بۆربو.
**سَـمَّرَ. سـمَرَ. تَـسمَّرَ اللـبَنَ:** جَعَلَـهُ سَماراً اى رَقَّعَـهُ بالماء/ کردی به ماستاو.
– : شَـدَّ بمـسمار/ بزمـار ڕێــژی کـرد، بزمـاری پیاداکوتا.
– المسمارَ: دَقَّهُ ليدخل/ دای کوتا.
**سَمَرَ:** الحديث في الليل/ شـه‌و رابواردن، گفت و گـۆی شه‌و، ده‌مه‌ته‌قێ.
– : الليل و سَوادُه/ شه‌و و تاریکای شه‌و.
**سامِر:** مجلس المتسامرين/ کۆڕی رابواردن.
**سمير. مُتَسامِر. مُسامِر:** الرفيـق او العشير المـرح/ هاوڕێی خۆش مه‌شره‌ف، ئه‌رباب.
**اسمر. سَمراء اللون:** بين الابيض و الاسود/ بۆر.
– البشرة/ گه‌نم ڕه‌نگ، سه‌وزه.
**إمراة سَمراء/** سه‌وزه.
**سَمار:** لَبَنٌ كثير الماء/ ماستی ڕون، ماستاو، نزاو.
**مِسمار:** وَتَد من حديد/ بزمار، سـنجوق، سـنگ، مـێخ، مێخ زنجیر.
– رَزَّة: براسين/ بزماری دونوك، دوفاق.
– بِطاسَة: جُمان/ بزماری سه‌رپان.

- مُلَوْلَب: برغى/ برغو.
- بِصمُولة: صمولة و برغى/ سەمونەو برغو.
- القدم: تۆلول/ مێخەکە، بزمارەی پێ، بالوکە.
مَسمور: قليل اللحم/ لەڕ، باريك، کەم گۆشت.
سَمار: نبات کالحلفاء/ لەبان.
سَمُور: حيوان لە فر و ثمين/ سموره.
سمس:
سَمْسَرَ: صار سمساراً. توسط بين البائع و المشتری/ بو بە دەلاڵ، (دەلاڵی، جامبازی) کرد.
سِمسار: دَلّال. وسيط/ دەلاڵ، جامباز.
سَمْسَرَة: عمل السمسار/ دەلاڵی، جامبازی.
سمط:
سَمَطَ: سَکَتَ/ بێدەنگ بو.
- السکينَ: أحَدَّها/ تيژی کردەوە، ساوی‌یدا.
- : سَلَخَ او نَظَّفَ بالماء الحار/ دایماڵی، پاکی کردەوە، ئاوروتی کرد.
سَمَطَ: حَرق بِسائل او بُخار/ سوتان، داماڵین، داپلۆخان.
سِماط: الشيء المصطف/ هۆنراو، ریزکراو.
- : مايُبسط ليوضع عليه الطعام/ خوان، سفره، نانەبەرە.
سِمط: خيط السبحة و القلادة/ کشتەك.
سمع:
سَمِعَ: ادرك بالأذن/ بيستی، گوێی لێ بو، گوێی تێوەبو.
- بکذا: بَلَغَهُ خَبَرَهُ/ پێی وترا، پێی راگەیەنرا، بيستی.
- منه و له: اطاعه/ بە گوێی کرد، گوێ رایەڵی کرد.
- له الله: اجابه/ خوا بۆی هێنایەدی.
- عرضاً/ بەرگوێی کەوت، لەلاوە بيستی.
لم يُسمَعْ به: غير معروف/ نە بيستراوە، نەزانراوە.
سَمَّعَ. اسْمَعَ: جعله يسمع/ پێی راگەيان، دای بە گوێيدا.
- به: نَدَّدَ. نَوّه بذکره في الناس/ بەخراپ ناوی هێنا، قسەی شوێن خست، هەرەشەی لێ کرد، لەناواندا زڕانی.
- به: اذاع عنه عيباً و فَضحَهُ/ راستی لێ وت، ناوی زڕان.
- الدرس: تلاه/ خوێندیەوە، وتیەوە، گوێی لێ گرت.
اَسْمَعَهُ: جعله يسمع/ دای بە گوێيدا، پێی راگەيان.

- : شَتَمَهُ/ قسەی پێ وت، جنێوی پێدا.
إستَمَعَ. تَسَمَّعَ اليه: آصغى/ گوێی گرت، گوێی شل کرد.
- خلسه: تَسَمَّعَ: تَصَنَّتَ/ خۆی نایەوە، بەدزیەوە گوێی گرت.
السامِعَة: الأذن/ گوێ.
السامِعان: الأذنان/ دو گوێ.
سَمْع. سِماع/ بيستن.
- . مَسمَع: حاسة السمع/ هەستی بيستن.
- : الأذن/ گوێ.
- ك إلَيّ: إسمَع مِنّي/ گوێم لێ بگرە، لێم ببيسە، گوێم بۆ شل کە.
- اَ و طاعة/ گوێ رایەڵ و مل کەچم.
ثَقُلَ سمعه/ گوێێ گران بو.
سَمْعي: مختص بالسمع/ بيستن زان.
سَماع/ بيستن.
مقصور عل السَماع/ هەر بە بيستن، ئەڵێن.
سَماعي: ماخوذ بالسماع/ بە بيستن.
سَمّاعَة/ دەنگەوەرە، بيستەك، دەنگ وەر.
- الباب/ دەرکوت.
- التلفون/ دەنگ گەیەن، تەلەفۆن.
سامِع. مُستَمِع. سميع/ گوێگر.
سامِعون. مستمعون/ گوێ گران.
تَسَمُّع. إستماع/ گوێ گرتن.
على مَسمَع من/ بە ئاشکرا.
مسموع. مُسْمَع/ بيستراو.
غير - : خافت/نهێنی، نەبيستراو.
سُمْعَة: شُهْرَة. صيت/ ناوبانگ.
- حميدة/ ناوبانگ باشی.
- رديئة/ بەناتۆرە، ناوزڕاو، ناوبانگ خراپی.
حَسَن او حميد الـ - / ناوبانگ باش.
رديء الـ - / ناوبانگ خراپ.
سَماع: إسم فعل بمعنى إسْمَعْ/ گوێ بگرە، ببيسە.
سَمّاع: مُطيع/ گوێ (رایەڵ، لەمست).
- : جاسوس/ سيخوڕ، گوێ هەڵ خەر.
سمق:
سَمَقَ: على وطال/ بەرزبوەوە، هەڵ کشا.

# ق

قاءَ (فی قیا) قائمقام. قائمة (فی قوم) قاب (فی قوب) قابل. قابلة. قابلية (فی قبل) قات (فی قوت) قاد (فی قود) قارَ (فی قور) قار (فی قیر) قارَه. قارورة (فی قر) قاسَ (فی قیس) قاسِ (فی قسو) قاصّ (فی قص) قاصِ (فی قصو) قاضِ. قاضی (فی قضی) قاع. قاعة (فی قوع) قافله (فی قفل) قال (فی قول وقیل) قالب (فی قلب) قام (فی قوم) قامر (فی قمر) قامَة (فی قوم) قاموس (فی قمس) قانِ (فی قنو) قانون (فی قن) قاوم (فی قوم) قاضَ. قایض (فی قیض).

قب:

قَبّ. قَبَّبَ: بَنی قُبَّة/ گومەزی دروست کرد.

— : إرتفع/ بەرز بووەوە، هەلاوسا، بلّقی دا.

— : إقْتَبَ: قَطَعَ/ پەڕانی، بڕی.

— النبات و اللحم: يبس و جَفَّ/ وشكی كرد، وشك بووەوە، سیس بو.

— . قَبَّبَ الخصرُ او البطن. ضَمُرَ/ سك به قولا چو، لەربو، ناوقەد باریك بوه.

— القوم. قاموا او ذهبوا/ هەڵسان، ڕۆیشتن، بڵاوەیان لێکرد.

قَبَّبَ: حَدَّبَ/ قۆقزی كرد، ئاوسانی، هەڵی تۆقان.

قُبَّة: سَقف مُستَدير/ گومەز، گومەت.

— الخَضراء او الزرقاء: سماء/ ئاسمان.

— الإسلام: البَصرَة/ شاری بەسرە.

— الشهادَة عند اليهود. قُبَّة الزمان: خيمة الإجتماع/ دەواری كۆبونەوەی جولەكە.

— الجرس: مِرج الجرس/ گومەزی زەنگ.

— : المعدة الثانية فی المجرات/ هەزار لۆغانە.

قَبُّ الدیلاب (العجلة): وسطه/ كونی ناوەڕاستی (پێچكە، ڕەوڕەوە).

— الميزان: ذراعُ المُدَرَّج/ باسكی تەرازو، میلی تەرازو.

قَبّاب: الاسد/ شێر.

مُقَبَّب: لَهُ قُبَّة/ گومەزین، گومەزدار.

— : مُحَدَّب/ قۆقز.

قَبَب. دقة الخصر و ضمور البطن/ باریكی ناوقەد، سك به قولاچون.

ق

قبج:

قَبَج: طائر/ کەو.

انثی الـ – / چیل.

قبح:

قَبُحَ: کان قبیحاً. ضِد حَسَنَ/ ناشیرن بو.

قَبَّحَ: صَیَّرهُ قبیحاً/ ناشرینی کرد.

– علیه فعله: بَیَّنَ قُبحَهُ/ سەرزەنشتی کرد، تانوتی لێدا، کردەوە قۆڕەکانی دەرخست.

إستَقبَحَ الشيءَ: عَدَّهُ قَبیحاً/ لای ناشیرن بو، بە ناشیرینی دانا.

– : ضِد إستَحْسَنَ/ بە دلّی نەبو، لای خراپ بو.

قُبح. قَباحَة (فی القول او الفعل او الصورة): ضِد الحَسَنَ/ ناشیرین، قسەی ناشیرن، کردەوەی ناشیرین، شێوەی ناشیرین، ناپەسەند.

قُبحاً لە: بِئس/ رەزای خواتەوە.

قَبیح: ضِد حَسَنَ/ ناشیرین، قسەو کردەوەی قۆڕو ناشیرین.

– المَنْظَر/ ئێسك (قورس، گران)، ناشیرین، دەعەجان.

– : شائن/ ئابروبەر.

– : بَذيء/ چەپەڵ، پیس.

– : سفیه/ دەم شڕ، خوێڕی، لەوچە، لاپلەرسەنگ.

قبر:

قَبَرَ: دَفَنَ/ ناشتی، خستیە چاڵەوە، کردی بە ژێر خۆڵەوە.

قَبْر: مَدفَن/ گۆڕ، گڵکۆ، زێد.

– : دَفْن/ ناشتن.

– رمزی/ نزرگە، جێ نزرگە.

مَقبَر. مَقبَرَة. مقبُرَة: موضع القُبور/ گۆڕستان.

قُبَّرَة. قُنبَرَة. قُنبُرَة: طائر/ کلاوکورە، کڵاونە.

قبس:

قَبَسَ. إقتَبَسَ منه النار: اخذها شُعْلَة/ ئاگری لێ وەرگرت.

– . – النار: اوقدها/ دایگرسان، ئاگری کردەوە.

– . – الحمّی: اصیب بە/ تا گرتی، توش بو.

– . – العلم: تَعَلَّمَهُ/ فێر بو، فێری زانیاری بو.

إقْتَبَسَ عبارَةَ: نَقَلَها/ لێوەی وەرگرت، وەك ئەو نوسیەوە.

– مِن العلم: إستفادَ/ سود و کەڵکی لە زانیاریەوە وەرگرت.

قَبَس: مِقباس: جَذوَةَ/ تۆزێك ئاگر، پشکۆ، سکڵ، پزیسك.

إقْتِباس: تَعَلُّم و استفادة و نَقْل/ وەرگرتن، لێوەرگرتن، فێربون.

مِقْبَس: موضع الحَطب المشتعل/ ئاگردان.

قبض:

قَبَضَ الشيءَ و علیه و بە: امسکه/ گرتی.

– . قَبَّضَ: قَلَّصَ/ کرژی کرد، هێنایەوە یەك، تەسکی کردەوە، قوچانی، گوشی.

– بَطنَهُ: امْسَكَ/ سکی (دەرنەچو، نارەحەت بو، قەبز بو)، گرفتی کرد، توشی گرفت بو.

– صَدْرَهُ: غَمَّ/ پەست بو، پەژارە دایگرت، سنگی هاتەوە یەك.

– المال: اَخَذَهُ/ وەری گرت.

– علیه: القی القبض/ گرتی، بەندی کرد، بەند کرا، گیرا.

– ـهُ الله: اماته/ خوا بردیەوە، مرانی، مرد.

– عن الشيء: إمتنع عن إمساکه/ نەیگرت، بەریدا.

قَبَّضَ المال فلاناً: اعطاهُ/ دایە، پارەی (دایە، پێدا).

– وجهه فَتَقَبَّضَ: تَکَشَّر فی عبوس/ مۆن بو، روی گرژ کرد، دەم و چاوی دا بەیەکدا.

قُبِضَ: ماتَ/ مرد.

– المریضُ: اشرف علی الموت/ هاتە سەر (گیان دان، سەرەمەرگ)، کەوتە گیانەڵا.

تَقَبَضَ. إنْقَبَضَ: تَقَلَّصَ/ کرژ بو، هاتەوە یەك، کۆبوەوە.

– . – البطن: امسك/ دەرنەچو، قەبز بو، توشی گرفت بو.

– الیه: وَثَبَ/ ئەڵەم بازی بۆ دا، ئامبازی بو.

الله یقبض و یبسط: یضیق و یوسع/ خوا دەرو دائەخاو ئەکاتەوە.

إنْقَبَضَ صَدْرُهُ: إنْغَمَّ/ پەستی دای گرت، سنگی هاتەوە یەك، ماتەمینی دایگرت.

قَبْض: مَسْك/ گرتن.

- : تَقَلُّص/ كرژ بون، هاتنەوەیەك، گوشران.
- البَطْن: إمساك/ سك دەرنەچون، قەبزی، گرفت، گیراوی.
- المال: إستلام: تناول/ وەرگرتن.
یوم الـ - . - الأجور: إستلام الاجور/ رۆژی موچە وەرگرتن.
قَبْضَة: مَسْكَة/ گرتنێك.
- : مِلىء الكَفّ/ پڕ بە چنگ.
- اليد: جُمْع اليَد/ مشتەكوڵە، مشت.
- : مقبَض: يَدّ/ دەسك، قوڵف.
في قَبْضَتِه: في ملكه/ لایەتی، لای خۆیەتی.
في قَبْضَة يدِهِ: تحت سلطته/ لەژێر دەستیایە، لە بن دەسەڵاتیایە.
قابِض: مُتَسَلِّم/ وەرگر.
- علي: ماسِك/ گرتویەتی.
- : دَواء قابِض/ دەرمانی (گرفت، گیراوی).
- الأرواح: عِزرائيل/ گیان كێش، ئیزرائیل، عیزرائیل.
إنقباض: تَقَلُّص/ گرژ بون، كرژ بون، هاتنەوەیەك، گوشران.
- البَطن: إمساك/ سك دەرنەچون، قەبزی، نارەحەتی سك، گرفت، گیراوی.
- الصدر: هموم/ پەستی، پەژارە، سنگ تەنگی، ماتەمینی.
مُنقَبِض. مُتَقَبِّض: مُتَقَلِّص/ كرژ، كرژ بو، هاتوەوەیەك.
- الصدر. مَقبوض: مهموم. مُغَمّ/ پەست، پەژارەدار، دڵ زار، دڵ تەنگ.
مَقبوض: مُسْتَلَم/ وەرگیراو، گەیشتو.
- عليه: محجوز/ گیراو.
مَقبَض. مِقبَض: يَدّ/ دەسك، قوڵف، مشتو.
قبط:
قَبَّط وَجْهَهُ: قَطَّب/ روی گرژ كرد، دەم و چاوی دا بەیەكدا، مۆن بو، برۆی هێنایەوە یەك.
قِبط. قُبط. اقباط: نَصارى مِصر/ گاورەكانی میسر.
قبع:
قَبَعَ القُنفُذُ: ادخل راسه في جلده/ ژیشك خۆی گرمۆڵە كرد، سەری كردەوە (بەلەشیا، بە ناوا).
- راسَهُ: ادخَلَهُ في ثوبه/ سەری كردەوە بەناو جلەكانیا.
- : جثم/ هەڵنیشت، خۆی (مەڵاس دا، بۆسەدا).
- في مَنزِله أو مكانه: إنزوى/ پەنای گرت، خۆی تەریك كرت، لا تریسكەی بەست.
- ت المراةُ: إستَتَرَت/ خۆی داپۆشی.
- الرجلُ: صاحَ/ هاواری كرد، قیژانی، قیرانی.
- الخنزيرُ و الفيلُ: صَوَّتَ/ زریكانی، مرەی لێوەهات، مرقانی، مرخانی.
- عن أصحابِه: تَخَلَّفَ/ دواكەوت، بەجێ ما.
- في الارض: ذهب فيها/ خۆی كرد بە ناو زەویدا، سەری خۆی كرد بە كونا.
- : إقتلع. نَزَعَ/ دایكەند، دایماڵی.
قُبَّعَة: غطاء للراس/ شەپقە.
قَبّاع: خنزير/ بەراز.
- : جَبان/ ترسنۆك.
قُبَع. قُبّاع: قُنفُذ/ ژیشك.
قُبْع: بوق/ كەرەنا، بۆری.
قبق:
قبقاب: حِذاء خشبي/ قاپقاپ.
قبل:
قَبِلَ. تَقَبَّلَ: أخَذَ/ وەریگرت.
- الكلامَ: صَدَّقَهُ/ بڕوای كرد، باوەڕی كرد، سەلمانی.
- الأمرَ: رَضِيَ به/ قایل بو، پێی قایل بو، قبوڵی كرد.
- الأمرَ و الكلامَ: اذْعَنَ/ ملی دا، ملی درێژ كرد، گوێ رایەڵی كرد، ملی شۆڕ كرد.
قَبِلَ. اقْبَلَ الوَقتُ: إقتَرَبَ/ كاتە نزیك بوەوە، ئەوەندەی نەماوە.
اقْبَلَ اليه: اتى/ هات، هات بۆ لای، بەرەو روی هات.
- على الأمر: باشَرَ/ دەستی پێ كرد، دەستی دایە، بریاری كردنی دا.
- المحصول: كَثُرَ. اتى بِغَلَّة كثيرة/ بەرهەمی زۆری هێنا، بەرهەم زۆر بو.

ق

– ت عليه الدُنيا: نَجَحَ. صارَت مواتِيَة/ سەرکەوت، بۆی لوا، دەروی خۆشی لێکرایەوە.
**قَبَّلَ:** باسَ. لَثَمَ/ ماچی کرد.
– : سارَ جُنوباً/ بەرەو باشور رۆی.
**قابَلَ:** واجَهَ/ بەرەو رو بوەوە، بەرەنگاری بو، بەرەو روی وەستا، دیدەنی کرد.
– : کان اَمامَهُ/ لە بەردەمیا بو.
– : لاقی/ پێی (گەیی، گەیشت)، توشی (بو، هات)، بەرەنگاری بو.
– : الفِعل بمثلە/ وەك ئەوی کرد، داش بە داشی کرد.
– الشَرّ بالشَرِّ/ خراپە بە خراپەی کرد.
**إقْتَبَلَ:** رَجَعَ من الشَرّ الی الخَیر/ گەڕایەوە، لە خراپە روی کردە چاکە.
– الأمرَ: إستأنَفَهُ/ دەستی پێ کردەوە، تێ هەڵ چوەوە.
**تَقَبَّلَ:** اَخَذَ/ وەری گرت.
– : إستجاب/ قایل بو، بەدڵی بو، قبوڵی کرد.
**تقابل الرجلان:** إلتقیا/ بەرەنگاری یەك بون، (پێك، بەیەك) گەیشتن، توشی یەکتر بون.
**إستقبل:** لاقی/ پێی گەیشت، لەگەڵی کۆبوەوە.
– : واجَه/ رویەڕوی بو، بینی، دیدەنی کرد.
– الرَجُلَ: اَقبَلَ نَحْوَه. رحَّب بە/ پێش وازی کرد، بەرەو پیری چو، بە پیریەوە چو.
**قُبول:** ضِد رَفَضْ/ پەسەند کردن.
– : رِضی/ قایلی، قایل بون، بەدڵ بون، قبول کردن.
– : اَخْذ/ وەرگرتن.
– : إستعداد/ ئامادەیی.
– : تِرحاب/ پێشوازی، بە پیرەوە چون.
– . إقبال. یُسر. رَفاهِیَّة/ خۆشی، بون، کامەرانی.
**قابِل:** ضِد رافِض/ قایل.
– : قادِم. آتٍ/ هاتو، داهاتو.
– ان یکون او یصیر/ ئەشێ، شیان، گونجان، رەنگە، لەوانەیە ببێ.
– لکذا: عَرضَة لە/ ئەشێ بۆ.
– : مُوَلِّد/ مامانی پیاو.

– . قابِلَة: وِعاء/ دەفر، قاپ.
**قابِلَة:** مُوَلِّدَة/ مامان، مامانی ئافرەت.
– : قادِمَة. اللیلة القادمَة/ داهاتو، شەوی داهاتو، ئاینده.
**قِبالَة:** صِناعَة التولید/ مامانی.
**قابِلِیَّة:** إستعداد/ توانایی، توانست، توانا، ئامادەبون، لێهاتویی.
– : مَیْل/ ئارەزو، ئامادەیی.
– : شَهِیَّة/ ئارەزو، دڵ (بردن، تێچون).
**إقبال:** مَجيء/ هاتن.
– : إقْتِراب/ نزیك بونەوە.
– . یُسر/ خۆشی، بون، خۆش گوزەرانی، بەرفرەیی.
– : رَواج. طَلَب/ بازاڕ گەرمی، خواست.
علیه – : رائِج. مَطلوب/ بازاڕی گەرمە، خواست و داوای لەسەرە.
**إقبالاً و إدباراً:** جیئَةً و ذِهاباً/ هاتن و چون، ئەم سەرو ئەو سەر کردن.
**إستقبال:** لِقاء/ پێك گەیشتن، پێش وازی، بە پیرەوە چون.
– . مُستَقْبَل: غیر الماضي و الحاضر/ ئاینده، داهاتو، لەمەودوا، دوارۆژ.
غُرْفَة الـ – / ژوری (میوان، پێشوازی، پێك گەیشتن).
یوم الـ – / رۆژی (پێك گەیشتن، پێش وازی).
**مُقْبِل:** قادِم. آتٍ/ هاتو، داهاتو.
الشهر الـ – / مانگی داهاتو، مانگەکەی تر.
**متقابلان:** متلاقیان/ پێك گەیشتو.
– : وجها لوجه/ بەرامبەر یەك.
**مَقبول.** قُبِلَ/ پەسەند، پەسەند کراو.
– . یُقْبَل/ پەسەند ئەکرێ.
– : مُرضٍ/ قایل کەر، باش.
– : معقول/ بەجێ، ماقوڵ.
عُذرٌ – / بیانوی بەجێ.
غیر – / نابەجێ، ناچیزە، ناپەسەند، ناماقوڵ.
**قَبْل:** نقیض بَعْد/ پێش، بەر لە.
– کذا: ضِد بَعْدَهُ/ پێش، لە پێش، لەمەوبەر.
– ذلك. قبلئذٍ/ لەوەو پێش، لە پێشترا.

– ان/ پێش ئەوەی، بەر لەوەی.

من – . مِن ذی قبل: سابقاً/ لە پێشدا، پێش ئێستە، بەر لە ئێستە، هەر زو.

تابع: ما قَبْلَهُ/ لەسەر پێشترە.

قُبالَة: تِجاه/ لە پێش، لەبەردەم، بەرامبەر.

مُقابل: امام. تِجاه/ بەرامبەر.

– : بَدَل/ برى، جیاتی، لە جیاتی، لە جێی، لە جێگەی.

فی – ذلك/ لەجیلاتی، لە جێگەی، لەبری، لەجێی.

مُقابَلَة: مُلاقاة/ پێك گەیشتن، کۆبونەوە، چاوپێکەوتن، دیدەنی.

– : مُقارَنَة/ بەراورد، بەراورد کردن.

مُقْتَبَل: مَطْلَع/ سەرەتا، تاف، هەرەت.

– العُمر . – الشَباب: عنفوان/ (سەرەتا، هەرەت)ی لاوی، سێرەی گەنجی.

قُبُل: ضد مؤخر/ پێش، لە پێش.

مُسْتَقْبَل: واجِهَة/ بەرامبەر، بەردەم، پێش دەم.

– . مُسْتَقْبِل: الزمن بعد الحاضر/ دوایی، دوارۆژ، دوایین، ئایندە.

مُستَقْبِل/ پێشوازی، بە پیرەوە چو.

قِبَل: مَقدِرَة. طاقَة/ توانا، وزە.

لِ قِبَلَهُ دَین: عنده/ قەرزم لایەتی، وامم لایەتی.

قِبَل. اتانی مِن قِبَلِه: مِن عِندِه/ (لە لایەنیەوە، لەلای ئەوەوە) هات.

قِبْلَة. قِبيلَه: الجهة التي يُصلّي نحوها/ قیبلە، روتێکردن لەکاتی نوێژدا.

– الأنظار/ سەرنج راکێشەر.

قِبلى: جِهَة الجنوب/ باشور.

قَبالَة: مسئولِيَّة/ بەرپرسیاری.

– : عقد. إتفاق/ رێکەوتن نامە، پەیمان.

قَبيل: ضامِن/ دەستەبەر.

من – كذا: على سبيل كذا/ لەو بابەتە.

من هذا الـ – : مثل هذا. من هذا الخصوص/ وەك ئەمە، لەم بابەتە، لەم روەوە، لەم پێیە.

قبيلة: عشيرة/ هۆز، عەشرەت، خێڵ.

قُبْلَة: بوسه. لَثمَة/ ماچ.

قبن:

قَبَّنَ: وَزَنَ بالقَبّان/ قەپانی کرد، دای لە قەپان، کێشای، ترازوی کرد.

قَبّان: ميزان القَبّانى/ قەپان، تەرازو.

قِبانَة: أُجرَة الوزن/ کرێ قەپان.

– : عمل القَبّانى/ قەپانچێتی.

قَبّانى. مُقَبِّن/ قەپانچی.

قبو:

قبا السقفَ: عقده/ چنی، بەخشت چنی، دارەڕای کرد، سەریگرت.

– : قوَّس/ کەوانەیی کرد، چەمانیەوە.

قَبو: سقف معقود البناء/ بنمیچی بە خشت چنراو، گومەزی، گومەتی.

قُبْوَة: القبو الصغير المستطيل/ کۆریچە.

قَباء: ثوب يُلْبَس فوق الثياب/ سەرجل، کەوا.

قابٌ. قِباء: مقدار/ بڕ، تۆز، تۆزێك، هەند، نەخت

قاب قوسين و قِباءُ قوسين. مِقدار قوسين: كناية عن القريب/ زۆر نزیك، ماوەی دو کەوانە بۆ نزیکی.

قت:

قَتَّ: كَذَبَ/ درۆی کرد.

– : قَلَّل/ کەمی کردەوە.

قَتَّ الكلام: نَقَلَهُ على جِهَة الكذب و الفساد/ پێوەی (نا، هەڵ بەست).

إقْتَتَّ. إستَأصَل/ ریشەکێشی کرد، لەبن هەڵی‌کەند.

قَتّ: كذب/ درۆ، هەڵبەسراو.

قَتّات قَتوت: نَمّام. واشٍ/ پاش ملە باسکەر، پێوەنەر، بوختان کەر.

قتب:

قَتَبٌ. قِتبٌ: رَحْل الدابَّة/ بار، کۆچ و بار، رەخت.

قتر:

قَتَرَ. قَتَّرَ. اقْتَرَ على عياله: ضَيَّقَ عليهم فى النَّفَقَة/ دەستی لێ گرتنەوە، بەدەستندە بەخێوی کردن.

اقْتَرَ: قَلَّ ماله/ دەستی کورت بو، هەژار کەوت، هیچی نەما.

قُتْرَة: ضيق العيش/ دەست کورتی.

قَتْر. تقتير: تضييق فى النفقة/ دەست گرتنەوە، دەستندە.

- : القليل من العيش/ کەم گوزەرانی، دەست کورتی، نەدارایی.

قاتِر. قَتور. اقتَر. مُقتِر: بَخيل/ رژد، پارەپیس، لەچەر، پیسکە.

تَقتير: رُمقَة من العَيش/ کولەمەرگی، مەمرەو مەژی، دەست کورتی.

قتل:

قَتَلَ: امات. فتَكَ بِه/ کوشتی.

- : أعدَمَ/ لە سێدارەی دا، دای لە قەنارە.

- نفسه: إنتحر/ خۆی کوشت.

- الجوع او البرد: كسر حدته/ برسیەتی نەما، سەرما نەما.

- غليلَهُ: سَقاهُ/ تینوێتی شکان.

- الخَمرَةَ: مَزَجها بالماء/ ئاوی تێ کرد، روونی کردەوە.

- الوقت: امضاه/ کاتی بردە سەر، کاتی کوشت، خۆی خلافان.

قاتَلَ فُلاناً: حارَبَه و عاداه/ شەڕی (پێ فرۆشت) لەگەڵ کرد)، چو بە گژیا، دوشمنایەتی لەگەڵ کرد.

- ـهُ الله: لَعَنَهُ/ خوا (بیکوژێ، لەناوی بەرێ، توشی دەردی کا).

تقاتَلوا. إقتتلوا: تحاربوا/ چون بە گژ یەکدا، یەکتریان کوشت، جەنگین.

إستَقتَلَ: عَرَضَ نفسه للموت/ خۆی خستە مەترسیەوە، ملی لە تیغ سو.

- : إستمات/ ئازایەتی نواند، کۆڵی نەدا.

قَتل: إعدام الحياة/ کوشتن، کوشتار، خوێن رشتن، خوێن کردن.

- : قتل: إغتيال/ کوشتنی ناڕەوا.

- : الضرب الشديد/ لێدان.

- : الذات. إنتحار/ خۆش کوشتن.

الـ - الجماعي/ کۆمەڵ کوژ.

قِتل: عَدّو لَدود/ دوشمنی خوێنەخوێ.

قِتال: مَعرَكَة/ شەڕ، شەڕکردن، شەڕفرۆشتن، کوشتار.

- : حَرب/ جەنگ، جەنگین.

ساحَة الـ - / شەڕگە.

قَتّال: قَتول. كثير القَتل/ کوژراو.

قَتيل. مَقتول/ کوژراو.

قاتِل: الذي يَقتُل/ بکوژ، کوژەر، خوێن ڕێژ، خوێن خۆر.

- . قتّال: مُميت/ مرۆك، کوشندە، کوژەر.

مُقاتِل: مُحارِب/ جەنگاوەر.

- : مُصارع/ شەڕکەر، زۆران باز، پاڵەوان.

مُستَقتِل: مُتَهوِّر/ هەڵەشە، جەربەزە.

مُقاتَلَة: مُحارِبَة/ جەنگ کەر، جەنگاوەر.

طائرة - / فرۆکەی جەنگ.

مُقَتَّل. مُجَرَّب. خبير/ زانیار، خاراو، پسپۆڕ.

قتم:

قَتَمَ الغُبارُ: إرتفع/ بو بە تەپ و تۆز، خۆڵ باری، کردی بە (خۆڵ، تەپ و تۆز).

- : ضَرَب الى السواد/ ڕەش داگیرسا.

- وجهه: تَغَيَّر/ ڕەنگی گۆڕا، تێك چو.

قَتَّمَ: سَوَّدَ/ ڕەشی کرد.

(اقتَمَ: إسوَدَّ/ ڕەش (بو، داگەڕا، هەڵات).

قَتَمٌ: غُبار/ تەپ و تۆز، تۆزو خۆڵ، خۆڵە پەتانی.

قُتمَة. قَتمَة. قَتام: ظلام/ تاریکی، لێڵی، تاریکایی.

- . - . - : سَواد/ ڕەشی.

قاتِم: مُظلِم/ تاریك، سیا، نوتەك، تار، تەڵخ، نارۆشن.

اسود - / ڕەشی تەواو ڕەش.

ظلام - / تاریك و نوتەك، شەوەزەنگ.

اقتَم: ما لونه القُتمَة/ تاریك، لێڵ، ڕەش.

قث:

قَثَّ. إقتَثَّ: إستاصَلَ/ هەڵیکەند، ڕیشەکێشی کرد، دەریهێنا، ڕایکێشا.

- المال: جَمَعَهُ/ کۆی کردەوە، نایە سەریەك.

قُثاث: متاع/ کەل و پەل، شت و مەك، شروشیواڵ.

قُثاثَة. قُثيثَة: الجماعة من الناس/ کۆمەڵە خەڵك، چەند کەسێك.

قثا:

قثاء. قُثاء: خيار/ خەیار.

قح:

قُحّ: الخالص من كل شيء/ بێخەوش، پوخت، پەتی.

قحب:

قَحَبَ: سعَل/ كۆكی.

– وقاحَبَ و تَقَحَّبَت المرأة: كانت فاسدة فاجرة/ داوێن پیس بو، سۆزانی بو، داوێن پیسی کرد، قەحبە بو، گانیدا.

قَحْبَة: فاجِرَة. بَغِي/ داوێن پیس، سۆزانی، قەحبە، گاندەر.

قحط:

قَحَطَ. قَحِطَ المطرُ: إحْتَبسَ/ بێبارانی بو.

– . – العامُ: إحْتَبَسَ فيه المطرُ/ باران نەباری، ساڵەکە بارانی تیا نەباری، وشکە ساڵ بو، نەهاتی بو.

قَحَطَ القِدرَ: كَشَطَ ما لَصِقَ باسفلها من طعام/ کرانی.

قَحْطٌ: جَدْبٌ/ باران نەبارین، وشکە ساڵ، نەهاتی.

– : إمتناع المطر/ بێبارانی، وشکە ساڵ.

– : مَجاعَة/ برسیەتی، نەبونی، گرانی.

عام قَحْط وقاحِط و قحوط و مقحوط و قحيط: احتبس فيه المطر/ وشکە ساڵ، بێبارانی، باران نەباری.

قحف:

قَحَفَ. إقْتَحَفَ ما في الإناء: شربه كله بِشِدَّة/ هەڵی لوشی، چۆڕپڕی کرد، هەموی خواردەوە.

– . – السيلُ: جَرَفَ كل شيء/ رایدا، هەمو شتی راپێچ کرد.

قِحاف: شِدَّة الشرب/ هەڵ لوشین.

قُحاف: السيل الجارف/ لێشاو، لافاو.

قِحْفُ الرأس: جُمْجُمَة/ کاسەی سەر، کاپوڵ، کەپوڵ.

– : إناء من خشب/ تەشپی، کاسەی دار، کاسە.

– : إناء مكسور/ سواڵەت.

قحل:

قَحَلَ. قَحِلَ. قُحل. تَقَحَّلَ: يَبِسَ/ وشك بو، وشك بوەوە، وشکی کرد.

– . تَقَحَّلَ الشيخ: يَبِسَ جلده على عَظمِه/ لە پیریدا پێستەکەی وشك بوەوە بەسەر ئێسقانەکەی دا.

تَقَحَّلَ في لُبوسه و حالِه: كان سيء اللباس و الحال/ پەڕپوت و شڕۆڵ و کەساس بو.

قاحِل: قَحِل. قِحْل: يابس/ وشك، وشکەوەبو، بێناو، گروێ، دێمەرۆك.

قَحْل. قحولَة: يَبوسه/ وشکی، بێبارانی.

قحم:

قَحَمَ في الأمر. تَقَحَّمَ الأمْرَ: إنْدَفَعَ و تَوَرَّط. رَمى بنفسه بدون رَوِيَّة/ خۆی تێ فڕیدا، خۆی توش کرد، کوێرانە خۆی تێوە ئاڵان.

قَحَّم. اقْحَمَ في الأمر: دَفَع. ادْخَلَهُ فيه من غير رَوِيَّة/ توشی کرد، تێی فڕێدا، کوێرانە تێوەی گلان.

إقْتَحَم الأمْرَ و الشيء: إندفع فيه/ خۆی تێهاویشت، بۆی چو.

– المكانَ: هجم عليه: اطبق عليه/ پەلاماری دا، خۆی تێ هاویشت، داگیری کرد.

قُحْمَة: الأمر الشاق/ کار گران.

– : مَهْلَكَة/ مەترسی، بەڵا.

مِقحام: خَوّاض الشدائد/ جەربەزە، سەرکەش، نەترس، ئازا.

قحو:

قُحوان. اقحوان أصفر: بابونج/ بەیبون، نێرگسە درۆزنە.

– . – : قرقوز/ هەمیشە بەهار.

قد:

قَدّ. قَدَّدَ. إقْتَدَّ الشيء: قطعه مُستأصِلاً/ بڕی، لەبن دەری هێنا.

– . – . – الشيءَ: قطعه طولاً/ دایهێنا، بەدرێژی بڕیەوە.

– الكلام: قَطَعَهُ/ قسەکەی بڕی.

قَدَّدَ اللحمَ: جعله قطعاً/ جنی.

– اللحم: جففه/ وشکی کردەوە.

تَقَدَّدَ: تَشَقَّقَ/ دڕا، لەتی و کوت بو.

– الثوبُ: تَقَطَّع و بَلِيَ/ پوا، شڕووڕ بو، کۆن بو، دڕا، پەکی کەوت.

– الثوبُ: كان على قدره و طوله/ بە قەد خۆی بو.

– جَفَّ و يَبِسَ/ وشك بوەوە.

قُدّ. سَمَك القُدّ/ جۆرە ماسیەکە رۆن ماسی لێ ئەگیرێ.

قِدّ: سير من جلد/ پشتێنی چەرم.

ق

- : إناء من جلد/ هەمانە.
قدَّة: شَريحَة/ پارچە، تیلماسك، تولّ.
قَدّ: قامَة. قِوام/ بەژن، بالا، قەد، قەلافەت.
- : قَدْر أو حجم/ قەبارە.
على قَدِّه: على مقداره أو حَجْمِه/ بە قەد خۆیەتی.
قَدْ: رُبّما/ لەوانەیە، رەنگە، بەشكو، نەقا، تەقو.
قَديد. لحم مُقَدَد: مُجَفَّف/ گۆشتی (وشك، وشكەوەبو).
- : الثوب الخَلَق/ جلەشڕ، جلەكۆن.
قدح:
قَدَحَ فيه: ذَمَّهُ/ زەمی كرد، پاشملە قسەی پێ وت.
- في عِرضه: طَعَنَ فيه و عابَهُ و تَنَقَّصَهُ/ ناموسی شكان، سوكی كرد، شكانی، قسەی ناشیرینی پێوت.
- الدود أو السوس في العظم أو الشجر: كان فيها تاكل/ كلۆری كرد، كلۆر بو، كرم خواردی، كرمۆڵی كرد، رزی.
- . إقْتَدَحَ النار بالزند: حاول إخراج النار منه/ بە بەرد ئەستێ ویستی ئاگر بكاتەوە، بەرد ئەستێی لێدا.
- . - شراً أو شَرارَةً/ ئاگری لێ ئەبوەوە.
- في ساق أخيه: غَشَّهُ/ فێڵی لە برای خۆی كرد، هەڵی خەڵەتان، دەستی بڕی.
قَدْحٌ: ذَمّ/ زەم، زەم كردن، پاش ملە باس كردن.
قادِحَة: سُوسَةَ القدح/ كلۆر كەر، كرمۆڵ كەر، مۆرانە.
قَدّاح. قَدّاحَة. حَجَر صوان أو قَدح/ بەردئەستێ، داگیرسێن.
قَدّاحَة. مِقدَحَة. مِقدَح. مِقداح. حديدة القدح/ ئەستێ.
- : ولاّعَة سيجاير/ چەرخ، چەخماخە.
قَدَح: كاس/ پەرداخ، جام.
قدر:
قَدَرَ. قَدِرَ. إقْتَدَرَ: إستطاع/ توانی.
- . - . - على: قَوِيَ/ توانی بیكا، بەسەریا زاڵ بو.
- الرزق: قَسَّمَ/ دابەشی كرد.
- الشيءَ: قاسَهُ/ پێوای، خەملانی، هەڵیسەنگان.
قَدَّرَ الله فلاناً على كذا: جعله قادراً عليه/ خوا توانای كردنی دایە.
- الله عليه الأمر و قَدَّرَ له الأمر: قَضى و حَكَمَ به/ فەرمانی خوایە بەسەریا ئەبێ بیكا، لە چارەی نوسیوە.
- الشيءَ بالشيءَ: قاسَهُ/ پێی پێوا، پێی گرت.
- : ثَمَّنَ. عَرَفَ قيمَتَه/ مەزندەی نرخەكەی كرد، قەبلانی.
- الثَمَنَ: وَضَعَ الثَمَنَ/ نرخی بۆ دانا.
- الوزن: خَمَّنَهُ/ هەڵی سەنگان.
- الضرائِبَ و أمثالَه/ داینا، سەپانی، باجی داناو سەپانی.
- الكمية أو العدد/ قەبلانی.
- . قَدَّر على عياله: ضَيَّقَ/ دەستی لێ گرتنەوە.
- . اقْتَدَرَ على: مَكُنَ/ توانی، توانی بیكا.
لا - الله: لا سَمَحَ الله/ خوا نەكا، خوانەكردە.
تَقَدَّرَ: تَعَيَّنَ/ چارەنوس وابو.
قَدْر: الطاقَة و القُوَّة/ وزە، هێز، توانایی.
- : الحُرمَة و الوقار/ رێزو لێهاتویی، نیانی، سەنگینی.
- : كَمِيَّة. مَبْلَغ/ بڕ، چەندێتی.
- : دَرَجَة/ پلە، پایە.
- : قيمَة/ نرخ، بەها.
- : كون الشيء مساوياً لغيره/ وەك یەك.
- : مَقام/ پلە، پایە.
على - كذا: بالنسبة اليه/ بە گوێرەی ئەو، بەرێژەی، بە پێی.
على - كذا: يُساويه/ هاورێژە، وەك یەك.
ليلة الـ - : ليلة تقدير الأمور/ شەوی ٢٧ی رەمەزان، شەوی فەرمان و چارەنوس دانان.
قدر: مبلغ الشيء/ چەند، چەندێتی.
- : قَضاءُ الله/ چارەنوس، فەرمانی خوا.
بالقضاء و الـ - / چارەنوس وابو، بە رێكەوت.
قَدَرِي: يُؤمِن بالقَضاء و القدر/ ئەوەی باوەڕی بە چارەنوس و رێكەوتە.
قُدْرَة. مَقدِرَة: القُوَّة على الشيء و التمكن من فعله/ توانین، توانا، هێز، توانست، وزە، رایە، پەك.
قادر: له قُدْرَة/ بەتوانا، لێهاتو، بە سەلیقە.
مُقْتَدِر. قدير: قَوِيّ/ بەهێز، بەدەسەلات، دەسەلات دار.
إقتدار: قُوَّة/ هێز، وزە، تین، توانایی.

— : كَفاءَة/ لێهاتن، توانین، توانست، بەهرە، توانایی، سەلیقە.
بإقتدار: بكفاءَة و قُوَّة/ بە توانایی، بەهێزەوە.
تقدير القيمَة: تثمين/ نرخ دانان، نرخ برین.
— : تقديم/ پەسەند كردن، رێز لێنان، رێز گرتن.
— : مايقدره الله من قضاء/ چارەنوس.
— : تَخمين/ قەرینە، خەمڵ كردن، قەبلاندن، هەڵسەنگاندن، مەزندە.
— : فَرْض/ دانان، سەپاندن.
— : راي. نظر/ را، بریار، باوەڕ.
— السوء: تَشاؤم/ رەش بینی.
— الضرائب: فرضها/ باج دانان.
يَستَحِقُّ الـ — : ذو اهْلِيَّة/ شایانی رێز، شایانە، هەڵنەگرێ.
تقديري: تقويمي/ بە مەزندە، قەبلاو.
تقديراً: على سبيل الفرض/ باوا بێ، وادانان، دانان.
مُقَدَّر: مُضمَر. مذكور او مفهوم ضمناً/ زانراو، دیار.
— بكذا: مُثَمَّن/ نرخێنراو، نرخ دانراو.
— : مَقدور: محتوم/ چار نیە، هەر ئەبێ ببێ، خواخواست، چارەنوس.
مُقَدِّر: مُقوِّم/ بەها دەر، هەڵسەنگێن.
— : مُثَمِّن/ نرخ دانەر.
— السوء: متشائم/ رەش بین.
مَقْدِرَة. مَقْدَرَة. مَقْدُرَة: إستطاعَة/ هێز، توانین، توانایی، توانست، وزە، خوز.
— . — . — : غِنى/ ساماندارێتی، بون.
مَقدور: امر مَقدور: يَقتَدِر الأنسان على فعله/ كاری كردە، ئەو كارەی ئەكرێ.
— : امر محتوم/ ناچاری، چار نیە، هەر ئەبێ ببێ.
مَقْدَرَة: القضاء و القدر/ چارەنوس، رێكەوت.
— . مَقْدَرَة: القوة و الغنى/ هێزو توانا، دارایی توانین.
مِقدار: كَمِيَّة/ بڕ، چەند، چەردە، كێوڕ.
— : قياس/ پێوانە، كێش، كێش و پێو.
— عظيم: كمية كبيرة/ چەندێكی زۆر و گەورە، یەكجار زۆر، زەبەندە.

بِمقدار ما: على قدرما/ ئەوەندەی، بڕێك.
قِدر: إناء يُطْبَخ فيه/ مەنجەڵ، قازان.
— صغير: قُدَيْرَة/ مەنجەڵۆكە.
قدس:
قَدُسَ: كان طاهِراً او قديساً/ خاوێن بو، پیرۆز بو، داوێن پاك بو.
قَدَّس: جَعَلَهُ مُقَدَّساً/ پیرۆزی كرد، رێزی لێ نا، پەرستی.
— : كَرَّسَ/ تەرخانی كرد.
— : مَجَّدَ/ رێزی لێنا، بەرزی كردەوە، شكۆداری كرد.
— الكاهِن عند النصارى: اقام القُدّاس/ كونوێژی كرد، وتاری‌دا.
قَداسَة: طَهارَة/ خاوێنی، پیرۆزی.
— : لقب الحبر الاعظم/ نازناوی پاپا.
قُدُّوس. قِدِّيس: طاهر/ خاوێن، پیرۆز.
الـ — . القُدُّوس: من اسماء الله الحسنى/ خوا، یەكێ لە ناوەكانی خوا.
قِدِّيس: الفاضل المؤمن/ خواپەرست.
تَقْدِيس: تطهير/ خاوێن كردن.
— الشيء: جعله مُقَدَّساً/ پیرۆزكردن، پەرستن.
— : تكريس/ تەرخان كردن.
مَقدِس: مكان مُقَدَّس/ شوێنی پیرۆز.
بَيت الـ — : حرم القدس/ شاری قودس، مزگەوتەكەی قودس.
قُدْس: مكان مُقَدَّس/ شوێنی پیرۆز.
الـ — : الجَنَّة/ بەهەشت.
الـ — . بيت المقدس: اورشليم/ شاری قودس، ئورشەلیم.
مُقَدَّس: مُتَقَدِّس/ پیرۆز، پەرستراو.
— : طاهر/ خاوێن.
الأرض المُقَدَّسَة: فلسطين/ ولاتی فەلەستین.
قُدّاس: صلاة القُدّاس/ كونوێژی گاورەكان.
قدم:
قَدِمَ: اتى/ هات.
— : عادَ/ گەڕایەوە، هاتەوە.

ق

قَدُمَ: صار قديماً/: کۆن بو.

قَدَّمَ: اقدمَ: قَرَّبَ/ نزیکی خستەوە.

– . – يميناً: حَلَفَ/ سوێندی خوارد.

– . – اليه بكذا: امره به/ فرمانی پـێ‌دا، رای سپارد.

– : اورد ذكره/ باسی کرد، ناوی هێنا.

– : رَقّى/ بەرزی کردەوە، پێشی خست.

– : اعطى او اهدى/ بەخشی، دای، پێشکەشی کرد.

– : احْضَرَ/ ئامادەی کرد، هێنای.

– رايـاً: طَـرَحَ رايـاً. إقترح/ پێـشنیاری دا، رایـەکی دەربڕی.

– طَلَباً او شَكْوىً/ داوای دا، سکالای دا.

– خِدْمَة: اعطى/ خزمەتی کرد، خزمەتێکی کرد.

– شَخصاً الى آخر: عَرَّفَهُ به/ پێی ناسان.

– شَخصاً للمحاكمة: إستحضرة الى المحكمة/ دای بە دادگا.

– التهاني: هَنَّأَ/ پیرۆزبایی کرد.

– عَرْضـاً: عَرَضَـهُ/ نمایـشی (پیـشان دا، پێـشکەش کرد، ڕاگەیاند).

– ثَمَناً: عَرَضَهُ/ نرخی دا.

– الثَمَنَ: دَفَعَهُ مُقدَّماً/ نرخەکەی پێشەکی دا.

– إستقالة: عَرَضَها/ داوای وازهێنانی دا، وازی هێنا.

– له كذا: أمَدَّهُ به/ پێی دا، دایە، یارمەتی دا.

– ـهُ على سِواه: فَضَّلَهُ/ پێشی خست، پەسەندتری کرد.

– ـهُ: قَرَّبَهُ/ نزیکی خستەوە، پێشی خست.

قَـدَمَ. تَقَـدَّمَ القـومَ: سـبقهم/ پێـشیان کـەوت، کەوتـە پێشیانەوە.

قَدِمَ. قَدمَ. اقْدَمَ على: إجْتَرَأَ. تَجاسَرَ/ وێرای، زاتی کرد، غیرەت گرتی.

– . – . – على امر او عمل: شجع/ دەستی دایە، تینی دایە بەرخۆی، هانی خۆی دا، بڕیاری کردنی دا.

تَقَدَّمَ: ضد تَأَخَّرَ/ پێش کەوت، کەوتە پێشەوە.

– : إسْتَمَرَّ/ لەسەری ڕۆی، بەردەوام بو، کۆڵی نەدا.

– : نَجَحَ/ سەرکەوت، پێشکەوت.

– : تَحَسَّنَ/ چاك بو، باشتر بو، بوژایەوە.

– على: سَبَقَ. فاقَ/ پێشی کەوت، سەروی کەوت.

– بين يَدَيْـه: حَـضَرَ امامـه/ لەبـەر دەمیـا وەسـتا، هاتە بەردەمی.

إسْتَقْدَمَ: طَلَبَ حضوره/ داوای کرد، داوای هاتنی کرد، بانگی کرد.

– القدم: تَقَدَّمَهُم/ پێشیان کـەوت، لـە پێـشیانەوە بو، پێشەنگ بو، بو بە سوری بەر لەشکر.

قادم: آتٍ. مُقْبِل/ هاتو، داهاتو، مانگەکەی تر، ئایندە.

– الرَحْل: ضِد آخر/ پێشەنگ، ئەوەی لە پێشەوە.

الـشهر الــ – : آتٍ/ مــانگی داهــاتو، مانگەکــەی تــر، ئایندە.

قُدُوم: مَجيء. حضور/ هاتن، ئامادەبون، دیمانە.

تَقَدُّم: ضِد تَأَخُّر/ پێشکەوتن.

– : اسبقية/ پێشەکێتی.

– : نجاح/ سەرکەوتن.

تقديم: ضد تاخير/ پێش خستن.

– : إهداء/ پێشکەش کردن، دان.

– : تَعريف/ پێناسین.

مَقْدِم: قُدُوم: مجيء/ هاتن، گەیشتن.

مُقْدِم. مُقَدَّم: ضِد مُؤَخَّر/ پێش خراو.

مُقَدِّم: الذي يُقَدِّم/ پێش خەر، پێشکەش کەر.

مُقَدِّمَة. مُقْدِمَة: صَدر/ ڕوکاری پێشەوە.

– الجيش: ما في الأمام/ پێشەنگ، بەرایی.

– الكِتـاب: فاتِحَـة/ پێـشەکی، سـەرەتا بـەرایی، دیباجە.

مُتَقَدِّم: ضِد مُتَأَخِّر/ پێشکەوتو.

– في العمر: كبير السن/ بە ساڵاچو، پیر.

– : ناجِح/ سەرکەوتو.

– : مُتَحَسِّن/ چاك بو.

– : امامي/ ئەوەی لە پێشەوەیە.

الـ – : ذكره/ ناوبراو.

مُقَدَّم: قادمة/ پێشەنگ، بەرایی.

– : رتبة عسكرية/ سەرهەنگ، پێشەنگ.

مُقَدَّماً: سلفاً/ پێـشەکی، لـە پێشەوە، لـە پـێش هـەمو شتێکا.

قُدّام: ضِد خَلْف/ پێش، بەردەم.

– : ضِد بَعيد/ نزیك، داهاتو، لەمەولا.

تَقْدِمَة: هَدِيَّة/ دیاری.
– : تكريس. إهداء/ پێشكەش كردن، تەرخان كردن.
– : قُربان/ بەخت كردن، قوربانی، لە دەورگەڕان.
قِدَم: ضِد حداثة/ كۆنیەتی، كۆنی.
– : قِدْم. قُدْمَة: عتاقة/ دێرینێتی، رابوردوویی.
مُنْذُ الـ – /: لە (كۆنەوە، مێژەوە، دێرینەوە).
قَدیم: ضد جدید/ كۆن.
– : عتیق/ دێرین، دێر.
– : سابق/ پێشو، بەرو.
الـ – : الأزل/ ئەمر، هەمیشە، هەتاهەتایی.
فی الـ – : قدیماً/ لەوەوپێش، لەكۆنەوە.
قدیماً: منذ زمن بعید/ لە زۆر كۆنەوە، لە هەرە دێرینەوە، گەلێ لە مێژەوە.
اقْدَم: اكثر قِدَماً/ لە پێشتر، دێرینتر، لە مێژتر.
– : أعتق/ دێرین، دێرینتر، رابوردوتر، دێرتر.
– : اسد/ شێر.
– مركزاً او مَقاماً: اسبق/ لە پێشتر، پایەبەرزتر.
الأقدمون. القُدماء/ كۆنەكان، پێشین.
إقدام: بَسالة. هِمَّة/ ئازایەتی، هەنگاونان، خۆ بۆ پێشەوە كوتان.
قُدُم. قُدْم: شُجاع/ بوێر، ئازا، نەبەز.
– : المُضی الی الأمام/ كۆڵ نەدان، بەرەوپێشەوە.
مَضی قُدُماً: لم یعرج و لم ینثن/ كۆڵی نەدا، بەردەوام بو.
مِقدام: شُجاع. باسِل/ ئازا، نەبەز، جەربەزە.
قَدَم: رِجل/ پێ، قاچ.
– : خَطْوَة/ هەنگاو، شەقاو.
– : مقیاس انكلیزی/ پێ، ۱۲ ئینچ (گرێ)، ۳۰،٤۷۹ سم.
– . قَدَمَة. قُدْمَة: السابقة فی الأمر/ دەست پێشكەری.
ذو – : شُجاع/ ئازا، نەبەز.
علی – وساق: مُتَهَیِّاً/ لەسەرپێ، ئامادە.
قَدَمِیَّة: اجرة/ پێشەكی كرێ، پێیانە، پێشەكی.
قادِم: آتٍ/ هاتو، داهاتو، ئەوەی كەیەت.
قادِمَة. قوادِم الطیر: كِبار ریش جَناحِه/ شاپەڕ.

– : جَیش/ لەشكر.
– : متقدم/ پێشەنگ.
قَدوم. مِقدام: جَریء/ ئازا، بەجەرگ، نەترس، جەربەزە.
– النجار: فأس/ تەشوێ.
قدو:
قَدا. قَدِیَ الطعامُ. طاب طَعْمُه و ریحُهُ/ تام و بۆنی خۆش بو.
إقتدی به: تَشَبَّهَ به و فعل فِعْلَهُ/ پەیڕەوی كرد، چاوی لێ كرد، لاسایی كردەوە.
قَدا: الرائحة الطیبة/ بۆنی خۆش.
قَدِ. قَدِی: طیب الطعم و الرائحة/ تام و بۆن خۆش، بەتام و بۆ.
إقتداء: تقلید. مماثلة/ پەیڕەوی كردن، لاسایی كردنەوە، چاو (لێكەری، لێكردن).
قُدْوَة. قِدْوَة: مثال یُحتذی/ نمونە بۆ پەیڕەوی كردن، رابەر.
قذف:
قَذَفَ الشیءَ و به: رَمی به/ فڕێی دا، هەڵی دا، هاویشتی، توری دا.
– : اخرج/ دەری دا، دەریهێنا، دەری پەڕان.
– : قاءَ/ ڕشایەوە، هەڵی هێنایەوە.
– الرجلَ و فی حَقِّه: طَعَنَ فیه/ جنێوی پێدا، قسەی ناشیرینی پێ وت.
– فی حَقِّه بالشَرّ: فَضَحَهُ/ ناو و ناوبانگی زڕان.
– : ساق بالمِقذاف/ سەوڵی لێدا.
قَذَفَهُ بالحجر: رماه به/ بەردی تێگرت، بۆی هاویشت.
– بقوله: تكلم من غیر تَأَمُّل/ بێ بیركردنەوە قسەی هاویشت.
تَقاذَفوا: تراشقوا/ ئەیان گرتە یەكتری، گرتیانە یەكتری.
– الشتائم: تبادلو الشتائم/ جنێویان بەیەك ئەدا.
قَذْف: رَمی/ هاویشتن، فڕێدان، توردان.
– : إخراج/ دەرهێنان، دەردان، دەرپەڕاندن.
– : سَبّ/ جنێو، جوێن، جنێودان، قسە پێوتن، سوك كردن.

— . تقذيف: تجذيف/ سەوڵ لێدان، بەلەم لێ خورین.

— علّي: (بالنشر) ناوزڕان، لێنوسین.

قاذف: رامي/ هاوێژەر، فرێدەر، توڕدەر.

قاذفة: ضرب من الطائرات/ فرۆکەی هاوێژەر، هاوێژك.

قذيفة: مقذوف:كل ما يُرمى‌به/ فرێ دراو، موشەك، گوللەتۆپ.

مقذاف. مقذاف. مجذاف/ سەوڵ.

قذل:

قَذَلٌ: عيبٌ/ كەم و كوری، ناتەواوی، خەوش، نەنگی.

قَذال: ما بين الاذنين من مؤخر الرأس/ پشتی سەر.

قذي:

قَذِيَت عَينُهُ: قذفت بالغمَ و الرمص/ ریپۆقی کرد، چاوی ریپۆقی کرد.

— عَينُهُ: وَقَعَ فيها القَذى/ خۆڵ چوه چاوی، شت کەوتە چاوی.

قَذّى. اقذى عَينَهُ: اخرج منها القَذى/ شتی لە چاوی دەرهێنا.

قَذَى. قَذاة: ما يَقَع في العين/ خۆڵ و هەرشت کە بکەوێتە چاوەوە.

— : غَمَص. رَمَص: وسخ ابيض في مجرى العين/ ریپۆق، جیقنە.

يُغضي على القذى: يَحْتَمِل الضيم و لا يشكو/ دەردو ناخۆشی ئەخواتەوەو دەری نابڕێ.

قر:

قَرَّ اليومُ: بَرَدَ. كان بارداً/ سارد بو، ساردی کرد.

— الكلام في اذنه: وضع فاه على اذنه فاسمعه/ چرپانی، سرپانی بەگوێیدا.

— . إستَقَرَّ في المكان: ثَبَتَ و سَكَنَ/ جێگیر بو، جێنشین بو، توێتکەی گرت.

— . — على امر او رأيه على كذا: ثَبَتَ/ لەسەر یەك را گیرسایەوە، رای ساخ کردەوە، یەك رابوەوە، یەك لایی بوەوە.

— . — الرأي على كذا: ثبت/ رادرا، بڕیاردرا.

— ت عينُهُ: بَرَت سروراً/ بە مەرامی خۆی گەیشت،

— ت الدجاجة: صَوَّتَت/ قیرانی، قیرە قیری کرد، گارانی، گارەگاری کرد.

— ت بطنُهُ: قرقرت/ قۆرەی سکی هات، سکی قۆڕانی.

قُرَّ: اصابَهُ القُرّ اي البَرْد/ سەرمای بو، سەر ما لێیدا.

— الله عينه: اعطاه ما يشتهي و اسعده/ خوا پێی بەخشی و ئاسودەی کرد.

قَرَّرَ: صَمَّمَ على/ بڕیاری دا، سور بو لەسەر.

— : عَيَّنَ و حَدَّدَ/ دیاریی کرد.

— : بَتَّ. فَصَلَ في امر/ برانیەوە، بڕیاری دا.

— في نفسه/ لە دڵی خۆیا، بڕیاریدا.

— هُ: جَعَلَهُ يَعْتَرِف/ پێی درکان، راستی پێ وت، قسەی لێ دەرهێنا.

— هُ في المكان او على عمل: ثَبَّتَهُ فيه/ جێگیری کرد، دایمەزران، دایڕنا، دای مرکان.

— هُ على الحَقّ: جعله مُذعِناً له/ هێنایە ژێر بار، ملی پێ دریژ کرد.

— . اقَرَّ: ثَبَتَ. وَطَدَ/ چەسپانی، جێگیری کرد.

اقَرَّ عَينَهُ: اسَرَّهُ/ چاوی رون کردەوە، دڵی خۆش کرد.

— بخطيئة او بالحَقّ: اذعَنَ و إعترف/ دانی پیانا، دانی بە تاوان و گوناهەکەیدا نا، ملی دا.

— : إعترف/ درکانی، دانی پیانا، چوە ژێری.

تَقَرَّرَ: ثَبَتَ/ بڕیاردرا، چەسپی، جێگیر بو.

إستَقَرَّ بالمكان: سَكَنَ/ نیشتەجێ بو، دامەزرا، تۆقرەی گرت، توێتکەی خوارد، دابین بو.

— : ثَبَتَ/ چەسپی، جێگیر بو.

قَرّ. قارّ. قَرَّ: بارد/ سارد.

يومٌ قارّ: يوم بارد/ رۆژی سارد، رۆژی توش.

قارّة: مؤنث القار: بارد/ سارد.

— : قطعة عَظيمة من الأرض/ کیشوەر.

عَينٌ — : مَسرورة/ شاد، چاورون.

قارّي. مَناخ قاري/ سەخت، کەشی سەخت.

قُرّ. قِرّة: بَرْد/ ساردی، سەرما، سۆڵە.

مَقرور: مُصاب بالبرد/ سەرما بردو، سەرما لێداو.

إقرار: إعتراف/ درکاندن، دان پیانان، چونە ژێر.

— : تسليم. قبول/ خۆ بەدەستەوەدان، قایل بون، دەردەست بون.

- : تقرير: تثبيت/ جێگیر کردن، چەسپاندن.
مَقَرّ. مُسْتَقَرّ: مَسْکَن/ بنکە، نیشتگە، ئارامگە، بارەگا، بارخانە.
إستقرار: إسکان/ نیشتەجێ بون، دامەزران، دابین بون، توێتکە خواردن.
- : تثبیت/ چەسپین، جێگیربون.
مُستَقِرّ: ثابت/ راوەستاو، چەسپاو، جێگیر، نیشتەجێ.
مُقرَّر. ثابت/ دان پیانراو، بریار لەسەر دراو.
مُقَرِّر: مُقِرّ/ بریاردەر.
تَقرير: بیان/ پەخشنامە، راپۆرت، بریارنامە.
- المصیر/ چارەنوس، بریاری چارەنوس.
قَرار: قاع/ بن، ناخ.
- : ثَبات/ خۆڕاگری، جێگیری، جێگیر بون، چەسپاندن.
- . مَقَرّ: مسکن/ بنکە، نیشتگە.
- فی مَسالة: ماقَرَّ علیه الرای/ بریار.
- فی موسیقا: عبارة تتکرر فی اغنیة/ سەندنەوە، بۆ سەندنەوە.
لا - لە/ بێ (بریار، را)، بریارێکی نیە، رای نیە.
دار - الـ - : الآخِرة/ ئەوە دنیا، جیهانی دووەم.
اهل الـ - : اهل الحَضَر/ نیشتەنێ، شارو گوندنشین.
قُرَّة العَیْن: ما تَسُرُّ به العین/ چاو رون کەر، خۆشی هێن.
- العَیْن. قُرّ: نبات مائی جرجِر الماء/ کوزەڵە.
قرير العَیْن: مَسرور/ ئاسودە، شاد، شادمان، خۆشنود.
قارورة: إناء/ کەمۆڵە، شوشە، قاپ، بوتڵ.
قُرّ: دویبَة نطفو علی الماء/ ئاو رون کەرەوە.
قَرَه. قُرَّة. قِرَّة: ضفدع/ بۆق.
قَرّار: نَعّاب. نَقّاق/ تیرەقیر کەر، قور ناویلکە.
قرا:
قَرَأَ: طالع/ خوێندیەوە.
- علیه الدرسَ: تلاهُ/ بۆی خوێندەوە.
- علیه السلامَ: اقراهُ السلام: حَیّتَه/ سلاوی لێ کرد.
إستَقْرَا: طلب الیه ان یَقرَاَ/ پێی خوێندەوە، داوای لێ کرد کە بخوێنێتەوە.
- الأمر: تَتَبَّعَ. إستقصی/ دوای کەوت، لێی کۆڵیەوە، پشکنی.
قِراءَة: مُطالَعَة/ کۆشش، خوێندنەوە.
- : تلاوَة/ خوێندنەوە، خوێندنەوە بە دەنگی بەرز.
قاريء: مُطالع/ کۆشش کار.
- : مُتل/ ئەخوێنێتەوە، بخوێن، قورئان خوێن.
مقرا: مَسْنَد القِراءَة/ تەختە خوێند.
مَقروء. مَقريء: ما قُرِیَ/ خوێنراو، خوێنراوە.
- : یُقْرَا/ ئەخوێندرێتەوە.
- : واضِح/ دیار، ئاشکرا، باش ئەخوێندرێتەوە.
غیر - : غیر واضِح/ ناخوێندرێتەوە.
یقْرَا/ ئەخوێنێتەوە.
- و یکتب: غیر اُمّی/ ئەخوێنێتەوەو ئەنوسێ، خوێندەوار.
لا یَقْرَا/ ناخوێنێتەوە، نەخوێندەوارە.
قُرآن: المُصْحَف/ قورئان.
مُقريء الـ - / قورئان خوێند.
قرب:
قَرُبَ. قَرِبَ. کان قریباً/ نزیک بو.
- . - منه إقترب منه: دَنا منه/ لێی نزیک بوەوە.
- الوقتُ. إقْتَرَبَ/ کات نزیک بوەوە، کەمی ماوە.
قَرَّبَ: ادنی/ نزیکی کردەوە.
- ـهُ: جَعَلَهُ یَقْتَرب/ لەخۆی نزیک کردەوە.
- القُربان لله: قَدَّمَهُ. قَدَّم ذبیحة/ قوربانی دا.
- . قَرِبَ السَیْفَ: ادخله فی القِراب/ خستیەوە کالان.
قارَبَ: دانی/ نزیک بوەوە، لێی نزیک بوەوە.
اقريت الحُبْلی: قَرُب وقت ولادتها/ کاتی منداڵ بونی نزیک بۆتەوە.
إقترب: قَرُبَ/ نزیک (بوەوە، بۆتەوە).
- الشیئان: تقارَبا/ لەیەک نزیک بونەوە.
إستقرب: ضِد إستَبعَدَ/ نزیک بوەوە، نزیکی کردەوە.
تَقَرَّبَ الیه: إقترب منه/ لێی نزیک بوەوە، بۆی چو.
ق

— اليه: حاول نَيْل رضاه/ دڵنەوایی کرد، مەرایی کرد، خۆی لێ نزیك کردەوە.
تقارب الشيئان: ضِد تباعَدا/ لەیەك نزیك بونەوە.
— الزرعُ: دنا إدراكه/ خەریکە پێئەگا.
قُرب: خلاف البعد/ نزیکی، کن.
بِ — . بالـ — من: قريب منه/ له نزیك، نزیکە لەیەوە، لەکن.
قريب: ضِد بعيد/ نزیك.
— : نسيب/ زاوا، خزم، کەس، خوێش.
— العهد: حديث. جَديد/ تازە، نوێ.
في الـ — العاجل: قريباً/ لەم نزیکانەدا، هاکا، لە زۆر نزیکدا.
قريباً. عن قريب. عمّا قريب/ بەم نزیکانە، هاکا.
اقرب: اسم التفضيل/ نزیکتر.
اقرباء. اقارِب: من العشيرة/ خزمان، کەس و کار، خوێش، کەس.
اقرب الأقرباء/ نزیکترین (کەس، خزم).
قرابَة. قُربى: القرب في الرحم/ خزمایەتی، کەسایەتی، خوێشایەتی.
درجة الـ — / پلەی خزمایەتی.
صِلَة الـ — / کەسایەتی، پەیوەندی کەسایەتی.
تقريب. مُقارَبَة/ نزیك (بونەوە، کردنەوە)، بۆچون.
تقريباً: بالتقريب/ نزیکەی.
مُقارِب: وَسَط/ مام ناوەندی، نزیکە لێوەی.
قُربان: تَقْدُمَة. كل ما يُقَدَّم الى الله من ذبيحة/ قوربانی لە پێناوی خوادا.
قِربَة الماء أو اللبن/ مەشکە، کونکە، کوننە، جەوەندە.
قِراب: غِمد/ کالان، کێلان.
— المسدس/ کیف.
قارِب: زورق/ بەلەم.
قربوس السرج: حِنو السرج/ کەللەزین، قەلپۆزی زین، بەرکۆ.
قرت:
قَرَتَ. قَرِتَ الدمُ: جَمُدَ. تَخَثَّرَ/ مەیی، بەستی.
قَرَتٌ: جَمَد/ مەیین، بەستن.
— . دمٌ قارِت. دمٌ متجمد بين اللحم و الجلد/ خوێنی مەییو لەژێر پێستدا.
حيوانٌ قارِت: يأكل كل شيء/ هەمو شت خۆر.

قرح:
قَرَحَ. قَرَّحَ: جَرَحَ/ بریندار کرد، زامداری کرد، بری.
قَرِحَ. تَقَرَّحَ: خَرَجَت به القروح/ زامی لێهات، برینی لێهات، هەوی کرد.
إقترح: إرْتَجَلَ/ بەبێ ئامادەکردن و لێك دانەوە دواو گفتی دا، بە سەرپێوە وتی.
— : إبْتَدَعَ/ دایهێنا، دروستی کرد.
— رأياً: عَرَضَهُ/ پێشنیاری کرد.
— عليه كذا أو بكذا: اراد أن يصنع كذا/ پێشنیاری دایە کە بیکا، داوای لێ کرد کە بیکا.
قرحة. قَرْحَة: جَرح/ برین، هەو، تلۆق.
مَقروح. مُقَرَّح. قَرِح. مُتَقَرِّح: الذي به قروح/ زامدار، بریندار، برینداوی، زاماوی، هەوکردو.
قَرِيحَة: غَريزة/ ژیری، بەهرە، هۆش، دانایی.
— : عَقل/ ئەقڵ، بیر، ئاوەز.
إقتراح: إرتجال/ سەرپێ دووان.
— : إختراع/ داهێنان، دروست کردن.
— : رأي معروض/ رای دراو.
— : عَرض رأي/ پێشنیار.
قَراح. قَريح: صافٍ/ رون، خاوێن، پاك.
قرد:
قرد: سعدان/ مەیمون، سەگسار.
قُرد. قُراد: حَشَرَة/ کەنە، زج، سج.
قرس:
قَرَسَ. قَرِسَ البردُ: إشتَدَّ. كان قارِساً/ زۆر سارد بو.
قَرَّسَ. اقْرَسَ البردُ اصابعه: يَبَّسَها فلم يستطع أو يعمل بها/ پەنجەی بەستی، لە سەرمانا گۆی نەئەکرد.
قارِس. قَرَس. قَرْس. قَريس: البرد الشديد/ زۆر سارد، زوقم و سەرماو سۆڵە.
قرش:
قَرَشَ. تَقَرَّشَ: جمع/ کۆی کردەوە، کەڵەکەی کرد، ناپە سەر یەك، پەسمەندەی کرد.
— . قَرَّشَ. إقْتَرَشَ لعياله: إكْتَسَبَ/ پەیای کرد، دەستی کەوت.
قِرْش. قُرَيْش: كَوْسَج/ ماسی قیرش، درو، کوسە، نرنە ماسی.

قرص:

قَرَصَ لحمه او اذنه: أخذه و لوى بأصبعه فآلمَهُ/ نوقورچى لێ گوت، قورنجى لێگرت، گوێى بادا.

– : لَدَغَ. لَسَعَ/ پیا جزا، گەستى، پێوەى دا، گازى لێ گرت.

– : ـهُ بلسانه: قال له كلمة مؤلمة/ قسەى رەقى پێ وت.

– الشيءَ: قَطَعَهُ/ برى، لێى برى، قارسى كرد.

– . قَرَّصَ العجين: قطعة اقراصاً/ كـرنگى كـرت، كردى بە گونك.

قُرص: كل شيء مستدير/ خرپان، پانكەڵ، پەپكە.

– . قُرصَة: رغيف/ كولێرە، لەواشە، ئەستورك، خەپلە.

– دوائي: حبوب/ دەنكۆڵە، حەب.

– النحل: شمع العسل/ شانەى هەنگوين.

قَرْصَة بالأصابع/ نقورچ، نوقورچ، قورنج.

– : عَضَّةٌ/ گەستن، پیاچزان، پێوەدان.

قارِصٌ: مُؤلِم/ بەسوێ، بە ئازار، جەرگ بڕ.

قارِصَة: حكمة قارِصَة: الكلمة المؤلمة/ قسەى رەق، جەرگ بڕ.

قُرصان: لصوص البحر/ جـەردەى دەريـا، دەريـاگير، تەريدە.

– : قاطع طريق/ رێبڕ، جەردە، تەريدە.

قَرصَنَة: سَرِقَة/ دزى، جەردەيى، رێبڕى، تەريدەيى.

قُرّاص. قُرَّيص: بنات/ گيا گەزنە، نوسەنەك.

قرض:

قَرَضَ الشِعْرَ: قالَه/ هۆنراوەى وت، هەڵبەستى وت.

– . قَرِضَ رباطه: ماتَ/ مرد، گيانى سپارد.

– . قَرَّضَ الشيءَ: قَصَّهُ/ قرتـانى، كرتـانى، قرنجـانى، برى.

– . – : اكل/ خواردى.

– . – : نَخَرَ/ مەلى كوڵى، كلۆرى كرد.

أقْرَضَ: أعار. أعطاه قرضاً/ قەرزى دايە، وامى دايە.

إقْتَرَضَ: إستعار/ قەرزى كرد، خواستى، وامى كرد.

استقرض منه: طلب منه القرض/ داواى (قـەرزى لێ كرد، وامى كرد).

إنْقَرَضَ: بادَ/ نەما، فەوتا، لێ بوەوە، لەناوچو.

قَرِيض: شِعر/ هۆنراوە، هەڵبەست.

إنقراض: إفناء. إنتهـاء/ نەمان، فەوتان، بنەبڕبون، قـڕ تێكەوتن، دوابڕان، كوژانەوە، لەناوچون.

مُنقَرِض: بائد/ نەماو، فەوتاو، لەناوچو، دوابڕاو.

قَرض: سلفة/ سلفە، قەرز، خواستن، وام، دەستياو.

إقراض: إعارة/ دان، قەرزدان، وام دان، دەستياودان.

إقْتِراض: إستِعارَة/ قـەرز كـردن، وام كـردن، دەسـتياو كردن، خواستن، داواكردن.

مُقْرِض. مُعير/ خوازەر، قەرزدەر، وام دەر.

قُراضَة: قُصاصَة/ پارچە، لەت، كەرت، كوت.

قارِض. حيوان قارِض/ كرتێنەر.

مِقراض. مِقراضـان.. ما يُقَرَض بـه الثوب: مِقَصّ/ مەقەست.

– الصوف: مِجَزّ/ برينك.

قرط:

قَرَط. قَرَّطَ: قَطَعَ قطعاً صغيرة/ جنى، وردى كرد.

قَرَّطَ الفتيلة: نَظَفَها/ پلیتەكەى برى، رێكى خست، قرتانى.

– عليـه: أعطـاه قليلاً قليلاً/ لێـى گرتـەوە، بەدەسـندە دايە.

قُرط: حُلْيَة الأذن/ گوارە، ئەڵقەى گوێ.

– : شعلة النار/ گرى ئاگر، روناكى ئاگر.

– : عُنقود/ هێشو، بۆشك.

– : برسيم/ سێپەرە، سەمەن.

قِرطاس. قُرطاس. قِرْطَس: وَرَق/ تيانوس، پەڕە، كاغەز.

قُرطاسية: أدوات الكتابة/ كەرەستەى نوسين.

قرطمان: نبات/ گياگەنم.

قرظ:

قَرَظَ: مَدَح بِحَق أو باطل/ پيا هەڵدا، هەڵیدا.

– الكتاب: نَقَّحَهُ/ پياچوەوە، پوختى كرد، پوختەى كرد.

قريظ. تقريظ: مَدح/ هەڵدان، پياهەڵدان، ستايش.

تقريظ الكتب: تنقيح/ پياچونەوە.

قرع:

قَرَعَ البابَ: دَقَّهُ/ لە دەرگاى دا.

– الجرسَ: دَقَّهُ/ داى لە زەنگ، لە زەنگى دا.

– الطَبْلَ: دَقَّهُ/ تەپڵى لێدا، تەپڵى ژەن.

– الوَلَد: ضَرَبَهُ/ لێیدا، كوتاى، پياكێشا.

– سِنَّهُ: حَرَّقها ندماً/ لە پەشيمانيدا دانى هاتە ئێش.

ق

– ساقه للأمر: تَجَرَّدَ له/ خۆی بۆ تەرخان کرد، چاکی لێ کرد بەلادا.

– ـه امر: اتاه فجأة/ کارێکی ناکاوی (بۆ هات، توش بو).

– ـهُ ضميره: انّبَهُ/ پەشیمان بوەوە.

– : إقترع: إختار/ هەڵی بژارد.

قَرِعَ الرَجُلُ: سقط شعره/ سەری روتایەوە، کەچەڵ بو.

– المكان: خَلا/ بۆش بو، چۆڵ بو، هیچی تیا نەما.

قَرَّع: عَنَّفَ/ سەرزەنشتی کرد، قسەی پێ وت، هەرەشەی کرد.

تَقَرَّع الجلد: تَقَشَّرَ/ پێستی هەڵدا، قڵیشا، کەچەڵ بو.

قارَع. تَقارَعَ القوم: ضارب بعضهم بعضا/ یەکتریان داپلۆسی، دایان بەیەکدا، لەیەکیان دا، چون بەگژ یەکدا.

– . – . إقترعَ القومُ: ضَرَبوا القُرعَة/ پشکیان (هەڵدا، خست، کرد).

– . ساهم/ بەشداری کرد.

قَرْع: دَقّ/ لێدان، کوتان، داپلۆسین.

– الطبول: تطبيل/ تەپڵ ژەندن، تەپڵ لێدان، دەهۆڵ لێدان.

– : ضرب من اليقطين/ کولەکە، کولەکە سەنگەری.

مِقْرَعَة: سوط/ قامچی.

– الباب/ دەرکوت، کەڵەشێرەی دەرگا.

مِقراع: فاس تكسر بها الحجارة/ پیك.

قارِع: طارِق/ لێدەر، کوتەر، دەرکوت.

قَرَعُ الراس: صَلَع/ روتانەوەی سەر.

– : تَقَرُّح جِلْدَةَ الراس/ کەچەڵی.

– الحيوانات/ گرکە، گەری، گەرۆڵی.

اَقْرَع: اصْلَع/ روتاوە، سەر روتاوە.

– : مُصاب بمرض القَرَع/ کەچەڵ.

– : مُجَرَّد. اجْرَد/ روت، شاخی روتەن، داری پاك کراو.

قُرعَة: سَهْم/ بەش، پشك.

– : ما تلقيه لتعيين النَصيب/ پشك (خستن، هەڵدان، کردن).

القى القُرعَة/ پشکی (فڕێدا، خست، کرد).

قارِعَة: داهِيَة. نكبه/ بەڵا، کارەسات، نەهاتی، چۆڕتم.

– : قيامَة/ ئەوە دنیا، زیندوبونەوە، قیامەت.

– الطريق: وسطه/ چەقی رێگا.

– الدار: ساحتها/ حەوشە.

إقتراع. تقريع: ضرب القرعة/ پشك (خستن، هەڵ دان، کردن).

تقريع: تعنيف/ سەر (شکێن، زەنشت)، هەرەشە، قسە پێوتن.

قرف:

قَرَف. قَرَّفَ: قَشَرَ/ پاکی کرد، توێکڵەکەی لێکردەوە.

إقترف الذنب: فعله/ تاوانی کرد.

– . إكتسب. إقتنى/ دەستی کەوت، پەیدای کرد.

– المرضَ: اصيب به/ نەخۆش کەوت، توشی نەخۆشی بو.

تَقَرَّف الجرح: تَقَشَّرَ/ توێکڵی هەڵدا، قەتماخەی کرد.

قِرفَة: قِشرَة/ توێکڵ، توێخ، توێك، کاژ.

– الجرح او القُرفَة: جُلْبَة/ قەتماخە.

– . نوع من البَهار/ جۆرێکە لە بەهارات، دارچینی.

إقتراف: إرتكاب الذنب/ تاوان کردن.

مُقْتَرِف: مُرْتَكِب الذنب/ تاوان کار.

قَرْفَصَ: قَعَد القُرفصاء/ هەڵ (توتا، تروشکا)، هاتە سەر چیچکان.

قُرْفُصى. قُرفُصاء: جلوس على الرجلَيْن/ هەڵ تروشکان، هەڵ توتان.

قرق:

قَرَقَت الدَجاجَة: صَوَّتَت/ گارانی، گارەگاری کرد، مرقەمرقی کرد.

قرقُ الدجاجة/ گارەگار، گاراندن، قرتەقرت.

قَرْقَرَ الحمامُ: هَدَل. هدر/ خوێندی، گمەی هات.

– البعيرُ: هَدَر/ مرانی، بۆرانی.

– البطنُ: صَوَّتَ/ قۆرەی هات.

– الماءُ فى حَلْقه: صَوَّتَ/ بلقەبلقی کرد.

قَرْقَعَة الاصابع: صوت دق الاصابع/ چەقەنە، چەقەنە لێدان، بستە لێدان، پل تەقاندن.

قرم:

قَرَمَ. تَقَرَّمَ الطعامَ: اكله قليلاً فقليلا/ لەسەر خۆو کەم کەم خواردی، بە شێنەیی خواردی.

قَرْم. قِرْم: سَيِّد/ گەورە، گەورە پیاو.

قُرمَة الشجرة: ما بَقي من اسفل جذعها إذا قطعَت/ کۆتەرە، بنە (کۆتەرە، دار)، مورەدار.

قَرْمَدَ الشيءَ: طلاه بالقرميد/ کاشی کرد، خشت رێژی کرد.

قِرميد: طوب أحمر/ خشتی سور.

– . قَرْمَد: طلاء الحائط و غيره/ تەپراو، سواخ، گڵ گەچ، گەجکاری، روکەش، دیوارپۆش.

قِرمِز: صبغ احمر/ سور، بۆیەی سور، ئاڵ.

قِرمزي: كان بلون القرمز/ رەنگ سور، ئاڵی.

الحُمّى القرمزية/ سورەتا.

قرمط الكتاب: كتبه دقيقاً و قارب بين سطوره/ وردو پڕ نوسی.

قَرْمَطَة: التضيق و التقتير/ دەست گرتنەوە، دەسندە، کورت و کوێری، رژدی، چروکی.

قَرن:

قَرَنَ الشيءَ بالشيء: شَدَّهُ و وصله به/ جوتی کرد، پێکیەوە بەست.

– الثورين: جمعهما في نير واحد/ یەک کەمەڵەی کردە ملی دوگا.

قارَنَ: صاحَبَ/ برادەری لەگەڵ گرت، بو بەهاوڕێی.

– : قابَلَ بين شيئين/ بەراوردی کرد.

أقْرَنَ الصَيّادَ: ضرب طائرين بحجر واحد/ بەیەک بەرد لە دوانی دا، بە تیرێ دو نیشانی شکان.

– . إستقرن الدُمَّل: نَضَجَ/ دومەڵەکە گەیی، کاتی دەرک کردنیەتی.

إقْتَرَن بالشيء: إتَّصَلَ به و إلتصق/ پێوەی نوسا، پیالکا، پێی گەیشت.

– بالمرأة: تزوج منها/ مێنای، هاوسەری لەگەڵ گرت، جوتی گرت لەگەڵی.

قَرْن: ذؤابة المرأة/ پرچ.

– الحَيوان: الزيادة التى تنبت في راس الحيوان/ شاخ، قۆچ، برە.

– : مائة سنة/ سەدە، سەدساڵ، چەرخ، چاخ.

– الجَبَل: قمته/ لوتکە، پۆپە، سەرپۆپەی شاخ.

– الحَشَرَة: ملمس/ شاخ.

– الفول و امثاله: غلاف الحب/ پێلە.

– : عَصْر. جيل. اهل زمان واحد/ نەوە، وەچە، هاو (تەمەن، چەرخ، چاخ).

وحيد الـ – : حَيوان/ یەك شاخ، یەك قۆچ، کەرکەدەن.

ذو القرنين: لقب الاسكندرالمكدوني/ نازناوی ئەسکەندەر.

قُرون البحر: المرجان/ شیلان.

قرني: كالقرن او منه/ شاخی، قۆچی، لە شاخ ئەکا، لە شاخ دروس کراوە.

– : من الفَصيلة القرنية (في النبات)/ شاخدار.

قرنية العين/ گلێنە، بیلبیلە.

قِرن: نظير/ هاو، وەکو، لەیەك چو، یەکسان، چون یەك.

قُرنَة: ناصيَة/ قوژبن، گۆشە، سوچ.

قِران. إقتران: زواج/ جوت گرتن، هاوسەرگرتن، ژن مێنان و شوکردن.

– . – : إتصال شديد/ تێکەڵی.

قرين: مَقرون بآخر: متصل/ بەستراوە بە، پێکەوە بەند.

– : مُصاحِب/ هاوڕێ، هاوەڵ، دۆست.

– : زوج. بَعْل/ مێرد، هاوسەر، هاومل، نێرە.

قرينة: زوجة/ خێزان، ژن، هاوسەر، هاومل،مێیە.

– الكلام: ما يُصاحِبُه و يدل على المراد به/ مەبەست، مەزندە، لەوانەیی.

– : صلَة. علاقَة/ پەیوەندی، خزمایەتی، خوێشی، کەسایەتی.

– حال: إفتراض إحتمال/ مەزندە، وادانان، گریمانەیی.

الاستنتاج بالقرينه/ (بە گریمانەیی، بەمەزەندە) زانین و تێکەیشتن.

أقْرَن: له قرن او قرون/ شاخدار، قۆچدار.

– الحواجب/ برۆ پڕ، برۆ جوت، سێوەنگ.

مِقْرَن: نير/ کەڵەمە.

مُقْتَرِن: مُتَزَوِّج/ ژندار، ژنی هەیە.

– . مَقرون: مُتَّصل/ بەستراوە بە، پەیوەندی هەیە.

مُقارَنَة: مُقابَلَة. تنظير/ بەراورد، بەراورد کردن.

قرنابيط: نبات/ گوڵ کەلەرم.

قَرَنْفل: نبات/ مێخەك.

قرو:

قَرو: حوض مستطيل/ حەوزی درێژکۆلە.

قروانة الطين/ (تاس، لەگەن، تەشت، ساج)ی قوڕ، سوێنە.

– الأكل: صحن كبير/ لەگەن.

قرى:

قَرَى. إقترى الضيفَ: اضافَهُ/ میوانداری کرد.

قَرْيَة. قِرْيَة: ضَيْعَة/ گوند، دێ، لادێ.

– . – النَمل/ شارە مێروله، مێروستان.

– الأنصار: المدينة/ شاری مەدینە.

قَرَوِي: من سكان القرى/ لادێیی، گوندنشین.

ام القُرى: عاصِمَة البِلاد/ پایتەخت.

أُم القُرى. مكة المكرمة/ شاری مەکە.

أُم القِرى: النار/ ئاگر.

قارِيَة: دردار. طائر/ گەندەسمە.

مِقرىَ. مِقراءٌ: مِضْياف/ میوان دۆست، میوانەوان، نان (دەر، بدە).

قريحه (في قرح)

قز:

قَزّ. تَقَزَّزَ: شعر بغثيان النفس/ دڵی تێکەڵ هات، بێزی هاتەوە، قێزی هاتەوە.

تَقَزُّز: غثيان/ دڵ تێکەڵ هاتن، دڵ تێك چون.

– : إشمئزاز/ قێز هاتنەوە، بێزاری، بێز لێکردنەوە.

قَزّ: حرير/ ئاوریشم.

جَوْزَة الـ – : فَيْلَجَة/ قۆزاخەی کرمی ئاوریشم.

دودة الـ – : دودة الحرير/ کرمی ئاوریشم.

قَزّاز: بائع الحرير/ ئاوریشم فرۆش.

– : حائك. نَسّاج/ جۆلا، هۆنەرەوە.

قازوزه: زُجاجه/ شوشه.

قزح:

قَزَّحَ. زَيَّنَ/ رازاندیەوە، ئارایشتی دا.

قُزحَة: الوان قوس قزح/ رەنگەکانی پەلکەزێڕینە.

قوسُ قُزَح: قوس سحاب/ پەلکەزێڕینە، کۆلکە زێڕینە.

قَزَحِيَّة العين: حَدَقَة/ رەشێنەی چاو، گلێنە، بیلبیلە.

قَزَح: تابل/ بەهارات.

مِقْزَحَة: وعاء كالمملحة للخل و الزيت/ شوشەی سرکەو رۆن زەیت و بەهارات.

قزع:

قَزَع. تَقَزَّعَ راسه: حلقه و بقيت منه بقايا في نواحيه/ سەری قژچی تاش کرد، کردی بە ساچ و پەرچەم.

تَقَزَّعَ السحاب: إنْقَشَع/ رەویەوە.

قَزَع: سحاب خفيف متقطع/ هەوری (بڵاو پچرپچر، تەنك)

– : حلاقة الراس مع إبقاء شعر في نواحيه/ سەری قژچی تاش، ساچ و پەرچەم.

قُزعَة. مَزيع: قليل من الشعر في وسط الراس/ کەمێك قژ بە تەوقە سەرەوە.

قزل:

قَزَل: عَرَج/ شەلین، لەنگین.

اقزل: اعرج/ شەل، لەنگ.

قزم:

قَزَم. قَزِم. قَزْم: صغير الجسم/ کورتە (بالا، بنە)، بالابستە.

قَزمَة: صاقور/ پاچ.

قاس:

قَسَّ. تَقَسَّسَ. تَتَبَّع/ دوای کەوت، شوێنی (کەوت، هەڵ گرت).

– . – الأخبار: بَحَثَ. تَقَصّى/ گوێی (گرت، هەڵخست)، بۆ هەواڵ گەڕا.

– : نَمَّ/ بوختانی کرد، فیتنەو دو رویی کرد، پاشملە قسەی کرد.

– قُسوسَة: صار قَسّاً/ بو بە قەشە.

قَسّاس: نَمّام/ پاشملە دو، پاشملە قسەکەر، فیتنە، بوختان کەر دووڕو.

قَسّ: قسّيس: كاهِن/ قەشە.

قُسوسة: كَهَنَة/ قەشەیەتی.

قَساوَة (في قسو)

قسر:

قَسَرَ. إقْتَسَرَ على الأمر: لَرْغَمَ/ زۆری لێ کرد، ناچاری کرد.

قَسْر: إرغام/ زۆر لێکردن، ناچارکردن.

قَسراً: كرهاً/ بە نابەدڵی، زۆرەملێ، ناچاری.

— : إلزاماً/ بەزۆر.

قَسْرِي: كُره/ ناچاری، زۆرەملێ، نابەدڵ.

قسط:

قَسَطَ. اقْسَطَ: عَدَلَ/ بەداد بو.

قَسَّطَ: فَرَّقَ/ بلاوی کردەوە، لەیەکی جیاکردەوە.

— الدَّيْنَ: جَزَّأَهُ/ کردی بە ژەم، وامەکەی (کرد بە ژەم، بەش بەشی کرد).

قِسط: عَدْل/ داد.

— : عادل/ بەداد.

— : رزق/ دەرامەت، گوزەران، تفاقی ژیان.

— : مِقدار/ بڕ، هەند، چەندێتی.

— : ميزان/ تەرازو.

— : نَجم. جَزْء الدَّيْن/ ژەم، قیستی قەرز.

— : نصيب/ بەرکەوت، بەش.

تقسيط الدين/ ژەم کردن، قەرزدانەوە بە ژەم.

مُقْسِط: عادل/ بەداد.

قَسْطَرَ الدراهم: إنتقدها. نظر اليها ليعرف جيدها من رديئها/ سەیری دراوەکەی کرد تا بزانێ قەڵب نیە، تێژ روانی، هەڵی سەنگاند.

— : إستقطر المحصور بوله/ بە لولە میزی کرد.

قَسْطَرَ: انبوب القسطرة/ لولەی میزکردن.

— . إستقطار البول/ بە لولە میز پێ کردن.

— . عملية القسطرة: تشخيص مرض القلب/ قەستەرە، دۆزینەوەی نەخۆشی دڵ.

قِسطاس: ميزان/ تەرازو.

قَسْطل: انبوب الماء/ گونج، لولەی ئاو.

قسم:

قَسَمَ. قَسَّمَ: جَزَّأَ/ بەشی کرد، بەش بەشی کرد، جیای کردەوە، کەرتی کرد، بلاوی کردەوە.

— . — عليهم: فَرَّقَ عليهم/ دابەشی کرد بە سەریانا، بەشیەوە.

— . — الدهرُ القوم: فَرَّقهم/ بلاوەی پێ کردن، پەرەوازەی کردن.

— . — عدداً على عدد/ دابەشی کرد.

— . شَقَّ. نَصَّفَ/ لەتی کرد، کردی بە دو (کەرتەوە، بەشەوە).

قاسَمَ. إقْتَسَمَ. تقاسَمَ: اخذ كل قسمته/ هەریەکە بەشی خۆی برد، بەشیان کرد لەناو خۆیانا، بەشیان کرد.

إنْقَسَمَ. تَقَسَّمَ الشيءُ: تَفَرَّقَ/ بەش بەش بو، بلاوبوەوە، دابەش بو، کەرت بو.

إسْتَقْسَمَ: طلب القِسمَة/ داوای دابەش کردنی کرد.

— : فَكَّرَ و رَوَّى بين امرين/ داما، تیاما، راما.

— هُ: طلب منه ان يَحْلِف/ سوێندی دا.

اقْسَمَ: حَلَفَ/ سوێندی خوارد.

قِسم: جزء/ پارچە، کەرت.

— : حِصَّة/ بەش.

— : فرع من إدارة/ لق، بەش.

— : من بلاد/ پارچەیەکی وڵات، هەرێم.

قِسْمَة. تقسيم/ کەرت بون، لەت بون، دابەش بون.

— . — الى حِصَص/ بەش بەش کردن، بەش کردن.

— : عملية القِسْمَة في الحِساب/ دابەش کردن، بەش کردن.

— : نصيب/ چارەنوس، هات.

خارج القِسْمَة/ ئەنجامی دابەش کردن، بەرکەوت.

قاسِم: مُجَزِّيء/ بەشکەر، دابەشکەر.

— مُشترك اعظم/ گەورەترین بەشکەری ناوکویی.

قابليَة القسمة او الإنقسام/ باربەش، دابەش بون، توانایی کەرت بون و دابەش بون.

إنقسام: تَجْزِئَة. تفريق/ دابەش بون، کەرت بون.

تَقسيم: تجزِئَة/ کەرت کردن.

— : تفريق. توزيع/ جیاکردنەوە، دابەش کردن.

مُقَسَّم. مَقسوم: مُجَزَّأ/ کەرت کراو، بەش کراو.

— : مُوَزَّع/ جیاکراو، دابەش کراو.

مُقَسِّم: الذي يَقْسِم/ دابەش کەر، بەشکەر.

مَقسوم في الحساب/ دابەش کراو، بەش کراو.

— عليه. قاسم/ بەسەرا دابەش کراو، بەش دراو.

مُقاسِم: مُشارِك/ بەشدار.

مُقاسَمَة: مُشارَكَة/ بەشدارێتی؟

قَسيم: شَرِيك/ بەشدار، هاوبەش، بەشتیا.

— : شَطر/ کەرت، لەت، هاو، بەش.

— : قسيمة. مُقَسَّم: جميل/ جوان، نێسك سوك.

ق

قَسَّام: مُقَسِّم/ دابەش کەر، دابەش نامە، بەشنامە.
– شَرْعي/ دابەش نامەی یاسایی، بەشنامەی یاسایی.
– قانوني/ بەشنامەی یاسایی.
قَسَمٌ: يمين/ سوێند.
قَسِمَة الوَجْه: ملامح/ روخسار، سیما، رەنگ و رو، دیمەن، شێوە.
قَسام. قَسامَة: حُسْن/ جوانی، جوان پۆشی.
قسو:
قَسا: صَلُبَ/ رەق بو، سەخت بو، چەپ گەر بو، دڵ رەق بو.
– مَعَهُ و عَلَيْهِ/ دڵ رەق بو لەگەڵی، دڵ رەقی کرد لەگەڵی.
– الليل: أظلم/ تاریکی کرد، تاریك داهات.
قَسَّى. أقسى: صَلَّبَ/ رەقی کرد، رەقی نواند، دڵ رەق بو.
قاسى: كابَدَ/ چێژتی، خواردی، بەسەری هات.
– الألم: كابَدَهُ و عالج شِدَّتَهُ/ پێوەی نالان، دەردەکەی چێژت.
قاسٍ. قاسي: صَلِب/ رەق، رەق و تەق، سەخت.
– : شديد. عنيف/ دڵ رەق، بێبەزەیی، چەپ گەرد، ستەم کار.
قاسِيَة: مؤنث قاسي/ دڵ رەق، بێبەزەیی، رەق، سەخت.
ارضٌ – : لا تنبت شيئاً/ زەوی رەقان و سەخت، رەقەن، زبران.
ليلة – : شديدة الظلمة/ شەوەزەنگ، شەوی تاریك، تار، نوتەك، ئەموستە چاو.
تجربة – / بەسەرهات و تاقیکردنەوەیەکی سەخت.
شروط – / مەرجی سەخت و نالەبار.
قَسْوَة. قَساوه القلب: شِدّة. عُنْف/ دڵ رەقی، بێ بەزەیەتی، ستەم، توندوتیژی.
مُقاساة: مُكابَدَة/ چێژتن، خواردن، بەسەرهاتن، پێوە تلانەوە، نالاندن.
قش:
قَشَّ. اقَشَّ من المرض: بَرَأ/ چاك بوەوە.
– الثوبُ الرَطِبُ: اخذ في الجفاف/ کزبوەوە، وشك بوەوە.
– : جَمَع. لَمَّ/ کۆی کردەوە.
– : كَنَس/ گسکی دا.
– : إغترف/ کەفی گرت.
– النَباتُ: يَبُسَ/ وشك بو، وشکی کرد.
– . قَشَّشَ: اكل من هنا و من هناك/ مشەخۆر بو، مرومۆشی کرد، لەم لاو لەولا خواردی.
قَشّ. قَشّ: تِبْن. اليابس من النبات/ پوش، کا، بەڵم، پەلاش.
قَشَّة: ابو العيد/ خاڵخاڵۆکە.
قَشيش: حَفيف الأفعى/ فیشکەی مار.
– . قُشاش: لُقاحة الحقل/ گژوگیای وشکەوە بو، پاوەنی وشکەوە بو.
– . – : كُناسَة/ خۆڵ، گسك، دراو، جارو دراو.
مِقَشَّة: مِكْنَسَة/ گسك، جارو.
قشب:
قَشَبَ. قَشَبَ الطعامَ بالسَمِّ: خَلَطَهُ به/ ژاری تێکرد، ژاراوی کرد، ژاری کردە خواردنەکەوە.
– هُ السَمَّ: سَقاهُ إيّاه/ ژاری دایە، دەرمان خواردی کرد، ژارخواردی کرد.
– : صَقَلَ/ سویەوە، سافی کرد، لوسی کرد.
– عليه: إفترى/ بوختانی بۆ کرد، پاشمله قسەی پێوت.
– هُ: عَيَّرَهُ و عابه/ گاڵتەی پێ کرد، تانوتی لێدا، قسەی ناشیرینی پێ وت.
– . تَقَشَّبَ: عَلاهُ الصَداء/ ژەنگی (گرت، هێنا، هەڵهێنا).
قَشَّبَت. تَقَشَّبَت يده اوشفته: تقشرت/ قلیشا.
قِشْب. قَشَب: سَمّ/ ژار، ژەهر.
– : صَدَأ الحديد/ ژەنگ.
قَشَب: خشونه مع تَقَشُّر/ قلیش، قلیشاوی، قلیشان.
قَشيب: جديد/ تازەی، نوێ.
– : نظيف/ پاك، خاوێن، پوخت.
– مَجلو/ سواوە، ساف و لوس.
– : يعلوه الصدا/ ژەنگاوی، ژەنگی گرتوە.
قشد:

– : ظريف. لطيف/ شۆخ، شەنگ، روخۆش، جوان پۆش، قۆز، رازاوە، زەرقی، ئاڵ و والآ.
كَيِّس. كياسَة: عَقل/ ژیری.
– . – : فِطنَة/ وریایی، تێگەیشتویی، ژیری.
– . – : ظَرف/ شۆخی، روخۆشی، جوان پۆشی.
كيس: جراب/ تورەكە، هەمانە، كیس.
– : غِرارَة/ خورج، گونیە، هۆر، خەرار.
– الخِصيَتَيْن: صَفَن/ تورەكەی گون، كیسەی گون.
– من جلد/ پێستە، هەمانە.
– الدراهم/ جزدان، تورەكەی دراو، كیسەپارە.
– الوسادة/ بەرگە سەرین.
– لنقل التِّبن/ رەشكە.
– التَّبغ/ جاخ.
كيف:
كَيَّف: جَعَلَ له كيفية معلومَة/ گونجانی، رایهێنا.
– : سَرَّ/ دڵی خۆش كرد، پێخۆشحاڵی كرد.
تَكَيَّفَ: إتَّخَذَ كيفية/ بارودۆخێكی وەرگرت، راهات.
– . إنْسَرَّ/ دڵی خۆش بو، پێخۆشحاڵ بو، شادمان بو.
كَيفِيَّة: حال/ بار، دۆخ، چۆنیەتی، باردۆخ.
– : صِفَة/ رەفتار.
– : صُورَة/ شێوە، وێنە، شێواز، دیمەن.
كَيْف: حال/ چۆنیەتی، بار، دۆخ.
– : مِزاج/ هەوەس، ئارەزو.
– : هَوى/ خۆشی، رابواردن.
– : إرادَة/ ویستن، خواستن.
على – ك: كما تُريد/ بە هەوەسی تۆ، ئارەزوی خۆتە.
ليس له – : موعوك/ بێتاقەتە، نەخۆشە، ناساخە.
ليس له – : مُكتَئِب/ پەست، خەمبار.
كَيْفَما كان. بأية كيفية/ هەرچۆن بێ، چۆن رێكەوێ.
– كان. – إتَّفَقَ: على اَيِّ حال/ چۆن رێكەوت، چۆن ئەبێ.
تكييف: تعديل/ راهاتن، گرنجان، گۆران.
– الهَواء/ هەوا گۆرین.
مُكَيِّفَة الهواء/ باگۆر، باخۆشكار.

كيل:
كال. كَيَّلَ: قاسَ/ پێوای، پێوانەی كرد.
– . – الشيءَ بالشيءِ: قاسَهُ بِه/ ئەندازەی پێگرت، پێی پێوا، شت بە شت پێی پێوا.
وابَلَ: قايَلَ المِثلَ بالمِثل/ چی پێ وت وتیەوە، چی پێ كرد پێی كردەوە، تۆڵەی سەند، داش بە داشی كرد.
كَيْل: آلة الكَيْل/ پێوەر، ئەندازە.
كَيْلَة: المَرَّة من كال/ ئەندازەیەك.
– : وعاء يُكال به/ پێوەر.
مكيال. مِكْيَل: ما يُكال به/ پێوەر.
كيلو كرام/ یەك كیلۆ، ١٠٠٠ گرام.
كيلو متر/ یەك كیلۆ مەتر، ١٠٠٠ مەتر.
كيم:
كَيْما. كَي ما: لِكَي/ بۆ ئەوەی، لەبەر، لەبەر ئەوەی.
كيميا. كيمياء: علم طبائع و خاصيات الاجسام/ كیمیا.
علم الـ – / كیمیاگەری.
كيميائي. كيمياوي: مشتغل و مختص بالكيمياء/ كیمیاگەر، كیمیایی

# ل

ل : بمعنی لاجل. عند. الی. علی. فی. بعد/ لەبەر، لەلای، بۆ.

و معان اخری. مثل.

قُلت له/ پێم وت.

فَسَّرت له/ بۆم راڤەکرد.

لافعَلّن هذا/ هەر ئەی کەم.

لتعلمنی/ فێرم کەیت.

لیکتب/ با بنوسێ.

لا:

لالأ: تَلالأ النجم و البرق: لمع و اشرق/ درەوشایەوە، شەوقی دایەوە، بریسکایە، چەخماخەی دا.

– ت . – ت النار: إتَّقَدت/ گەشایەوە.

– الکلب بذنبه: حَرَّکَهُ/ کلکی (لەقان، راوەشان)، کلکەلەقێی کرد.

– بلسانه: لَهَثَ/ هەناسەبڕکێی پێکەوت، زمانی دەرهێنا.

تَلالأ وجهه: اشرق و إستنار/ روی کرایەوە، درەوشایەوە، پێکەنی.

لالأة: لمعان/ درەوشانەوە، شەوق دانەوە، بریسکانەوە.

– النجوم: لمعانها/ جریوە جریوی ئەستێرە، درەوشانەوەی ئەستێرە.

مُتَلالیء: مُضیء و مُشرق/ درەوشەدار، شەوقدار، ئەبریسکێتەوە، ئەدرەوشێتەوە.

لؤلؤ. لآلیء: دُرّ/ مرواری.

زهرة الـ – : نبات. الاقحوان/ خەزیمۆك.

عِرق الـ – : مَحارَة/ قاوغە مرواری.

لؤلؤی. کاللؤلؤ. بلون اللؤلؤ/ رەنگ و شێوەی مرواری، لە مرواری ئەکا.

لام:

لأَمَ الجرحَ: ضَمَّدَهُ وشَدَّهُ/ زامەکەی تیمارکرد و پێچای.

– . لاءَمَ: اصلح/ چاکی کرد، پینەی کرد، گونجانی.

– . – المعدن: لحمه بالاحماء و الطرق/ پێکیەوە (لکان، نوسان)، لەحیمی کرد.

لاءَمَ بَیْنَهم: اصلح/ ئاشتی کردنەوە، رێکی خستنەوە.

– بین الأمرین: وَفَّقَ/ گونجاننی، یەکی خستن، رێکی خستن.

– هُ الشيء: وافَقَهُ/ پێی کەوت، بۆی بو، بۆی گونجا، پێوەی هات.

إلتَامَ. تَلامَم: إصطلح/ چاك بوهوه، بوو.
— : إنْضَمّ و إلتصق/ پيانوسا، پيالكا، پێكەوه نوسان.
— الشيئان: إتَّفَقا/ بۆ يەك گونجان.
— الشيئان: إتّحدا/ پێك هاتن، رێك كەوتن، بۆ يەك بون، يەكيان گرت.
— الجرحُ: إندمل. إلتَحَم/ گۆشتەو زونى هێنا، (قەتماخە، قرتماخە)ى بەست، سارێژ بوەوه، چاك بوەبوه، دەمەكەى هاتەوه يەك، بزماتەى كرد.
— القومُ: إجتمعوا/ كۆبونەوه.
— المجلس: إنعقد/ ئەنجومەن بەسترا، گيرا، كۆبونەوه، كۆرەكە گيرا.
— الفريقان: تَصالحا و إجتمعا/ ئاشت بونەوه، پێك هاتن، رێك كەوتن.
لَؤُمَ: كان غير كريم، دَنيءَ/ ناپاك بو، بەدبو، مارِس بو.
— : كان دنى الاصل مهيناً/ رسوا، نارەسەن بو.
الأمَ. تَلامَم: عمل الدناءة و الخِسَّة/ ناپاكى كرد، بەدى كرد.
تَلاؤُم. لِئم: إتفاق/ گونجان، بۆبون، رێك كەوتن.
— . — : صُلح. سلام/ ئاشتى، ئاسايش، پێك هاتن، رێك كەوتن.
مُلائم: مُناسِب/ گونجاو، بۆبو، لەبار، بەجێ.
مُلاءَمَة: مُطابَقَة. إتفاق/ گونجان، بۆبون، رێك كەوتن، لەباربون، پێكەوتن.
مُلْتَئِم: مجتمع/ كۆ، كۆوەبو.
— : مُنْعَقِد/ گيراوه، بەستراو.
— : مُنْصَلِح/ چاك كراو، چاك بو.
— : مُنْدمِل (جَرح)/ سارێژ، گۆشتەوزون، بزماتە.
— : مُلْتَحِم او مُتَحِّد/ پێكەوه (نوساو، لكاو)، يەك گرتو.
لؤْم: دَناءَة. خِسَّة/ ناپاكى، بەدى، دوزمانى.
— : بُخل/ رسوايى، رژدى، پيسكەيى، پارەپيسى.
لئيم: دَنيء/ سوپو، ناپاك، پيس، بەد، مارِس.
— : مُخادِع/ فێل باز، تەڵەكەباز، ساختەچى.
— : بخيل/ رژد، پارەپيس، پيسكە، رسوا.
— : دنى الاصل/ رەگەزپيس، ناجسن، نارەسەن، نانەژاد.
لا:
لا: ضد نعم/ نا، نە، نەخێر، نەء.
— بُدّ/ چار نيه، هەر ئەبێ.
— شيء/ هيچ.
— إرادى/ خۆنەويست.
— سلكى: بدون سلك/ بێتەل.
— اعرف: لاادرى/ نازانم.
— يَلين/ نەرم نابێ.
— تخف/ مەترسە.
— رجل فى الدار/ پياوى تيا نيه، پياو لەماڵ نيه.
لائحة (فى لوح) لائق (فى ليق) (لاح فى لوح) لاذ (فى لوذ) لاشى (فى لشو) لاط (فى لوط) لاقى (فى لقى) لاك (فى لوك) لام (فى لوم) لان (فى لين) لاهوت (فى لهت)
لب:
لَبَّ. اَلَبَّ بالمكان: اقام/ نيشتەجێ بو.
— اللوزة: كسرها إستخرج لُبَّضها/ شكانى و ناوەكەى دەرهێنا.
— : صار لبيباً/ ژير بو، زرنگ بو، ئاقڵ بو.
لَبِبَ. لَبَّبَ: صار ذا لُبّ/ (ناو، ناوك، دەنك، كاكڵە)ى كرد.
تَلَبَّبَ للقتال او العمل: تَشمَّر و تَحَزَّم لە/ ئامادە بو، چاكى لێكرد بە لادا، قۆڵى لێ هەڵ كرد.
لبيب: مُلازم للأمر. لايَفتُر عَنْهُ/ بەردەوام، كۆڵ نەدەر.
— : عاقِل/ ژير، زرنگ، ئاقڵ.
لَبَّيْك: إقامَة على طاعتك. إجابة بعد إجابَة/ بفەرمو، ئامادەم، پەيرەويت ئەكەم، سەرم لەرێيە.
لُبّ. لُباب: خالص كل شيء/ پوخت، مۆخ، كرۆك.
— . — الموضوع: جوهر/ پوختە و كورتەى باسەكە، جەوهەر.
— . — الجوز: قلب/ كاكڵە.
— . — اللوز: نواة/ ناوك، دەنك.
— . — الثمر: شَحْمَتُه/ گۆشتەكەى.
— . — الخُبز و الصمون: قلب/ هەوير، ناوى سەمون.
— : — قلب/ دڵ، ناوكرۆك.
— : عقل/ ژيرى هۆش، تێگەيشتن، ئەقڵ.
— البطيخ و الخيار و أمثالها: الحَبّ/ تۆو، دەنك.
لَبَّة. لَبَب: موضع القلادة/ گەردن، سنگ و گەردن.
تلبيب (الجمع تلابيب): طوق/ يەخە، بەرۆك.

اخذ بتلابيبه: امسكه/ يەخەی گرت، بەرۆكی گرت.
لبلاب: نبات/ لاولاو.
لبأ:
لِبَأ: اول اللبن. مِسْمار اللبن/ زەك، فریشك.
لَبَأة: لَبْوَة: انثى الأسد/ دەڵە شێر.
لبث:
لَبِثَ و تَلَبَّثَ بالمكان: مَكَثَ و اقامَ به/ گلی خواردەوە، تیامایەوە، مایەوە.
ما — ان فعل كذا: ما ابطأ. ما تأخَّرَ/ دوای نەخست، كەمتەرخەمی نەكرد.
تَلَبُّث: تَوَقُّف/ وەستا، دواكەوت، گلی خواردەوە.
لَبث. لَبث. لُبث: تَمَهُّل. بُطىء/ دواكەوتن، وەستان، سستی، كەمتەرخەمی.
لُبثه: تَوَقُّف يسير/ پشو، تاوێك وەستان.
لبخ:
لَبَخَ: ضَرَبَ/ لێی دا، پیاكێشا.
لَبَخ: شجر معروف/ ئەكاسیا.
لَبيخ: لَحيم/ گۆشتن، قەڵەو، كەتە، شیشمان.
لبد:
لَبَدَ. لَبِدَ بالمكان: اقام به/ تیامایەوە، پێوەی نوسا، لێی نەجولا.
— بالشیء: لزق به/ پیانوسا، پیالكا، پێوەی نوسا، لێی نەبوەوە.
— . لَبَّدَ الصوفَ: صَيَّرَهُ يَتَلَبَّد/ خوریەكەی سووەوە، كردی بە لباد، كارگەی كرد.
لَبَّدَ. تَلَبَّدَ الشیء: لصق بَعْضَه ببعض/ چوەیەك، پێكەوە نوسا.
تَلَبَّدَ الصوفُ: تداخلت أجزاءه و لزق بعضها ببعض/ پەسترا، بەیەكا نوسا، چوەیەك.
— ت السماء بالغيوم: غَيَّمَت/ هەوری كرد، ئاسمان بو بەهەور.
— و البد بالارض: إلتصق/ بەزەویا نوسا، پیالكا، چەقی.
لِبْد: ما يوضع تحت السرج/ ژێرزین، نەرمەزین، نمەزین، نمەد، ئارەق چن.
— . لِبدَ. لَبّاد: صوف مُتَلَدّ/ لباد، خوری سواوە.
— . لُبْدَة الاسد: عُرف الأسَد/ یاڵ و قژی شێر، كەڵەموچ.
— . — : الشَعْر او الصوف المتلبد/ تووك و مووخوری بەیەكاچوی پەستراو.
لُبَد. مال لُبَد: كثير/ ماڵ و دارایی زۆر.
ابولُبَد. لُبَّد. اسد/ شێر.
لَبّاد: صانع اللبود/ كارگەچی.
لِبْدَة. لُبّادَة: قُبَّعَة من اللبد/ كڵاوی خوری، تەپلە، شەپقەی خوری.
— . — : معطف من اللبد/ فەرەنجی، كەرك.
— . — : سِترة من اللبد/ پەستەك، كلۆنجە، كوڵەباڵ.
لبس:
لَبَسَ عليه الأمرَ: اربكه و خَلَطَهُ/ سەری لێ تێك دا، شپرزەی كرد.
لَبِسَ الثوبَ: إرتداه/ لەبەری كرد.
— ثيابه: إرتداه/ خۆی (كۆری، پۆشتەكردەوە)، جلی لەبەركرد.
لَبَّس عليه الأمرَ: اربكه و خلطه/ سەری لێ تێك دا، شپرزەی كرد.
— : دَلَّسَ. غَشَّ/ فێڵی كرد، گزی كرد، ساختەی كرد.
— . البس: جعله يلبس/ كردیە بەری.
— . — : غَطّى/ دای پۆشی.
— . — : غَطّاه بطبقة من طلاء/ روكەشی كرد.
لابَسَ: خالط/ تێكەڵی كرد.
— : خالط و عاشَرَ/ تێكەڵیی لەگەڵ كرد.
تَلَبَّسَ بالأمر: إختلط به/ توش بو، لێی تێك چو، چەواشە بو.
— و التبس عليه الأمر: إختلط و إشتبه/ سەری لێ تێك چو، شلەژا، شپرزە بو.
إلْتَبَسَ الشیء بالشیء: إختلط/ گۆڕا، لێی‌گۆڕا، لێی‌تێك چو.
إلتباس. لَبْس. لَبْسَة: إبهام. غموض/ نادیاری، رون نەبون.
لِباس. لَبْس. لُبْس. لَبْسَة: زِيّ/ پۆشاك، بەرگ، شێوەی بەرگ.
لِبس. لَبْس. لُبْس: إرتداء/ لەبەركردن.

لباس: إختلاط/ سەر لىَتىَك چون، شپرزەى، شلەژان.
– التقوى: الحياء/ بەرگى ئاينى و بێ فيزى.
– المرأة: تحتانى/ ئاوەڵ كراس، دەرپێ، ساتان.
– الرجل: تحتانى/ دەرپێ.
– رسمى/ بەرگى رەسمى.
– السهرة/ جلى گەڕان، بەرگى گەڕان و رابواردن.
لبيس: ثياب: مُستَعملة. بالٍ/ كۆنە، جلەكۆن، لەبەركراو.
تلبيس. إلباس/ لەبەركردن.
– . – / تێهەڵكێش.
مَلبوس. لبيس: مستعمل/ كۆنە، بەكارهێنراو، لەبەركراو.
ملابِس. البسة. ثياب/ جل و بەرگ، پۆشاك.
– تحتانِيّة/ جل و بەرگى ژێرەوە، دەرپێ و ئاوەڵكراس و ژێر كراس و فانيلەو ئەتەك.
إلتباس: إبهام/ سەر لىَتىَك چون، شلەژان.
مُلتَبَس: مُبْهَم/ ناديار، رون نەبو، لێڵ، شێواو.
مُلتَبِساً بالأمر/ لەكاتى كاردا.
– بالجريمة/ لەكاتى تاواندا.
مُلَبَّس: لوز يُكسَّى بالسُكَّر/ نقوڵى (بادەمى، بادامى).
لبط:
لَبَطَ: صَرَعَ/ خستى، دايبەزەويدا، كوتاى بە زەويدا.
– . إلتبط برجله: رَفَسَهُ/ جوتەى (وەشاند، لىَدا)، لەقەى لىَدا.
تلبَّط: اضطجع و تمرّغ/ تلايەوە، گەوزا.
لبق:
– لَبِقَ: ظرف ولانت أخلاقه/ روخۆش بو، نيان بو، رەوشت و رەفتارى چاك بو.
– . – : حَذِقَ/ كارامەو وريا بو، زانا بو، تێگەيشتو بو.
– . – بە: لاقَ/ لێى هات، لەخۆى هات، بۆى بو.
لَبِقٌ لائق/ گونجاو، لەبار، بۆبو.
– . لبيق. ظريف/ روخۆش، نيان، ئێسك سوك.
– . – : حاذِق/ كارامە، وريا، تێگەيشتو، زمان پاراو.
لَبَق. لَباقَة: لياقَة/ لىَهاتويى، گونجاوى.
– . – : حذِق/ كارامەيى، وريايى، سەليقە.
لَباقَة: ظَرْف/ روخۆشى، نيانى، شۆخى.
– : حُسْنُ الذوق/ رەفتارى خۆش، دانايى، ژيرى.
لبك:
لَبَكَ. لَبَّكَ: خَلَطَ/ تێكەڵى كرد، (ئاوێتە، ئامێتە)ى كرد.
– . – : شَوَّشَ/ تێكى دا، شپرزەى كرد، شێواندى.
– . – : ربَّكَ/ شلەژانى.
لَبِكَ. إلتبك. تَلَبَّكَ: إختلط/ تێكەڵ بو، شلەقا، شلەژا، شێوا، ئاوێتە بو.
لَبْك. لَبْكَة. شيء مخلوط/ تێكەڵ، ئاوێتە ئامێتە.
– . – : إختلاط/ تێكەڵ بون، ئاوێتە بون.
مَلبوك. مُلْتَبِك: مُرْتَبِك. مضطرب/ شپرزە، تێكەڵ و پێكەڵ.
تَلَبُّك المعدة: سوء هضم/ ئاشك تێك چون، هەرس تێك چون.
لبن:
لَبَنَ: سَقاهُ اللَبَنَ/ شيرى دايە.
إلْتَبَنَ: رَضِعَ اللبنَ/ شيرى خوارد.
لَبَّنَ: ضرب أو صنع لِبْناً/ خشتى برى، خشتى دروست كرد.
لَبَن: حليب/ شير.
– رائب/ ماست.
– الخَضّ/ دۆ.
مَصل الـ – : شرش/ دۆوك، شيرێژ.
مسمار الـ – : لَبَأ/ ژەك.
سن الـ – : أول ظهور الأسنان/ دانى شيرى.
ابيض كالـ – / وەك شير وايە، وەك چۆرى شير سپىيە.
لون لبنى: بلون اللبن/ شيرى، رەنگ شيرى.
لَبون. لَبونَة. لَبِنَة. حلوب/ شيردەر، شيردار، دۆشەنى.
مَلْبَنَة: مصنع الالبان/ كارگەى شيرەمەنى.
لَبَنِيَّة: طعام من اللبن و الرز/ دۆ كولێو.
لِبان: رِضاع/ شير (خواردن، دان)، مەمك مژين.
هو اخوه بِلبان امه: اخوة في الرضاعة/ براى شيرييەتى.
لَبَني: كاللبن/ وەك شير.
– : مختص باللبن/ لە شيرزان، شيرەمەنى زان.
لِبْن. لَبِن: طوب نيِّ/ خشتى كاڵ.
لُبْنَة لُقْمَة/ پارلو.
لِبْنَة. طوبَة/ خشت.
لَبّان: بائع و صانع اللبن/ خشت بڕ، خشت فرۆش.
لُبانَة حاجَة/ پێويستى، ئيش.

قَضى – هُ: حاجَتَهُ/ ئیشی خۆی (راپەڕان، بەجێ هێنا، کرد).

لبو:

لَبْوَة: انثى الأسد/ دەڵەشێر.

لبی:

لَبّى: إستجاب/ وەڵامی دایەوە، بەهاوارەوە هات.

لَبَّيك: استجیب/ فەرمو، ئامادەم، پەیرەویت ئەکەم، سەرم لەڕێتە.

تَلْبِيَة: إستجابة/ وەڵام، بەهاوارەوە چون، بە دەنگەوە چون.

لت:

لَتَّ: سَحَقَ/ وردی کرد، هاڕی، کوتای.

– : بَلّ/ تەڕی کرد، ئاوی تێوەدا.

– :العَجينَ: عجنه/ شێلای، شلی کردەوە.

– : ثَرْثَر/ چەنەی دا، زۆری وت.

لَتّ: ثَرْثَرَة/ چەنە، چەنەبازی، زۆر وتن، زۆر بڵێیی.

لَتّات: ثرثار/ چەنەباز، زۆر بڵێ.

لتر: مکیال/ لیتر، ١٠٠٠ سم³

لتی:

الّتي: تانیث الذي/ کێ، ئەوەی.

اللتا. اللتان: التثنیه/ ئەوان، ئەوانەی کە دو کەس بن.

اللاتي. اللواتي: جمع التي/ ئەوان، ئەوانەی.

بعد اللّتَيا و اللتي: بعد الجدل و الخصام/ پاش چەن و چونێکی زۆر.

یا للتي هي احسن: وِدِّياً/ بەخۆشی، بێ قرە.

لث:

لَثَّ. لَثْلَثَ. تَلَثْلَثَ بالمکان: اقام/ گلی خواردەوە، مایەوە.

لَثْلَثَ. تَلَثْلَثَ في الامر: تَرَدَّدَ و ابطأ/ ڕاڕابو، کەمتەرخەمی کرد، خاوەخاوی کرد.

– . – في التراب: تَمَرَّغَ/ خۆی گەوزان.

لثلاث: بطيء في کل امر/ خاوەخلیچك، خاو، تەوەزەل.

لثغ:

لَثَغَ: کان بلسانه لَثْغَة/ زمانی پس بو.

الْثَغ: ثقیل اللسان/ زمان گران، لاڵ، زمان پس.

لُثْغَة لَثْغ: يَنطَق بعض الحروف بکشل غیر طبیعی/ زمان پسی.

– . – : ثُقل اللسان في الکلام/ زمان گرانی، لاڵی، لاڵە پەتەیی.

لثم:

لَثَم. لَثِمَ: قَبَّلَ/ ماچی کرد.

– . – . لَثَّمَ. تَلَثَّمَ. إلْتَثَمَ: شَدَّ اللثام علی انفه و فمه/ دەماخی (کرد، هەڵبەست).

لَثْمٌ: تقبیل/ ماچ کردن.

– : انف و ما حوله/ لوت، دەماخ.

لَثْمه: قُبله/ ماچ.

لِثام: ماکان علی الأنف و الفم من ثوب او نِقاب: بُرْقُع/ دەماخ بەست، پەچە.

إزاحَة الـ – : کشف الوجه: کشف السِتار/ رو دەرخستن، خۆ ئاشکرا کردن، پەچەلادان.

مُلَثَّم. مُتَلَثِّم: مُبَرْقَع/ دەماخ هەڵبەستراو، رو داپۆشراو.

لثی:

لَثی النباتُ: سال منه دَمُهُ او العُصارَة/ ئاووکی کرد، ئاووکی دەرکرد، شیلەی دەردا.

لثی: ما یسیل من النبات کالصَمغ/ ئاووکی روەك، شیلە.

لَثٍ: مُدبِّق/ لینج، شیلاوی.

لِثَّة الانسان: ما حول الاسنان من اللحم/ پوك.

لج:

لَجَّ في الخُصومَة: عَنَدَ/ لاسار بو، قیرسچمە بو، رقاوی بو.

– في الأمر: ثابَرَ علیه/ سور بو لەسەر، کوڵی نەدا.

– علی: أَلَحَّ/ هەتەر بو، لەسەری ڕۆی، پێی داگرت، ورکی گرت.

لاجَّ: خاصَمَ بِعِناد/ رقاوی بو، رقی گرت، توڕا، قینی گرت.

لَجوج. لاج: ملحاح/ هەتەر، خوازەڵۆك، زۆر لەسەرشت ئەڕوا، ورکن، ورکاوی.

– . –: مُثابِر/ سور، کوڵ نەدەر.

لَجَج: لَجاجَة: إلحاح/ هەتەری، لەسەر ڕۆین، سوربون، پێداگرتن.

لَجَّة: جَلَبَه: کثرة لاصوات/ دەنگەدەنگ، ژاوەژاو.

بَحْرٌ لُجاج او لَجي: مُضْطَرِب/ دەریای شێواو.

لُجّ. لُجَّة: مُعظَم الماء/ ئاوی زۆر، ئاو هەڵساو، لێشاو.

ل

لَجْلَجَ. تَلَجْلَجَ: تَلَعْثَمَ/ زمانی تێکەڵ و پێکەڵ بو، زمانی ئەیگرێ.
لَجْلَجَة: تَلَعْثُمْ. تَرَدُّد في الكلام/ زمان گرتن، زمان تێکەڵ و پێکەڵ بون.
لَجْلاج: ثقيل اللسان. يتردد في كلامه/ لاڵەپەتە، زمان قورس، ئەوەی زمانی ئەیگرێ.
لجأ:
لَجَأَ. لَجِيءَ. إلْتَجَأَ الى: إسْتَتَرَ و إعْتَصَمَ به/ پەنای بردەبەر، خۆی لا شاردەوە.
لَجَّأَ. ألْجَأَ: إضْطَرَّهُ و اكْرَهَهُ/ ناچاری کرد، زۆری لێکرد، پەنای پێ برد.
ألْجَأَ: عَصَمَ/ دالدەی دا، پاراستی، پەنای گرت.
— أمْرَهُ الى: أسنده/ کاری خۆی خستە پاڵ، خۆی پێ سپارد.
لُجوء. إلتجاء: إعتصام/ پەنابردن، پەناهێنان.
لاجيء: مُلْتَجيء: مُحْتَمٍ/ پەنابەر، پەنابردو.
مَلْجَأ: مَلاذ/ پەنا، پەناگە، پەرێز، مەلاسگە.
— الإيتام: مَيْتَم/ هەتیوگە، هەتیوخانە، خانەی هەتیوان.
لجب:
لَجَبَ البَحْرُ: هاج/ هەڵسا.
— القَوْم: هاجوا و اجْلَبُوا/ کردیان بە ژاوەژاو و دەنگە دەنگ و قرە.
لَجَبٌ: ضوضاء/ دەنگە دەنگ، ژاوەژاو، قرەقڕ.
لجم:
لَجَمَ: خاطَ/ دروی.
— . لَجَّمَ. ألْجَمَ الدابَّة: ألبس اللجام/ لغاوی کرد.
لجام الدابَّة: ما يُجْعَل في فم الدابَّة/ لغاو.
مُلْجِم. مَلْجوم/ لغاو کراو.
لجن:
لَجِنَ به: عَلَقَ/ پیا لکا، پێوەی نوسا.
لَجْنَة: جماعَة مُجْتَمِعَة/ لیژنە، ئەنجومەن، کومیتە.
لُجَيْن: فِضَّة/ زیو.
لح:
ألَحَّ في السؤال: واظب عليه/ لەسەری رۆی، سور بو.
— في المُطالَبَة: لم يَتَوَقَّف/ هەتەر بو، پێی داگرت، وڕکی گرت، زۆر لەسەری رۆی.
إلحاح. لَحاحَة: لَجاجَة/ هەتەری، زۆر لێکردن، پێداگرتن، وڕك گرتن، لەسەر رۆین، سور بون.
لَحوح، مُلِحّ. مِلْحاح: لَجوج/ هەتەر، سور، بەردەوام، وڕکن، وڕکاوی.
لَحّ: لاصق النَسَب/ پەیوەندی و کەسایەتی هەق و راست.
إبن عَمّ لَحًا/ ئامۆزای (هەق، راست) باوك برا.
لحد:
لَحَدَ. ألْحَدَ: دَفَنَ/ ناشتی، خستیە چاڵەوە.
— . — : حَفَر لحداً/ گۆڕی هەڵکەن.
— . — : إلتحد عن الدين: مال و حادَ/ لە ئاین لایدا، هەڵگەڕایەوە.
— . — : مال/ لایدا، سەری کرد، خواربو.
لَحْدٌ: قَبْر/ گۆڕ، گلکۆ.
لَحّاد: حَفّار القبور/ گۆڕهەڵکەن.
إلحاد: كُفر/ باوەڕ نەمان بەخواو ئاین، لەرێو ئاین لادان، گومڕایی.
مُلْحِد: كافر/ لە ئاین و خواپەرستی لاداو، بێباوەڕ، گومڕا، سۆتە، مارِس.
لحس:
لَحَسَ. لَحِسَ: اكل/ خواردی.
— . — : لَعِقَ/ لستیەوە.
لَحِس: لَعِقَ/ لستنەوە.
مَلْحوس. لَحِس/ لێسراو.
لحظ:
لَحَظَ: نَظَرَ/ سەیری کرد، تەماشای کرد، روانی، نواڕی.
— . لاحَظَ: راقَبَ/ چاودێری کرد، سەرپەرشتی کرد.
— . — : رَمَقَ/ چاوی تێ بڕی، تێی راما، لێی راما.
— . — : رأى/ بینی، دیتی.
— . — : راعى/ سەرپەرشتی کرد، پاراستی، ئاگاداری کرد.
لاحَظَ: قَدَّم مُلاحَظَة/ پێشنیاری دا، ئامۆژگاری‌یدا.
لَحْظَة: نَظْرَة/ سەرنجێك، چاو (تروكانێك، پیاخشانێك).
— : بُرْهَة قَصيرَة/ تاو، تاوێك، چاوتروكانێك، سات.
في — : في برهة/ لە چاو تروكانێكدا، لە ماوەیەكی كەمدا.
مُلاحَظَة: مُراقَبَة/ چاودێری، تێبینی، سەرپەرشتی.
— : إشراف/ سەرپەرشتی، رەچاوکردن.
— : تعليق/ لێدوان، راڤەکرد، گفت و گۆ.

— : مَلْحوظة. إنتقاد/ رەخنە.
مُلاحِظ: مُراقِب/ چاودێر، سەرکار، تێبین.
— العمل. عَرِيف/ سەرپەرشت، سەرکار، چاودێر.
لَحْظُ العَيْن: باطنها/ ناوچاو، ژێر پێڵو.
لاحِظَة (الجمع لواحِظ): عَيْن/ چاو.
لحف:
لَحَفَ. الْحَفَ: غطَّى/ دایپۆشی.
إلْتَحَفَ تَلْحَفَ: تَغطَّى/ خۆی داپۆشی، لێفەی دا بەخۆیدا.
الْحَفَ في الطلب: أصَرَّ/ هەتەر بو، لەسەری رۆی، داوای کردەوە.
لِحاف. مِلْحَف. مِلْحَفَة: غِطاء/ داپۆشەر، لێفە.
— . — : رِداء خارجي/ بەرگ، پۆشاك.
— السرير/ سەرجێگە.
لِحْف الجبل: أصله/ دامێنی شاخ، بناری شاخ.
لحق:
لَحِقَ فلاناً و به: أدركه/ پێی گەیی، گەیشتەسەری.
— القِطار: وصل قبل قيامه/ پیاگەیی، فریاکەوت.
— : ضد سَبَقَ: تَبِعَ/ شوێنی کەوت، دوای کەوت.
— ـهُ: لزمه: وَجَبَ عليه/ بو بە ماڵ بەسەریەوە.
— ـهُ: لصق به/ پێوەی نوسا، پیالکا.
— تهُ خَسارَة: خَسِرَ/ زیانی کرد، زیانی لێکەوت.
لاحَـقَ: تبـع/ شـوێنی کـەوت، دوای کـەوت، راوی نـا، نیشتەسەری.
— : تَتَبَّعَ/ کۆڵیەوە، بەدوایا گەڕا، پشکنی.
الْحَقَ كذا بكذا: أوصله/ پیاگەیاند، فریایخست.
— : اضافَ او ضَمَّ/ خستیە پاڵ، خستیە سەر.
— هُ: أدركه/ پێیگەیی، گەیشتەسەری.
إلتحق بهم: إنْضَمَّ اليهم/ چوە (پاڵیان، سەریان، لایان).
— به: أدركه/ پێیگەیی، گەیشت پێی.
— بكذا: إتَّصَلَ/ تێی چو، بوبە..
لاحـق. لَحْـق. لِحـاق: إدراك/ پێگەیـشتن، پیاگـەیین، گەیشتنەسەر.
لَحْق. لاحِق: ضـد سـابق/ دواکـەوتو، شـوێن کـەوتو، پاشەنگ.
إلحاق: وَصْل/ پیاگەیاندن.
— : ضَمّ/ خستنە پاڵ، خستنە سەر، تێچون، بون بە.
مُلْحَق: إضافي/ زیادە، هیتر، سەرەمەقست؟

— : مُضاف/ خراوە پاڵ، خراوە سەر.
— : تابِع/ پاشکۆ، سەربار، لەگەڵ.
مُلاحَقَة: مُتابَعَة/ راونـان، نیشتنەسەر، دواکەوتن، شـوێن کەوتن، کۆڵینەوە، پشکنین.
لحم:
لَحَمَ الأمْرَ: احْكَمَهُ/ توندی کرد، قـایمی کـرد، بنـج بەسـتی کرد.
— : الأمَّ/ پنجی کرد، لەحیمی کرد، پێکیەوە نوسان.
— . إلـتحم الجـرحُ: إلتَـأَمَ/ چـاك بـوەوە، سـارێژ بـوەوە، گۆشتەوزون بوەوە، دەمەکەی هاتەوە یەك، بزماتەی کرد.
لَحِمَ بالمكان: لَزِمَهُ/ بەجێگەکەوە نوسا، گلی خواردەوە.
— . لَحُمَ: كان كثير اللحم/ گۆشتن بو، قەڵەو بو.
لُحِمَ: قُتِلَ/ کوژرا.
لاحَمَ: الْحَمَ: الْصَقَ/ پێوەی نوسان، پیالکان، پنچی کرد.
تلاحَـمَ القَـوْمُ: تقـاتَلوا/ دەسـتیان دایـە یەخـەی یـەکتر، بەرەنگاری یەك بونەوە، یەکتریان کوشت.
— . إلْتَحَمَ به: إلتصق/ پیانوسا، پیالکا، پێوەی نوسا.
— . — الشيئان: تلاءَما/ لەحیم بون، پـنج بـون، یەکیان گرت، پێکەوە نوسان.
إلتحمـت الحـرب بيـنهم: نَـشَبَت/ دەسـتەو یەخـە بـون، جەنگ هەڵگیرسا.
لَحْم. لِحام المعـادن: لأم/ لـەحیم، پێکـەوە نوسـان، پـنج کردن.
لِحام. مـايُلْحَمْ بـه المعـدن/ لـەحیم، قـەلایی، کەرەسـتەی لەحیم.
— ذاتـي: بـدون إسـتعمال مـواد/ یـەك گـرتن، پێکـەوە نوسان، سارێژ بونەوە.
إلتحام: إلتـصاق/ پێکەوە نوسـان، یـەك گرتنـەوە، جۆش خواردن.
— الجراح: إلتئـام/ گۆشتەوزون (بونـەوە، هێنـان)، سارێژبونەوە.
— العظام/ یەك گرتنەوە، چاك بونەوە.
مَلْحَمَة: مَوقِعَة في الحـرب/ کوشتاری زۆر، دەستەویەخە، تێك رژان.
لَحْم: خلاف العظم من الجسم/ گۆشت.
— ابيض/ گۆشتی سپی، مریشك و ماسی.

ل

لَحِم:. لحيم: كثير اللحم/ گۆشتن، قەڵەو، تێکسمڕاو، شیشمان، کەتە.
لَحْمَة: قطعة لحم/ پلەگۆشت، کوتەگۆشت.
— : لَحْمَة النسيج/ پو، تان، تان و پۆ.
لَحامَة: إمتلاء الجسم/ گۆشتنی، قەڵەوی، تێك سمڕاوی.
لَحّام: بائع اللحم/ گۆشت فرۆش.
لحن:
لَحَنَ: اخطأ في الاعراب/ هەڵەی ڕێزمانی کرد.
— له: لَمَحَ/ ئاماژەی کرد، پەرلەی لەگەڵ کرد، هێمای بۆ کرد.
— . لَحِنَ الكلام: فَهِمَهُ/ تێی گەیی.
لَحَّنَ في القراءة: تَرَنَّم فيها/ بە ئاوازەوە خوێندیەوە.
— الأناشيد: وضع لها الحاناً/ ئاوازی بۆ دانا.
لَحْن: نَغْمَة/ ئاواز، تەرانە.
— : قطعة موسيقية/ پارچەیەك موسیقا، ئاوازێکی مۆسیقا.
— : خطأ في الإعراب/ هەڵەی ڕێزمان، هەڵەکردن لە ڕێزمانا.
— الكلام: فَحْواه/ ناوەڕۆك.
تَلْحين: تَنْغيم/ ئاواز دانان.
مُلَحِّن: الذي يَضَع اللحن/ ئاوازدانەر، دانەری ئاواز.
لَحَن: فِطْنَة/ زیرەکی، زرنگی، وریایی، زیتی، زرتی.
لَحِن: فَطِن/ زیرەك، زرنگ، وریا، زیت، زرت.
لحي:
لحا. لَحى الشجرة: نزع قشرها/ توێکڵەکەی (داماڵی، لێکردەوە)، پاکی کرد.
— . — : سَبَّ. شَتَم/ جنێوی دا.
إلْتَحى العود: قَشَرَهُ/ توێکڵەکەی داماڵی، پاکی کرد.
— : ارخ لِحْيَتَهُ/ ریشی (هێشتەوە، بەردایەوە، درێژ بو، هات).
لحاء: قشر العود و الشَجَر/ توێکڵی دار.
— : قِشر/ پۆس، پێست.
لَحوُ. لَحْي: شَتْم/ جنێو، جوێن، جمێن.
لِحْيَة: شعر الخدين و الذقن/ ریش.
— التيس: نبات/ شنگ.
لِحْياني. الحى: طويل اللحية/ ریش (درێژ، دار).
مُلْتَحٍ: ذو لحية/ ریش دار، ریشن.

لخص:
لَخَّص الكلام: إختصره/ لە کورتی برانیەوە.
— الموضوع: إختصره/ کورتی کردەوە.
— الشيء: اخذ خلاصته/ پوختەکەی وەرگرت.
تلخيص: إختصار/ کورت کردنەوە.
مُلَخَّص: مُخْتَصَر/ کورتە، کورت کراوە، بەکورتی.
— : خُلاصَة/ پوخت، پوختە.
لد:
لَدَّ. لادَّ: خاصَمَ بِشِدَّة/ (دژمنایەتی، دژێتی) لەگەڵ کرد.
لَدَّدَ: حَيَّرَ/ سەرسامی کرد، سەری سوڕمان، شڵەژان.
— به: شهر عيُوبَهُ/ جاڕی لێدا، ناوی زڕان، ئابڕوی برد.
لَدَد: خُصومَة شديدة/ دوژمنایەتی، ناحەزی، دژایەتی زۆر.
لدود: لديد. ألَدّ: خصم شديد الخُصومَة/ دوژمن، ناحەزی خراپ، دژ.
عَدوّ — و — و — / دوژمنی خوێنەخوێ.
لدغ:
لَدَغَ: عَضَّ/ گەستی.
— : لَسَعَ/ پێوەی دا، پیاچزا.
— هُ بكلمة: طَعَنَهُ بها/ سەرزەنشتی کرد، بە قسە جەرگ بری کرد.
لَدْغَة: عَضَّة او لَسْعَة/ گەستن، پێوەدان، پیاچزان.
لديغ. مَلدوغ: ملسوع/ گەستراو، پێوەدراو.
لُدّاغ: إبرة. شوكة/ چزو، نوك.
لدم:
لَدَم: لَطَمَ/ لێی دا، پیاکێشا، تێی سرەوان.
لدن:
لَدُنَ: كان لَيِّناً/ نەرم بو، شل بو، خاو بو.
لَدَّن: لَيَّنَ/ نەرمی کرد، شلی کرد، خاوی کردەوە.
لَدْن: لَيِّن/ نەرم، نەرم و شل، خاو.
لَدانة. لُدُنَة: ليونَة/ نەرمی، نەرم و شلی، خاوی.
لدائن: مواد لَيِّنَة/ نەرمەمەنی، نەرمۆکە، نەرمینە.
لَدْن الخليقة: لَيِّن الطبيعَة/ لەسەرخۆ، ئاغر.
لَدَن. لَدُن. لَدِن. لَدْن. لُدْن: عند/ لەلای لەتەنیشت، لەتەك، نزیك، لەگەڵ.
لدى:
لَدى: عند/ لەلای، لەگەڵ، لای، بەلای، لەتەك.

— : امام/ له پێش دەم، لەبەردەم.

لذ:

لَذّ: كان لذيذاً/ خۆش بو، بەلەزەت بو، بەچێژ بو.

لَذَّذ: جَعَلَهُ يَتَلَذَّذ او يَلتَذّ/ خۆشی كرد، بەلەزەتی كرد، بەچێژی كرد.

إلْتَذَّ. تَلَذَّذ به. إستَلَذَّ: وَجَدَهُ لذيذاً/ لای خۆش بو، بەچێژ بو، پێی خۆش بو.

لَذّة. مَلَذّة: سرور/ خۆشی، شادی.

لَذّ. لَذيذ: شَهِّي. سار. مُفرِح/ خۆش، بەلەزەت، دڵخۆشكەر، بەچێژ، بەتام.

مَلَذّ. مَلاذ: موضع اللذّة/ شوێنی خۆشی و رابواردن.

مَلَذّة. مَلَذّات: الشهوة/ خۆشی، رابواردن، خۆشی گەیێن.

لذع:

لَذَعَ: احْرَقَ/ سوتانی.

— : كوى. وَسَمَ/ داخی كرد.

— بلسانه: اوجعه بكلام/ دڵی ئێشان، قسەی پێوت، بە قسە رەنجانی.

— لسانه: كوى/ زمانی پیاچزا.

لَذع: حَرق/ سوتان، سوتانن، سوتاوی، داخ كردن.

لَذّاع. لاذع: مُحْرِق. حار/ سوتێنەر، داخ.

— . — : حاد. قارس/ تیژ، تون، زمان ئەسوتێنێ، كەسكون.

لوذع. لوذعي: ذكي/ زیرەك، زرنگ، بلیمەت.

لوذعية: ذكاء/ زیرەكی، زرنگی، بلیمەتی.

لذي:

لَذِيَ به: عَلِقَ. لَزِمَهُ و لم يُفارِقْهُ/ پێوەی نوسا، هۆگری بو، لێی (جیانەبوەوە، نەبوەوە).

الّذي: اسم موصول/ ئەوەی، ئەوكەسەی، ئەوی

اللذان (للمثنى)/ ئەوان، ئەوانەی.

الّذين (للجمع)/ ئەوان، ئەوانەی، ئەو كەسانەی.

لز:

لَزَّ الشيء بالشيء: شَدَّهُ و ألصقهُ به/ بە یەكەوە (نوسان، لكان).

لَزَّ الشيءَ بالشيءَ: لصق به/ پێوەی نوسا، پیالكا، بەیەكەوە نوسان.

— هُ بالرمح: طعنه/ پیاكرد، پیاچەقان.

— هُ الى كذا: إضطره/ توشی كرد، ناچاری كرد، كردی بە كوڵكیەوە، تێوەی گلان.

التَزَّ: إلْتَصَقَ/ پیانوسا، لكا.

ملزوز: متماسك/ سفت.

لزب:

لَزَبَ: إشتَدَّ و ثَبَتَ/ جێگیر بو، بەند بو.

— به: لصق به/ پێوەی نوسا، پیالكا.

لَزُبَ الشيء: دخل بعضه في بعض/ چو بە ناویەكدا، یەكی گرت، بەیەكا چو.

لازِب: ثابِت/ جێگیر، پتەو، فیت، پڕبە پڕ.

لَزِب: قليل/ كەم، تۆز، نەخت.

لزج:

لَزِجَ. تَلَزَّجَ: كان لَزِجاً/ لینج بو.

— باصبعه: لصق: عَلِقَ/ پیانوسا، بە پەنجەیەوە مایەوە، پێوەی لكا.

لَزِج: دَبِق/ لینج.

لُزوجة: تَدَبُّق/ لینجی.

لزق:

لَزِقَ . إلتزق به: لَصِقَ/ پێوەی نوسا، پیالكا.

لَزَّقَ. الزق: الصَقَ/ پێوەی نوسان، پیالكان.

لَزِق: لصق/ پیانەنوسێ، لێی نابێتەوە.

لَزِق: لصيق/ پێوەی ئەنوسێ، ئەلكێ، لینج.

لِزاق: كل ما يُلْصَقُ به/ مێلم، لكێنەر، پیانوس، كەتیرەو سرێش و جەوی.

لزقه علاجيَّة. لزوق. لازوق/ موشەمای ئازار.

لزم:

لَزِمَ الشيء: لابُدَّ منه/ پێویستە، چار نیە، ئەبێ ببێ.

— بَيْتَهُ: لم يُفارِقه/ ماڵەكەی بەجێ نەهێشت، مایەوە لە ماڵ.

— المريضُ الفراش: بَقي فيه/ لە جێگەدا مایەوە، هەڵنەسا.

— الصمتُ: لم يتكلم/ بێدەنگ بو، هیچی نەوت قسەی نەكرد، تقەی لێوە نەهات.

— هُ كذا: إحتاج اليه/ پێویستی پێ بو، ویستی.

— هُ الشيءُ: ـهُ الأمرُ: وَجَبَ عليه/ بو بە كوڵكیەوە، چوەملی، بو بە ماڵ بەسەریەوە.

— . لازَم: لم يُفارِقهُ/ لێی جیانەبوەوە، پێوەی نوسا.

- . - : رافِقَ/ لەگەڵی بو، لێی نەبوەوە.
- . - الأمرَ: إستمر فيه/ دەستی لێ هەڵ نەگرت، لەسەری رۆی، بەردەوام بو.
- . - المشروع: تَعَهَّدَهُ/ گرتی، پەیمان بەستی بو.
الزَمَ: اجْبَرَ/ زۆری کرد، ناچاری کرد.
- ـهُ بكذا: جعله لزماً عليه/ بەستیەوە، کردیە ملی.
- بالعمل: اوجبه عليه/ کردی بە کولکیەوە.
إلتزم: إضْطَرَّ/ ناچار بو.
- : إرتبط/ بەسترایەوە، پەیوەندبو، خۆی بەستەوە.
- العمل: اخذه على عهدته/ گرتیە ئەستۆی، گرتی بەڵێنی دا، چوە ژێری.
- العمل و التجارة: إحْتَكَرَ/ دەستی بە سەراگرت.
إستلزم: عَدَّه لازماً/ بە پێویستی زانی.
- : إقتضى. تَطَلَّبَ/ وا پێویست بو، ئەبوایە، چار نەبو.
لُزوم: إقتضاء/ پێویستی، ناچاری.
- : فائدة. حاجَة/ کەلك، سود، مەبەست، پێویستی.
لازم: ضروری/ پێویستە، ئەبێ.
- : يحتاج اليه/ ئەیەوێت.
- : مُحَتَّم/ ناچاری، ئەبێ ببێ، چار نیە.
- : واجب/ زۆرەملی.
- : ضد مُتَعَدٍ/ پەیوەست، تێنەپەڕ.
فعل - : غير مُتَعَدٍّ/ فرمانی تێ نەپەڕ.
شيء - : ضَرورَة/ شتی پێویست.
غير - : يُستغنى عنه/ پێویست نیە.
إلزام: إجبار/ سەپاندن، دەستەبەر بون، ناچارکردن، زۆرلێکردن، تەوزیم.
إلزامي: إجباري/ ناچاری، بەزۆر، زۆرمله، زۆردارەکی.
إلتزام: إضطرار/ ناچاری، ناچاربون، زۆرەملی، دەستەبەری، رابەستەبون.
- : إحتكار/ دەست بەسەراگراتن.
- : واجب/ پێویستی، دەربەست بون.
- : مسئولِيَّة/ بەرپرسیاری، لێپرسینەوە، خۆبەستنەوە، گرتنەئەستۆ.
- : إرتباط/ پەیوەندی، پەیوەستی، بەستنەوە، لایەن گرتن.
لَوازِم: حاجيات/ پێویستی، کەرەستە، تفاق.

مستلزمات: حاجيات/ پێویستی، پەیداویست.
مُلازم: لايُفارِق/ جیانابێتەوە، بەجێی ناهێڵێ.
- : تابع/ پاشکۆ، لەگەڵ.
- بيته: لايُفارِقه/ دانیشتوی ماڵ، دەرناچێ، لەماڵ دەرناچێ.
- الصَمْت: لايتكلم/ بێدەنگ، قسەناکا، نقەی لێوەنایەت.
- الفراش: لايزال مريضاً/ کەوتو، کەوتو لە جێگەدا.
- : رتبه عسكرية/ ئەفسەر.
مُلازَمَة: تَعَلُّق. إرتباط/ پەیوەندی، پەیوەستی، پەیوەندیتی.
- : عدم مُفارَقَة/ جیانەبونەوە، بەجێنەهێشتن، لێنەبونەوە.
- : مُتابَعَة/ شوێن کەوتن.
- : مُثابَرَة/ کۆڵ نەدان، بەردەوامی.
مُلْتَزَم. مَلْزوم: مُضْطَرّ/ ناچار، زۆر لێکراو، رابەستە.
- . - : مسئول/ لێپرسراو، بەرپرس، خۆبەست، دەربەست.
مُلْتَزِم: مُقاوِل/ بەڵێندەر.
- : صاحِب إلتزام/ بەڵێن راست، راستگۆ، هەتەر، خۆبەست.
مُلْزَم؟ مُجْبَر/ ناچار.
مَلْزوميَّة. إلتزام: مسئوليَّة/ لێپرسراوی، بەرپرسیاری.
مَلْزَمَة: مَنْكَنَة/ گیرە، مەنگەنە.
- من كتاب: جزء/ بەند، بەش.
لسع:
لَسَعَ: لَدَغَ/ پێوەی دا، گەستی، پیاچزا.
- ـهُ بلسانه: عابَهُ و آذاه بالكلام/ سەرزەنشتی کرد، عەیبی لێ دەرهێنا، قسەی پێ وت.
- فمه بالفلفل: لَذَعَ/ زمانی (سوتا، چوزایەوە).
لَسْعَة: قَرصَة/ پێوەدان، گەستن.
لَسيع. مَلسوع: مَلدوغ/ پێوەدراو، ماران گەستو.
لاسع. يَلْسَع: لاذع/ پێوەئەدا، ئەگەزێ.
- . - : حارّ/ گەرم، زمان ئەسوتێنێ، ئەچورزێنێتەوە.
لسن:

لَسَنَ فلاناً: ذكره بالسوء/ ناوی بەخراپ هێنا، زەمی کرد، قسەی پێ وت.

– لَسَّنَ: حَدَّدَ الطرف/ تیژی کرد، نوکەکەی تیژ کرد، دایدا.

لَسَّن علیه: تهكَّمَ/ گاڵتەو لاقرتی پێ کرد.

تَلَسَّن علیه: كَذَبَ و إفترى/ درۆی کرد و بۆی هەڵبەست.

لَسِنٌ. ألسَن: فصيحٌ/ زمان (پاراو، ران، تەڕ).

لَسَن: فصاحَةٌ/ زمان (پاراوی، رانی).

لِسان: آلَةُ النُّطْقِ/ زمان، زبان.

– : لُغَةٌ/ زمان.

– ارض: ارض داخلة فی البحر/ (نیمچە، نیوە) دورگە، زمانە زەوی، ورگ.

– بَحْر: بَحْر داخل فی الارض/ کەنداو، ئاوکەند.

– الحال: مادلّ علی حالَة الشيء/ چۆنیەتی، شێوەی چۆنیەتی.

– القوم: المُتَكلِّم عنهم/ دەم راست.

– الحِذاء/ زمانە پێلاو.

– النار: شعلتها/ کلّپەو گڕی ئاگر.

– الثور: نبات من الاعشاب/ مزمزۆك، بن گزروان.

– (الجمل، الكلب، السبع، العصافير، الغزال، الفرس) اسماء نباتات.

بذيء الـ – / دەم (شڕ، بۆگەن، پیس، وەڕ، دڕێن)، جنێو فرۆش.

زلق الـ – / دەم (تەڕ، شیرین)، زمان لوس.

طلق الـ – : فصيح. بليغ. كثير الكلام/ دەم (پاراو، ران)، زۆربلێ.

طلاقة الـ – / دەم (پاراوی، رانی)ـ قسەزانی، زۆربلێیی.

مَعقود الـ – : مَشدود الـ – / دەم بەستراو، بێدەنگ.

مَسك – هُ: صَمَتَ/ بێدەنگ بو، هیچی نەوت، زمانی خۆی گرت.

بالـ – : بالكلام/ هەر بەدەم، بەقسە.

ذو لسانين: مُخادِع/ دوزمان، دوڕو.

الدائر على الألسُن: تقولات. إشاعة/ قاو، ئەڵێن.

مَلسون: كَذّاب/ درۆزن.

– : حُلو اللسان/ قسەخۆش.

لشو:

لاشى: اباد. اعدم/ وێرانی کرد، فەوتانی، لەناوی برد، نەیهێشت.

تَلاشَى: باد/ نەما، وێران بو، فەوتا، لەناوچو، ون بو.

– الصوت: هَمَدَ/ بێدەنگ بو، کپ بو.

– فی كذا: إضمَحَلَّ/ لەناویا توایەوە، پوکایەوە.

لا يتلاشى: لا يَنعَدِم/ نافەوتێ، لەناو ناچێ، هەر ئەمێنێ.

تَلاشي. مُلاشاة: إضمحلال/ نەمان، فەوتان، پوکانەوە، لەناو چون.

مُتلاشي. مُضمَحِل/ نەماو، فەوتاو، پوکاوە.

لص:

لَصَّ الأمْرَ: فَعَلَهُ مُستَتِراً/ بەدزیەوەو بەنهێنی کردی.

– الشيءَ: سَرَقَهُ/ دزی.

تَلَصَّصَ: صار لِصّاً/ بو بە دز، دزی کرد، دزە دزەی کرد.

لَصَّصَ البُنيان: رَصَّصَهُ/ پتەوی کرد، قایمی کرد.

لَصّ. لِصّ. لُصّ: سارق. حَرامي/ دز، جەردە.

– . – . – البحر: قرصان/ جەردەی دەریا.

لُصوصِيَّة: سَرِقَة/ راووروت، دزی، جەردەیی، تاڵان کردن.

لصف:

لَصَفَ: بَرَقَ و تَلألأ/ شەوقی دایەوە، بریسکایەوە، تیشکی دایەوە.

لَصَف: بريق و لألأة مُلَوَّنَة/ شەوق و بریسکانەوە.

لاصِف: بَرّاق. متلألیء. مُشِعّ/ شەوقدار، تیشك دار.

لصق:

لَصِقَ. إلتَصَقَ بە: لَزِقَ و إلتَزَقَ/ پێوەی نوسا، پیا (نوسا، لکا).

ألصَقَ الشيءَ بالشيء: ألزَمَهُ بە/ پێوەی نوسان، بەیەکیەوە نوسان، پیالکان.

لصق: لازِق/ لکێنەر، نوسێنەر.

لَصوق: لِزقَة علاجِيَة/ موشەمای ئازار.

إلتصاق. تلاصُق: تماسُك/ پێکەوە نوسان، یەك گرتن، لکان، پێوەلکان، پیالکان.

مُلصَق. مُلتَصِق/ پێوەنوساو، پیاهەڵواسراو، پێوەلکاو.

لِصق. لَصيق: بالقرب من/ نزیك، لەنزیك.

مُلاصِق. متلاصِق: مُتاخِم. مجاوِر/ لە تەنیشت، پێوەنوساو، لەپاڵ.

مُلاصَقَة: مُجاوَرَة/ دراوسێتی، نزیکی، هاوسێیی.

لَصَّيق. حشيشة القُراض/ گیاگەزنە.

ل

لضم:

لضم الإبرة: ادخل فيها الخيط/ پێوەی کرد، دەزوی کرد بە دەرزیەوە، دەرزی پێوە کرد.

– السبْحَةَ: نظمها/ هۆنیەوە، کردی بە پەتەوە، تەزبێحەکەی هۆنیەوە.

ملضوم: منظوم/ هۆنراوە، پێوەکراو.

لطخ:

لَطَخَ. لَطَّخَ. لَوَّثَ/ پیسی کرد، بۆیاوی کرد، لەکەداری کرد، پەلاوی کرد.

تَلَطَّخَ: تَلَوَّثَ/ تێوەی چو، پیس بو، بۆیاوی بو، لەکەی گرت.

– بامر قبیح: تَدَنَّسَ/ ئابروی چو، لەکەدار بو، ناوی زڕا.

لُطْخَة: بُقْعَة/ پەڵە، لەکە، پیسی.

لَطِخٌ. مُلَطَّخٌ: مُلَوَّثٌ/ پیس، لەکاوی، پەڵەدار.

لُطْخَة. لَطِخٌ: احمق/ گێل، کەر، گەمژە، کەودەن، بلح.

لطس:

لَطَسَ. لَطَمَ. ضَرَبَ/ لێی دا، پیاکێشا، تێی سرەوان.

مِلطاس: کاسور/ پێك، چەکوشی گەورە.

لطع:

لَطَعَ. لَطِعَ. لَحَسَ/ لستیەوە، زمانی پیاهێنا.

– : لَطَمَ/ لێیدا.

– : مَحا/ سریەوە، کوژاندیەوە.

لَطّاع: یَلْحَسُ/ لێسەرەوە، ئەوەی کە پەنجەی ئەلێسێتەوە.

لطف:

لَطَفَ بە: رَفَقَ/ بەزەیی پیاهاتەوە، میهرەبان بو لەگەڵی.

لَطُفَ: ضد كَثُفَ/ خاویوەوە.

– : کان لطیفاً/ (روخۆش، رەفتارخۆش، هێمن، نیان، میهرەبان) بو.

– کلامە: رَقَّ/ قسەی خۆش بو.

لَطَّفَ: خَفَّفَ الشِدَّةَ/ (هێواش، نەرم، کەم، خاو)ی کردەوە.

– الألم: خَفَّفَهُ/ ئازارەکەی (شکان، کەم کردەوە).

– وَقْعَ الخَبَرَ السَّیِّء/ دڵخۆشی دایەوە.

– الحکمَ: خَفَّفَهُ/ کەمی کردەوە، دایشکان.

لاطَفَ: رَفِقَ بە/ بەزەیی پیاهاتەوە، میهرەبانی لەگەڵ کرد.

– ـهُ: سایَرَهُ/ روخۆش بو لەگەڵی، بردی بەڕێوە.

– ـهُ: دَلَّلَهُ/ نازی دایە، دڵنەوایی کرد، نەوازشتی کرد.

تَلَطَّفَ. تلاطَفَ: تَرَفَّقَ/ بە بەزەیی بو، میهرەبان بو.

إستلطفه: وجده لطیفاً/ بەروخۆشی بینی.

لُطف. لَطافَة: رِفق/ بەزەیی، میهرەبانی، دڵسۆزی.

– . – : رِقَّه. لین/ نیانی، نەرم و نیانی، نەرمی.

– . – : رشاقة. ظَرافَة/ شۆخی، جوان پۆشی، شەنگی.

– الله: فضل و کرم الله/ بەزەیی و میهرەبانی خوا.

لطافة: رِقَّه/ خاوی، هێمنی، نەرمی.

بِلُطف: بِرِقَّة/ بەنەرمی، بە نەرم و نیانی، بە روخۆشی.

لطیف: ذو اللطف او اللطافة/ روخۆش، قسەخۆش، پیاوچاك.

– : ذو الرفق/ بە بەزەیی، میهرەبان.

– : ظریف. ملیح/ ناسك، شۆخ، جوان پۆش.

– : رقیق/ خاو، نەرم، هێمن.

الجنس الـ – / ئافرەت.

لطیفه: مُلْحَة/ نوکتە، قسەی خۆش، بۆ پێکەنین.

تَلَطُّف: شَفَقَة/ بەزەیی، میهرەبانی.

مُلَطِّف: مُخَفِّف/ خاوکەرەوە، نەرم کەرەوە.

– : مُسَکِّن/ هێمن کەرەوە، هێواش کەرەوە.

مُلاطَفَة: مجامَلَة/ گاڵتە لەگەڵ کردن، نەوازشت، لاواندنەوە، قسەی خۆش لەگەڵ کردن.

لطم:

لَطَمَ. صَفَعَ. لَدَمَ/ پیاکێشا، زللەی (پیاکێشا، لێدا) تێی سرەوان.

– ت النساء فی المأتم: إلتدمت/ (شین، شیوەن، شەپۆڕ، شین و شەپوریان) کرد، روی خۆیان رنیەوە، کێشایان بە رومەتی خۆیاندا.

تلاطمت و التطمت الأمواج. ضرب بعضها بعضاً/ شەپۆلەکان دایان بە یەکتریدا.

تلاطموا. لطم بعضهم بعضاً: تضاربوا/ کێشایان بە یەکتردا.

لَطْمَة: صفعَة/ زللە، شەپازللە، شەقازللە.

لطیم: یتیم الأب و الأم/ هەتیو، بێدایك و باوك.

مَلْطَم: خَدّ/ گونا، رومەت.

لظی:

لَظِيَ. تَلَظَّى. إِلْتَظَى: إلتهب/ گڕی گرت، کڵپەی سەند.
لَظَى: لَهَب. نار/ کڵپە، ئاگر، گڕ.
لع:
لَعْلَعَ الرَّعْدُ: صَوَّتَ/ گرمەی هەور هات، هەور گرمانی.
– الصوت: دَوّى/ دەنگی دایەوە.
– . تلعلع السراب: تَلألأ/ تراویلکە (بریسکایەوە، دەرکەوت، بینرا، دیار بو).
– جوعاً: تضور و إضطرب/ لە برسانا گێنگڵەی دا.
لَعْلَعْ: سراب/ تراویلکە.
لعب:
لَعَبَ. لَعِبَ: سال لُعابه/ دەمی (لیکی کرد، ئاوی کرد)، لیکی پیا هاتە خوارێ.
لَعِبَ. لَعَّبَ: لها. عَبِثَ/ یاری کرد، گەمەی کرد، وازی کرد.
– : هَزَلَ. مَزَحَ/ گاڵتەی کرد.
– القمار/ قوماری کرد، یاری کرد.
– الموسيقى: عَزَفَ/ موسیقای ژەن.
– عليه: إحتال أو مزح عليه/ گاڵتەی پێکرد، پێی رابوارد، دەستی بڕی.
– به: إتَّخَذَهُ لُعْبَه/ یاری پێ کرد، کردی بە یاری بەدەستیەوە.
– في الأمر: إستَخَفَّ به/ گاڵتەی پێهات، سوکی زانی.
– في الأمر: تَدَخَّلَ فيه/ دەستی تێخست.
– في السيف: ثاقَفَ/ شیربازی کرد.
– بالنار: خاطَرَ/ خۆی خستە مەترسیە، یاری بەئاگر کرد.
– دور كذا: مَثَّلَهُ/ خۆی کرد بە ئەو، ئەو دەورەی بینی.
– بعقله غَشَّهُ/ یاری بە ئەقڵی کرد، گزی لێ کرد، فێڵی لێ کرد، گاڵتەی پێکرد.
– ت الخمر بعقله: سَكِرَ/ سەرخۆش بو.
– ت به الرياح: تسلطت/ با (شڕی کرد، شەکانیەوە).
لاعَبَهُ: لَعِبَ معه/ یاری و گەمەی لەگەڵ کرد.
لَعَّبَ. ألعَبَ: جعله يَلْعَب/ هێنایە گەمە، خستیە یاری، یاری (لەگەڵ کرد، پێکرد)، وای لێکرد یاری بکا.
– ذَيْلَهُ: حَرَّكَهُ/ کلکی (لەقان، رایوەشان).
– وجهه إشمئزازاً: إختلج بوجهه/ روی گرژ کرد، لچی هەڵ قورچان، ناوچەوانی دا بەیەکدا.

– ـهُ على اصابعه/ بە پەنجە هەڵی سوڕان و یاری پێ کرد.
تَلاعَبَ. تَلَعَّبَ. لَعِبَ/ یاری کرد، گەمەی کرد، وازی کرد.
– في الأمر: إحتال/ دەستی تێخست، فێڵی کرد، گزی کرد، دەستی خستە کارەکەوە.
لُعاب: رِيق/ لیك، كەفی دەم.
– : بصاق. تفال/ تف.
– النحل: عَسَل/ هەنگوین.
– الحَيَّة: سمها/ ژاری مار.
– الشمس: مخاط الشيطان/ تەنافی شەیتان.
لُعابي: كاللعاب أو بقوامه. لَزِج/ لینج.
مَلعوب: سائلٌ لعابه/ لیکاوی، لیکن، لیکی پیاهاتە خوارێ.
– : خُدعَة/ فێڵ، گزی، ساختە.
لَعْب. لِعْب. لَعِبَ: لَهو/ یاری، گەمە، وەرزش، وازی.
– . – . – : مَزَح/ گاڵتە، رابواردن.
– . – السيف: مبارَزَة/ شەڕەشیر، شیربازی.
– . – القمار: مَيْسَر/ قومارکردن.
العاب رياضيَّة/ وەرزش.
– سحرية/ جادو، جادوگەری.
– ناريَّة/ فیشەکە شێتە.
لُعْبَة. أُلْعوبَة: ما يُلْعَب به/ یاری، بوکەشوشە، بوکە سەماکەرە، شت و مەکی یاری.
– . – : ما يُسْخَر به/ پێرابواردن، رابواردن، پێی رائەبوێرێ.
– . لِعْبَة: نوع اللعب/ جۆری گەمەو یاری.
– . – ورق/ قومار، یاری کاخەز، کاخەزێن.
لَعوب. ألْعُبان. لِعْبي: مُحِبّ اللهو و المزاح/ فێڵباز، تەڵەکەباز، گزیکەر، قۆشمە.
صَبِيَّة – / قۆشمە، کچی (فێڵباز، زۆرزان، دەست بڕ، چەتون).
لَعّاب. لُعَيب. لُعَبَه: كثير اللعب و المزاح/ گەمەکەر، گاڵتەچی، قۆشمە، یاریکەر، ئەو کەسەی هەموشت بە گاڵتە ئەگرێ و جێی باوەڕ نامێنێ.
لاعِب: الذي يَلْعَب/ یاریکەر.
مَلْعَب: ساحَة اللعب/ یاریگە، شوێن گەمەو رابواردن.
– : ساحة الألعاب الرياضيَّة/ ستاد، یاریگە.

- الخيل/ مەیانی غارغارێن، شوێنی رمبازی، سێرك.
تلاعُب: مُخادَعَة/ فێل و گزی، دەست تێ خستن.
مَلْعَبَة. اُلعوبَة/ گەمە، پێرابواردن، فێڵ.
مُلاعِب: مُخادِع/ فێل باز، تەڵەکەباز، دەست بڕ، ساختەچی.
لعث:
لَعِثَ: کان ثقیلاً بطیئاً/ خاوە خاوی کرد، خاوو خلیچك بو.
العث: ثقیل بطيء/ خاوو خلیچك.
لَعثَم. تَلَعْثَمَ: تَلَجْلَجَ/ زمانی (تێکەڵ و پێکەڵ بو، تێك ئالاَ)، منجەمنجی کرد.
لَعثَمة. تَلَعْثُم: لَجلَجَة/ زمان تێکەڵ و پێکەڵ بون، تێك ئالان، منجە منج.
لعج:
لَعَجَ. آلَمَ و احْرَقَ/ ئازاری دا، ئێشی گەیان، سوتانیەوە.
لا عَجَهُ الأمر: إشْتَدَّ علیه/ باری گران بو.
لاعج: حُبٌّ مُحْرِق/ خۆشەویستی بە سزاو ناسۆر.
لَواعج الحُبّ: آلام و عَذاب/ ئەشکەنجەو ئازارو سزای دڵداری و خۆشەویستی.
لعق:
لَعِقَ: لَحَس/ لستیەوە.
لَعَّقَ. اُلعَقَ: جَعَلَهُ یلعَق/ پێی لستەوە.
لَعْقَة: مایؤخذ بالاصبع او الملعقة/ پەنجەیەك یا کەوچکێك بۆ چەشتن.
لَعوق: کل ما یُلْعَق/ ئەو شتانەی ئەلێسرێنەوە.
مِلْعَقَه: آلة تناول الطعام/ کەوچك.
- الطعام/ کەوچکی خواردن.
- الشای/ کەوکچی چا.
- کبیرة خشبیة/ ئەسکوێ.
لعل:
لَعَلَّ. عَلَّ. رُبَّما. عَسى/ لەوانەیە، رەنگە، دەشێ، ئەشێ، رێی تێ ئەچێ.
لَعَلَّکُم بِخَیر/ هیوادارم باش بن، دەشێ باش بن، ئاواتەخوازم لە چاکیدا بن.
لعن.
لَعَنَ: دعا علیه/ نەفرەتی لێکرد، قسەی پێوت، لەعنەتی کرد.
- : طَرَدَ/ دەری کرد.
لَعْن: إستنزال اللعنات/ نەفرەت لێکردن، نەفرین کردن، لەعنەت کردن.
لَعْنَة: شَتْم/ نەفرەت، لەعنەت، نەفرین.
- : عَذاب/ سزا.
مَلْعون. لَعین. لُعْنَة: تحت اللعنة/ نەفرەت لێکراو، نەفرین کراو.
لَعین: شیطان/ شەیتان، ئەهریمەن.
- : مَطرود/ دەرکراو.
- : خیال المآتَة/ داهۆڵ.
لغز:
لَغَزَ. لاغَزَ. اَلْغَزَ في الکلام: تکلم بالرموز و الالغاز/ بە پێچ و پەنا قسەی کرد، بەهێما ئەدوا.
لُغز: اُحْجیَة/ مەتەڵ.
- : سرّ عمیق/ نهێنی، نادیاری.
- : التکلم بالرموز/ قسەی پێچ و پەناو بەهێما.
مُلْغَز من الکلام: غامض. مُبْهَم/ نادیار، نادیاری، قسەی (پێچ و پەنا، بەمانا).
لغط:
لَغَطَ. لَغَّطَ. اَلْغَطَ: صَوَّتَ/ دەنگی لێوەهات، دەنگی هات.
لَغَطٌ. لَغْط: جَلَبَة و اصوات/ دەنگە دەنگ، ژاوەژاو، جمەهاتن، غەڵبەغەڵب.
لغم:
لَغَمَ: اَزْبَدَ/ کەفی کرد، دەمی کەفی کرد، کەفی چان.
- . اَلْغَمَ المکان: وضع فیه لُغماً/ لەغمی تیادانا، مین رێژی کرد.
- . - : نَسَفَ/ مەڵی تەکان، لەغمی تیا تەقیەوە.
لُغام: زَبَد/ کەف.
لَغْم: مِنْسَف/ لەغم، مین.
مَلغوم: فیه لُغْم/ لەغماوی، جێگەیەك لەغمی تیا دانرابێ، مینی تیایە.
مُلْغَم: مخلوط بالزئبق/ تێکەڵ بە جیوەکراو.
لغو:
لَغا: تَکَلَّم/ قسەی کرد.
- . لَغِيَ: تکلم عن غیر تَفَکُّر/ چەنەی دا، رستی، زۆربڵەوی کرد، بێ لێك دانەوە قسەی کرد.
- الشيء: بَطَلَ/ هەڵوەشایەوە، تێك چو.

– لَغِيَ بالأمر: لَهِجَ بِه/ زۆری وت، زۆر لەسەری ڕۆی، چەنەی زۆری دا.
ألغى: أبطل/ هەڵیوەشانەوە، تێکیدا، وازی لێهێنا.
لُغَة: لسان/ زمان.
– : إصطلاح/ زاراو، زاراوە.
– خاصَّة: لَهْجَة/ شێوەی (قسەکردن، زمان).
– المَوْلد: لُغَة الأم/ زمانی شیری.
كتاب الـ – معجم/ فەرهەنگ.
اهل الـ – : العاملون بها/ زمان زان، زمانەوان.
علم الـ – معرفة اللغة/ زمان (زانی، ناسی، ڕەوانی).
لُغَوِي: مختص باللغة/ زمان زان، زمانەوان.
لَغْو. لَغاء: هراء/ قسەی (قۆڕ هیچ و پوچ)، وتەی (بێجێ، بێمانا).
– . – : كُثْرَة الكلام. ثُرْثُرَة/ چەنەبازی، زۆربلێیی.
– . – : خَطَأ. باطِل/ هەڵە، چەوتی، ناتەواو.
لُغاة: صَوت/ دەنگ.
لَغْوِي: كثير الكلام/ سازندە، زۆربلێ، چەنەباز، درێژ دادڕ، هەڵەوەڕ، زۆروەڕ.
لاغٍ: باطل/ نارەوا، پوچ، بۆش.
– . مَلْغِي. مُلْغى: مَفسوخ/ هەڵوەشاو، تێکدراو، لابراو.
إلغاء: إبطال/ هەڵوەشانەوە، تێکدان، لابردن.
لف:
لَفَّ. لَفَفَ. طَوى/ قەدی کرد، پێچایەوە.
– الشيءَ: ضد نَشَرَهُ/ هەڵیکرد، لولی کرد، بایدایەوە، گرموڵەی کرد، کردی بە (کلافە، کلۆلە).
– الشيءَ: غَطّاه/ دایپۆشی.
– الشيءَ بالشيءَ: وَصَلَهُ به و ضَمَّهُ اليه/ خستیە پاڵی، تێوەی پێچا.
– الخيط على البَكَرَة: ضَمَّهُ و جَمَعَهُ/ هەڵیکردەسەر، دەزوەکەی هەڵکردە سەر خولۆکە.
– المكان: طاف فيه/ تیا خولایەوە، پیاگەڕا، گەشتی تیا کرد.
– . إلْتَفَّ: دار/ خولایەوە، خولی خواردەوە، پێچی کردەوە، وەرگەڕا.
إلْتَفَّ عليه القوم: تجمعوا/ لە سەری کۆبونەوە، دەوریان لێدا.

– النبات او الثعبان على العود/ پیا ئاڵا، تێوەی ئاڵا، پیاهەڵ گەڕا.
– على نفسه/ گرموڵە بو، ئاڵۆزکا، بو بە تۆپەڵ.
– تَلَفَّفَ في ثوبه: إشتمل به/ خۆی (پێچایەوە، پێداپۆشی).
– الثعبان: تَحَوّى/ پەپکەی (خولرد، بەست، دا).
– النبات: تَشَبَّبَ ببعضه/ بەیەکا ئاڵا، چو بەیەکدا.
– الشيءُ: تجمع و تكاثَفَ/ کۆبوەوە، چوە پاڵ یەك، بو بە چڕە.
لَفّ: ضِد نَشْرُ/ پێچانەوە، لول بون، گرموڵە بون، هەڵ کردن.
– : جماعَة/ کۆمەڵ.
جاء و مَن – لَفُّهُ: من إنتمى اليه/ هات خۆی و ئەوانەی لەگەڵی بون.
لَفَّة: دَورَة/ خولێك، پێچێك.
– : حُزْمَة/ دەسك، قول، چەپك.
– : عِمامَة/ مێزەر، سەربەست، سەرپێچ.
لَفّاف: دَوّار/ گەڕۆك، ئەخولێتەوە.
لِفافَة: مايُلَفّ به/ پێچەر، هەڵپێچ، بەستەر.
– : عِصابَة. رباط/ سارغی، برین پێچ، سەربەست، سەرپێچ.
– الطفل: قماط/ دەسرازە، مەلۆتکە پێچ.
– . لفيفة من التبغ: سجارة/ جگەرە، سیفار.
لفيف: مجموع/ کۆمەڵ، زۆر، دەستە، زۆری هەرەمە.
– من الناس/ چەند کەسێك، کۆمەڵێك لەخەڵك.
تلافيف الدماغ: ما تَلَفَّفَ منها/ پێچ و پەناو لۆچی مێشك.
أم – : المعدة الثالثة المجترات/ هەزار لۆغانە.
مِلَفّ. مِلفاف: غلاف. غطاء/ پێچەر، بەرگ.
– : عَطفَة/ پێچ.
– : مِثقاب/ کون کەر، سمۆ، قەڵەم، مەکەب.
– اوراق: مِحفَظَة/ فایەڵ، دۆسیە، فایل.
مُلْتَف. مَلفوف/ پێچراو، هەڵکراو، کلافە.
– على بعضه: مَشبوك/ لول بو، ئاڵۆزکاو، باخواردو، تێك ئاڵاو.
مَلفوف: كَرَنْب/ کەلەرم.
لَفْلَفَ. تَلَفْلَفَ بثوبه: إشتمل به/ خۆی پێچایەوە.

لَقيط: طِفل مَنبوذ/ منداڵی (دۆزراوە، فڕێدراو، بێ کەس)، بیژی، زۆڵ.
- . ملقوط. مُلتَقَط. عُثِرَ علیه/ دۆزراوە.
مِلقط: ما یُلقَط بە/ پێگر، دەستگر، مەقاش.
- الشَعر: منتاف/ موکێش.
- النار: مِسعَر/ مەقاش، پەنگرکێش.
مِلقاط: عنکبوت/ جاڵجاڵۆکە.
- : منقاش/ موکێش.
لقع:
لقع الشيءَ: رَمى بە/ فڕێیدا، توڕیدا، هاویشتی، تێی گرت.
- . لاقَعَ بالکلام: غالب بە/ بە قسە بۆریدا.
لقف:
لَقِفَ. تَلَقَّفَ. إلتَقَفَ الشيءَ: تناولە بسُرعَة/ گرتیەوە، قۆزتیەوە.
لَقفٌ: الأخذُ بسرعة/ گرتنەوە، قۆزتنەوە.
لقم:
لَقَم. لَقِمَ. تَلَقَّمَ الطعام: إلتَهَمَهُ/ بە پەلەو هەڵپە قوتیدا، پاروی گلان.
- : سَدَّ فَمَهُ/ دەمی داخست، دایخست.
لَقَّمَ. ألقَمَ الطعام: جَعَلَهُ یَلقُمه/ کردی بە دەمیەوە.
لُقمَة من طعام: مِلءُ الفم/ پارو.
- سائغَة: لَذیذَة. مُضغَة طَیِّبَة/ پاروی (خۆش، ئاسان قوت)، نەرمەقوت.
تلقیم الطعام: عمل لُقمَة/ پاروگرتن، پاروکردن.
لقن:
لَقِنَ. تَلَقَّنَ الکلام: اخذە مُشافَهَةً/ بەدەم و بە بیستن (فێر بو، پێی وترایەوە، قسەی وەرگرت).
لَقَّنَ: أملى علی/ پێی وتەوە، پێی نوسیەوە.
- : عَلَّمَ/ فێری کرد، تەلقینی دادا، دەرسی دادا.
- : قَرَّرَ في الذهن. یَطبَع و یَغرِس في الذهن/ ئەخاتە مێشکەوە، مێشك پڕ دەکات.
- الممثل او الخطیب: ذَکَّرَهُ/ بیری دەخاتەوە، پێی ئەڵێتەوە.
لَقانَة. لَقانیَة: سُرعَة الفهم/ زیرەکی، زرنگی، زوتێ گەیشتن.
لَقِن: سریع الفهم/ زیرەك، زرنگ.

تلقین: تعلیم/ فێرکردن.
- الممثل او الخطیب: تَفطین/ بیرخستنەوە، پێوتنەوە.
- المَیِّت: تعلیم/ تەلقین، فێرکردن، دەرس دادان.
مُلَقِّن الممثل: مُذَکِّر. مُفَطِّن/ بیرخەرەوە.
- المَیِّت: مُعَلِّم/ فێرکار، تەلقین دادەر.
لقو:
لَقْوَه: شَلَل وَجْني/ دەم خواری، دەم خواربون.
حَلقو: مَعوج الفم/ دەم خوار، دەم گێر.
لقی:
لَقِيَ. إلتقى: وَجَدَ/ دۆزیەوە.
- . - بە. لاقى: صادَفَهُ و قابلە/ پێی گەیی، پێی گەیشت.
لاقى. تَلَقَّى: إستَقبَل/ پێشوازی کرد.
- . - : اخَذَ. تَسَلَّمَ/ وەریگرت.
- مَصاعِبَ جَمَّة: قابَلَ/ توشی بەڵاو نارەحەتی زۆر بو.
بین شیئین: جعلهما یتلاقیان/ بەیەکی گەیاند.
تَلَقَّى: إستلم/ وەریگرت.
تَلَقّاهُ بِصَدرٍ رَحِب: إستقبلە/ بەدڵێکی فراوانەوە پێشوازی کرد.
ألقى: طَرَحَ/ فڕێی دا، هەڵیدا، توڕیدا، هاویشتی.
- عنە: أبعَدَ/ لێی دورخستەوە، لەکۆڵی کردەوە.
- علیه: رَمى علیه/ پیاکێشا، تێی گرت.
- علیه سؤالاً: سَأَلَهُ/ پرسیاری لێکرد، لێی پرسی.
- علی عاتِقِه: وضع علی کتفه/ دای بەکۆڵیا، خستیە سەرپشتی.
- علی عاتقه: حَمَّلَهُ المسؤولیة/ خستیە ملی، کردی بە کۆڵکیەوە، بەرپرسیاری کرد.
- الحِملَ علی ظهره: وضع علی کتفه/ دای بە کۆڵیا، خستیە سەرپشتی.
- الحَبلَ علی الضارِب: اعطى الحُرِّیَّة/ جڵەوی بۆ شل کرد، بەرەڵای کرد، سەربەستی دایە.
- القبض علی: اوقف/ گرتی، بەندی کرد، دەستی بەسەراگرت.
- المسؤولیة علی: وضع المسئولیة/ بەرپرسیاری (کرد، ی خستە مل).

– عليه مسئولية كذا: حَمَّلَهُ/ كردی بە کولکیەوە، توشی کرد، سەپانی بەسەریا.

– عليه القول: أملاه/ پێی وتەوە.

– خُطْبَة: خَطَبَ/ وتاری (دا، خوێندەوە).

– قُرعَة: سَحَبَ القُرْعَة پشکی (فرێدا، خست، کرد).

– الدرس: تلا الدرسَ/ وانەی وتەوە، دەرسی وتەوە.

– عليه درساً: أعطاه درساً/ فێری کرد، تەمێی کرد.

– اليه القول و بالقول: ابلغه إيّاه/ پێی (راگەیاند، وت).

– إليه السَمْعَ: أصْغى/ گوێی (گرت، بۆ شل کرد، لێگرت).

– بِنَفْسِه في كذا: وضع أو رمى بنفسه/ خۆی تێ (خست، فرێدا).

– اليه بالاً: إكْتَرَثَ لَهُ/ بە تەنگیەوە هات، ئاگاداریی کرد، بە قسەی کرد.

– إليه: رَمى إليه/ بۆی فرێدا، بۆی هاویشت.

تَلَقّى: إستلم. تناول/ وەری گرت، پێی گەیشت.

تَلَقّاه بصدر رَحِب/ بەدڵێکی فراوانەوە پێش وازی کرد.

تلاقَوا. إلتقوا. إتصلوا. إجتمعوا/ پێک گەیشتن، کۆبونەوە.

إستَلْقى: إضْطَجَعَ/ پاڵ کەوت، راکشا، درێژ بو، شانی دادا.

– على قفاه أو ظهره: نام على ظهره/ بەگازی پشتدا کەوت.

لُقْيَة. لَقِيّ: لُقْطَة/ دۆزراوە.

لِقاء. لُقيان. لُقًى. إلتقاء: مُقابَلَة/ بەیەک گەیشتن، دیدەنی، چاوپێکەوتن، روبەروبون.

تِلْقاء. مُلاقاة: مَكان اللقاء/ شوێنی بەیەک گەیشتن.

– : إزاء/ لەپێش، لەبەردەم.

– : تجاه/ بەرامبەر، لەوبەر.

من – نفسه: من عند نفسه/ لەخۆوە، لەخۆیەوە.

تَلاقٍ. مُلاقاة: مُلْتَقى/ بەیەک گەیشتن، کۆبونەوە.

إلتقاء: إتصال/ بەیەک گەیشتن، لەیەک دان.

– : إجتماع/ کۆبونەوە.

مكان الـ – / شوێن کۆبونەوە.

مَلْقى. مُلْتَقى: مكان اللقاء/ شوێنی پێک گەیشتن.

– – الطرق. نقطة اجتماعها/ دوریان.

الى المُلْتَقى: وداع/ خوات لەگەڵ، تا پێک گەیشتنێکی تر.

تِلْقائي. من تلقاء نفسه/ خۆڕەس، لەخۆوە، خۆکار.

إلقاء: طرح/ هەڵدان، فرێدان، هاویشتن، توڕدان.

– : كيفية إلقاء الكلام/ چۆنیەتی وتن و دوان و ئاخاوتن.

– الكلام او الخطب. خُطبة/ وتارخوێندنەوە، وتاردان.

– الشيء المحفوظ: تَسميع/ خوێندنەوە.

مُلْقىً: مَطروح/ هاوێژراو، فرێدراو، توڕدراو.

إستلقاء: إضطجاع/ پاڵکەوتن، راکشان، شان دادان.

مُستَلْقٍ: مُضْطَجِع/ پاڵ کەوتو، راکشاو.

أُلْقِيَة. اُحْجِيَة. حَزّورَة/ مەتەڵ.

لك:

لَكَّ: ضَرَبَ في القفا/ كێشای بە پشتی ملیا، نیشتی کرد.

إلْتَكَّ: إزْدَحَم و تداخَلَ/ چو بە ناو یەکدا بو بە چڕە، تێک چڕان.

– في كلامه: اخطأ/ هەڵەی کرد لە قسەکردنا.

لَكيك: مُزْدَحِم/ چڕو بەیەکدا چو.

– : اللحم المُكْتَزُّ/ گۆشتی تونگ و تورت و پتەو.

لَكّ: صِبْغ احمر/ خومی سور، بۆیەی سور.

– : عشرة ملايين/ دەملیون.

لكأ:

لَكَأَ: ضَرَبَ/ لێیدا.

– . لَكأَ به الارض: صَرَعَ/ دای بە زەویدا، کوتای بە زەویدا.

تَلَكَّأَ تباطأَ/ سستی کرد، خۆی دواخست، هێواش بو.

لَكَأَة: مُتَباطِيء/ سست، هێواش خاوخلیچک، تەمەڵ، تەوەزەل.

لكز:

لَكَزَ: لَكَمَ/ (مسته، مشته) كوڵەی پیاکێشا.

لَكِز: بَخيل/ رژد، قەمتەر، پارەپیس.

لكع:

لَكِعَ عليه الوسخ: لصق به/ پیس بو، پەڵەی گرد،لەکاوی بو.

لُكَع. لُكَعَة. وَسِخ/ پیس، پەڵە، پەڵاوی، لەکە، لەکاوی.

– . لُكَعَة. لَكاع. لَكوع. لكيع. الكع: لئيم/ ناپاک، مارِس.

لكم:

ل

لَكَمَ: ضَرَبَ بجمْع اليد/ شەپازلەی لێدا، (مشتە، مستە)کوڵەی پیاکێشا.

لاکَمَ. لَكَمَ أحَدهما الآخر. ضارب بجمع اليد/ شەڕەمشتیان کرد، بەمستەکوڵە کێشایان بە یەکتریدا.

لَكْمَة: لَطْمَة بجمع اليد/ (مستە، مشتە) کوڵە.

مِلْكَمَة: قُفّاز الملاكمة/ دەستکێشی (شەڕەمشت، مشتێن).

مَلْكَمَة: كيس التمرين على الملاكمة/ تورەکەی (شەڕە مشت، مشتێن).

مُلاكم: لاعب الملاكمة/ مستەوان، مشتەوان.

مُلاكَمَة: لِعْبَة/ مستێن، شەڕەمست، مشتێن، شەڕو مشت.

لكن:

لَكِنَ: ثَقُلَ لِسانه/ زمانی (قورس بو، ئەیگرت، تێکەڵ و پێکەڵ بو).

الْكَن: ثقيل اللسان/ زمان قورس، زمان گر، لاڵەپەتێ.

لُكْنَة: ثُقل او عجمة في اللسان/ زمان قورسی، زمان گرانی.

لكِن. لاكِن. لكِنَّ: حتى الآن. لـلآن.ز الا أنَّهُ/ هێشتا، بەلام.

لكي:

لِكَي. لِكَيما: حَتّى/ لەبەرئەوەی، بۆ ئەوەی، تاکو، تا.

لم:

لم: اداة الجزم. لَم يأكل/ نەیخوارد، لم يجلس، دانەنیشت. لم يَقُم/ هەڵنەسا، لم يَذهَب/ نەڕۆی.

إن لَمْ. مالَمْ: إلاّ إذا/ تاکو، تاوەکو.

لِمَ. لِما. لِماذا. لِمَ ذا: لأيِّ سبب/ بۆ، بۆچی.

الَمْ. افلَمْ. اوَلَم أقُلَ لك/ ئایا پێم نەوتی، بۆچی پێم نەوتی.

- . - . - يَكُن/ ئایا نەبو، بۆچی نەبو.

لم:

لَمّا: حينما. عِندَما/ کەی، لەکاتێکدا.

لَمّ: جَمَعَ/ کۆی کردەوە.

- شَعْثَه: إستَرَدَّ او إستجمع قواه. اصلح من حالـه/ خۆی کۆکردەوە، دەستی بەخۆیا هێنایەوە.

- . الَمّ، إلتَمّ بفلان: اتاه فنزل به/ هاتە لای، سەری لێدا.

إلتَمَّ: زارَ/ چوە (دیدەنی، لای)، چو بۆ (دیدەنی، لای).

- بە: اتاه فإجتمع به/ لەگەڵی کۆبوەوە.

- الناس: إجتمعوا/ کۆبونەوە.

لَمّ: اصابَهُ مَس من الجنون/ توشی کەمێك شێتی بو، نیوەشێت بو.

الَمّ بكذا: عَرَفَهُ/ زانی، تێی گەیی، سەری لێ دەرکرد.

- بە كذا: حَدَث له/ بەسەری هات، توشی بو.

- بە مَرَض: أُصيب/ نەخۆش کەوت، توشی نەخۆشی بو.

- بالذنب: فَعَلَهُ/ گوناهی کرد.

- . إلتَمّ: زارَ/ چوە (دیدەنی، لای)، چو بۆ (دیدەنی، لای).

- بالمعنى: عرفه/ زانی، تێیگەیی، هەڵیهێنا.

- بالأمر: لم يتعمق فيه/ لێی نەکۆڵیەوە.

- بالطعام: لم يسرف في اكله/ زۆری نەخوارد.

- يَفْعَل كذا: كاد ان يَفعَل/ وەختەبو بیکا، ئەوەندەی نەمابو بیکا.

لَمّ: جَمَعَ/ کۆ، کۆکردنەوە، گردبونەوە.

- الشَمْل: إستجماع القوى، إصلاح الحال/ خۆکۆکردنەوە، یەکگرتن، کۆبونەوە.

- : جَمْعِيَّة. إجتماع/ کۆبونەوە، کۆکراوە.

- من الجنون. لَمَم: قليل من الجنون/ شێتۆکەیی، کەمێك شێتی.

- : شِدَّة/ تەنگانە، کارەسات، بەلا.

مَلموم: مجموع/ کۆ، کۆوەبو، کۆکراوە، کۆمەڵ، گرد، گردکۆڵ.

- : الذي به لَمَم. به مَسّ من الجنون/ شێتۆکە.

لَمَمْ: جُنون خفيف/ شێتۆکەیی، کەمێك شێتی.

إلمام: دِرايَة/ شارەزایی، زانین، زانیاری، دەست بون، سەرلێدەرکردن.

مُلِمّ: ناهَزَ البلوغ/ هەرزەکار.

- بكذا: عالم. يَعْرِف/ زانیار، ئەزانێ، لێی ئەزانێ، دەستی هەیە.

لُمَّة: رِفقَة السفر/ هاورێی گەشت، هاورێی رێگە.

لامَّة: عَين مصيبة بسوء/ بەچاوەوە بو.

لِماماً: من حين لآخر/ ناو بەناو، لەپڕ.

مُلِمَّة: مُصيبَة/ کارەسات، تەنگانە، بەلا، چورتم.

لَمْلَمَ: جَمَعَ/ کۆیکردەوە، کۆمەڵی کرد.

مُلَمْلَمَة: خرطوم الفيل/ لموزی فیل.

لمج:

لَمَجَ الشيءَ: اكله باطراف فَمِه/ قرتانی.

تَلَمَّجَ: اكل اللُمْجَه. صَبَّرَ بطنه/ بەركولی كرد.
لُمجَة: تَصبيرَة. ما يُتعلل به قبل الأكل/ بەركولّ.
لمح:
لَمَحَ. المح الشيء: ابْصَرَهُ بنظر خفيف/ به تیلایی چاو بینی، بینی، سوسەی كرد.
– : لَمَـعَ/ درەوشـایەوە، بریـسكایەوە، شـەوقی دایـەوە، چەخماخەی دا.
لَمَّحَ: اشار/ پەنجەی بۆ درێژ كرد، ئاماژی كرد.
لامَحَ: خالَسَ النظر/ بەدزیەوە (سەیری كرد، بینی).
لَمْح: نظر سريع/ چاو پیاخشان، سەرنجی خێرایی، تیلایی چاو.
كـ – البـصر: / وەك چـاو تروكـان، ئەوەنـدەی چـاو تروكانێك.
– البصر: النظرة بالعجلة/ له چاوتروكانێكدا.
لَمْحَة: نظرة خفيفة/ چاوپیاخشانێك، سەرنجێك.
– البرق: لمعة البرق/ شەوقی هەورە تریشقه.
– . جمعها ملامح: مَحاسِن و مَساوِيء الوجه/ دیمەن و شێوەی ڕو، شێوە، جوانی و ناشـیرینی، چاكی و خراپـی روخسار.
فيه لَمْحَة او ملامح من ابيه: يَشْبَهُهُ/ شـێوەی بـاوكی تیایە، لەباوكی ئەكا، شێوەی ئەچێتەوە سەر باوكی.
تلميح: إشارَة/ سوسە، پەنجـە بـۆ درێـژكردن، تێلنیـشان، لاپلار.
ملامِح الوجه: تقاطيعه/ دیمەن، شـێوە، چـارە، دیمـەن و شێوەی ڕو، روخسار.
لمز:
لَمَزَ بـالكلام: عـاب/ تـوانجی (گـرت، تـێگرت، ماویـشت)، گاڵتەی پێكرد.
– بالعين: اشار/ چاوی داگرت.
لَمّاز. لُمَزَة: عَيّاب الناس/ توانج هاوێـژ، دەم درێـژ، گاڵتـه بەم و بەو كەر.
لمس:
لَمَسَ: مَسَّ/ دەستی لێدا، دەستی پیاخشان.
– : جَسَّ/ تاقیكردەوە.
– الشيءَ: طَلَبَهُ/ داوای كرد، خوازتی.
لامَسَ: ماسَّ/ بەریەكەوت، لێیخشا.

تَلَمَّسَ الشيءَ: تَطَلَّبَـهُ مَـرَّة بعـد اخـرى/ داوای كـردەوە، ویستیەوە.
إلتَمَسَ: طَلَبَ/ داوای كرد، پاڕایەوە، سكاڵای كرد.
لَمْس: مَسّ/ دەست لێدان، دەست پیاخشان.
حاسَّة الـ – / هەستی (دەست لێدان، لەیەك كەوتن).
لَمْسَة: مَسَّة/ دەست پیاهێنانێك، بەریەك كەوتن.
لميس: لَيِّن الملمس/ نەرم، نەرم و شل، نەرم و نیان.
مَلْمَس: لَمْس/ دەست پیاهێنان، دەست پیاخشان.
– : مَوْضع اللمس/ شوێن دەست پیاهێنـان، تەختـە، جێگە.
– الحَشَرات: عضو الحَسّ/ ئەندامی هەست، كرمـی مەگەز.
مُلامَسَة: تَماس/ لەیەك كەوتن، بەریەك كەوتن.
مَلموس: مَحسوس/ هەست پێكراو، دیار.
– : لَمِس/ دەست لێدراو.
إلتمـاس: طلـب. رَجاء/ داواكردن، پاڕانـەوە، سـكاڵانامە، لالانەوە، دادخوازی.
لمص:
لَمَصَ: عابَهُ و عَوَّجَ فَمَـهُ عليـه/ دەمـی لێخـوار كـردەوە، گاڵتەی پێكرد.
لَمْص: إغتياب الناس/ گاڵتە بە خـەڵك كـردن، قەشمـەری پێ كردن.
لَموص: كَذّاب/ درۆزن.
– : مُغتاب/ گاڵتە بەخەڵك كەر، قەشمەر، پاشملە دو.
لمظ:
لَمَظَ. تَلَمَّظَ: اخرج لسانه فَمَسَحَ به شفتيه/ بە زمـان لـچ و لێوی سڕی و لستیەوە.
تَلَمَّظَه: عابَهُ/ زمانی لێ دەرهێنا، گاڵتەی پێكرد.
إلْتَمَظَ بشفتيه: ضَمَّ احدهما على الأخرى مع صوت فيهما/ ملچەی مات.
لُمظَة: لَحْسَة/ پەنجەیەك كە بلێسرێتەوە.
لَماظَة: طَلاقة اللسان/ زمان پاراو، چەنەبازو زۆربڵێ.
لمع:
لَمَعَ. تَلَمَّعَ. اضاء. بَرَقَ/ شەوقی دایەوە، تیـشكی دایـەوە، بریسكایەوە، چەخماخەی دا، درەوشایەوە.
– . المع بيده أو بثوبه: اشار/ رای وەشان.

ل

نَمِلَ. نَمَلَ الجلدُ و الجسد: خـدر/ میرولـەی کـرد، سڕبو.
نَمْل و الواحِدَة نَمْلَة: حشرة معروفة/ مێروله، مێرو، مور.
الـ – الأعمى او الأبيض: ارضَة/ مێروله سپی، مۆرانه.
الـ – الأحمر/ کێلکه، شەنگەمێرو.
نَمْلي: یُشبه النَمل/ مێرولەیی.
نَمِل: خَفیف الحرکة/ سوکەڵه، بزێو.
– . مُنَمَّل: خَدِر/ سڕ.
– القوائم: خفیفها فی الحرکة/ خـۆش (ڕەو، دەو، بەن)، قاچ سوك، بزێو.
– . مَنمول: کثیر النَمل/ مێرولاوی، پڕ له مێروله.
نَمَل تَنْمیل: خَدَر/ سڕبون.
انْمَلَة. انْمُلَة (الجمع انامل): راس الأصبع/ سـەری (پەنجه، ئەموست، قامك).
قیـد – : قلیـل جـداً/ تۆزقـاڵێ، کـەمێ، ئەوەنـدەی (تۆزێك، سەری پەنجه).
نمو:
نَما: کَبُرَ او کَثُرَ او إزداد/ (گەورە، زۆر، زل، زیاد) بو، گەشەی کرد، فراژێ بو.
نُمو: کبر او إذداد او تکاثر/ (گـەورە، زۆر زل، زیـاد) بون، گەشه کردن، پەرەسەندن، فراژێ بون.
نموذج. انوذج: مثال/ نمونه، وەك،.
نمی:
نَمی (نَمْیی و نماء و نَمِیَ): کَبُرَ/ گەورە بـو، زل بـو، گەشەی کرد، پەرەی سەند، پاژەڵەبو
– : إزداد/ زۆر بو، زیادی کرد.
– : إرتفع و غلا/ بەرزبوەوە، گران بو.
– الحدیثُ الی: عُزِیَ الیه/ درایه پاڵی، کرا به هی ئەو، لێیەوە ئەگێڕنەوە.
– الخَبَرُ: بَلَغَهُ/ هەواڵ گەیی، بڵاوبوەوە، پێیگەیی.
نَمّی. انْمی: کَبَّرَ/ گەورەی کرد.
– . – : زَیَّدَ/ زۆری کرد، زیادی کرد.
إنتمی الی: إنتسب/ گەڕایەوە بۆ.
نُمُوّ. نَماء. نَمِیّ: إزدیـاد/ (گەورە، زۆر، باژەڵه، زیـاد) بون، گەشەکردن، پەرە (سەندن، دان).
– . – . – : تَقَدُّم/ پێشکەوتن.
تَنْمِیَة/ پەرەپێدان، گەشەپێدان.
نـامٍ: ناضِج/ گـەورەبو، گەشـاوە، زۆر بـو، پێگـەیو، پەرەستێن.
نامِیَّة: قُوَّة النمو/ هێـزی گـەورە کـردن و پێگەیانـدن، گەشندە، پەرەستێن.
البلدان – / وڵاته پەرەستێنەکان.
نمیمة (فی نم) نهار (فی نهر) نهایة (فی نهی)
نهب:
نَهَبَ. نَهِبَ. سَلَبَ. اخذ/ تـاڵانی کـرد، بـردی، فڕانـدی، داگیری کرد.
– . – . تناهَبَ الأرض: عَدی سریعاً/ دایه (گـوڕ، غار)، تەنگی زەوی کێشایەوە.
نُهْب: جری سریع/ لۆقـه، غار، گوڕ، خێرا ڕۆیشتن، دەو.
– : غنیمة/ تاڵانی.
نَهْـب. نُهْبَـة نُهبـی. نُهَیْبـی. نهیبـه: سَـلْب. اخـذ الغنیمة/ تاڵان کردن، تـاڵانی، ڕاووڕوت، فڕانـدن، بـردن، بەغما.
نَهّاب. سالب. قاطع طریق/ جەردە، دز، تاڵان کەر.
مَنهـوب: مـسلوب. غنیمـة/ تـاڵانی، تـاڵان کـراو، دەستکەوت، فڕێنراو، داگیرکراو.
نهج:
نَهَـجَ: تتـابَع نَفَسُهُ. لَهَـثَ/ هەناسـەبرکێی (بـو، کـرد، پێکەوت).
– السبیل: سلکه/ ڕێگەکەی گرت، پیاڕۆی، پەیڕەوی کرد.
– . انْهَـجَ الأمْـرُ و الطریـقُ: وَضَـحَ/ دەرکـەوت، ئاشکرابو، ڕون بوەوە.
– . – الأمْـر و الطریـق: أوْضَـحَهُ/ دەریخـست، ئاشکرای کرد، ڕونی کردەوە.
انْهَجَ. نَهَّجَ: جَعَلَهُ یَلْهَث/ هەناسەبرکێی پێخست.
إنْتَهَجَ الطریقَ: سلکه/ ڕێگەکەی گرت، پیاڕۆی.
– . إسْتَنْهَجَ سبیلَه: سلك مسلکه/ ڕێو شـوێنی ئەوی گرت، پەیڕەوی کرد.
نَهَجّ. نَهیج. لُهاث/ هەناسەبڕکێ.

ن

نَهْج. ناهِج طريق واضِح/ رێگەی ئاشکراو دیار.
– : اسلوب: خُطَّة/ رێباز، ڕێوشوێن، بەرنامە، نەخشە.
– : البلاغة: الطريق الرئيسى الى حُسْن البيان/ رێبازی رەوان بێژی.
مَنْهَج. مِنْهَج. مِنهاج: طريق واضح/ رێگەی ئاشکراو رون، بەرنامە.
– . – . – التعليم أو الدروس: خطة و اسلوب التعليم/ بەرنامە، بەرنامەی خوێندن و قوتابخانە.
– . – : اسلوب/ رێباز، ڕێو شوێن، بەرنامە.
– . – : خُطَّة/ پلان، پیلان، نەخشە.
نهد:
نَهَدَ الثدي: بَرَزَ/ مەمك گەورە بو، پێگەیی، ئەگیرێ، خڕ بو.
– ت النبت: كعبت ثديها/ كچەكە مەمكی كرد، مەمكی خڕ كرد.
– : قام: نَهَضَ/ هەڵسا، راست بوەوە.
ناهَدَ: ناهَضَ. خاصَمَ/ دوژمنایەتی كرد، ناكۆكی كرد.
– : تَحَدَّى/ بەربەرەكانی كرد، بەرەنگاری كرد، لەرویا (هەلگەرایەوە، وەستا).
تَنَهَّدَ: تَنَفَّسَ طويلاً/ هەناسەی هەڵكێشا.
تناهَدَ الاصحاب: تَشاركوا على نفقه الطعام/ داكۆكیان كرد، كۆیان كردەوە.
– وا الشيءَ: تناولوه بينهم/ بەشداریان تیاكرد.
ناهِد: ثَدي بارِز/ مەمكی (قوت، قنج، خڕوخەپان).
– : إمرأة نَهَدَ ثَدْيُها/ مەمك كردو.
– : اسد/ شێر.
غلام – : مُراهِق/ هەرزەكار.
نَهْد: شيء مرتفع/ بڵند، بەرز، دیار، دەرپۆقیو، دەركەوتو.
– : ثَدي/ مەمك، مەمكۆڵە، مەمان، مەمە، سنگ.
تَنَهُّد: تَأَوُّه. تَحَسُّر/ هەناسە هەڵكێشان.
مُناهَدَة: مُخاصَمَة/ ناكۆكی.
نَهْدان: مَلآن/ پڕ، لێوان، سەرڕێژ.
نهيد: شريك طعام/ بەش خۆر.
نِهْد: ما تُخْرِجُه الرِفْقَة من النفقة بالسَوِيَّة/ برا بە شێتی، هەر كەس لەسەر حسابی خۆی.
نهر:
نَهَرَ الماءَ: جرى في الارض و جعل لنفسه نهراً/ جۆگەی بەست، بو بە جۆگەلە.
– الدَمُ: سال بِشِدَّة/ فیچقەی كرد، دەرپەڕی.
– النَهْرَ: حَفَرَهُ/ جۆگەی (هەڵكەند، لێدا).
– :إنتهر: زَجَرَ/ تورە بو، پیا هەڵ (شاخا، كاڵا).
– . – : صاحَ مُتَوَعِداً/ قیژانی، هەرەشەی كرد.
انهر النَهْرَ: وَسَّعَهُ/ جۆگە یا روباری فراوان كرد، جۆماڵی كرد، پاكی كردەوە.
نَهْر: مجرى الماء الكبير/ روبار، چەم، زێ، جۆگە، جۆ، جۆبار، خڕ.
– من صَفْحَة كتاب او جريدة: عمود. حَقل/ ستون.
نَهْري: مختص بالأنهر/ روباری، هی روبار.
سمك – / ماسی روبار.
نبات – / روەكی (روبار، ئاوی).
سُفُن نَهْرِيَّة/ كەشتی ناو روبار.
نُهَير: نهر صَغير/ چەم، زێ، جۆ.
إنتهار: زَجر/ تورە بون، هەڵ (شاخان، شاخین، كاڵان، كاڵین).
– : زجر وطرد/ دەركردن بە تورەییەوە.
كَلَّمَهُ إنتهاراً: إنْتَهَرَهُ/ پیا هەڵ (شاخا، كاڵا)، لێی تورە بو.
نهار : ضد ليل/ رۆژ.
– . أنْهَر: شديد الضياء/ زۆر روناك، وەك رۆژ روناك.
ضوء الـ – / روناكی رۆژ.
منتصف الـ – / نیوەڕۆ.
طلوع الـ – / رۆژ بونەوە.
نهاري: يَحدث في النَهار/ بە رۆژ، هی رۆژ، كاروكرداری رۆژ.
نَهِر: كثير. وافر/ زۆر، زۆرو زەبەندە، فراوان، فرە.
نهز:
نَهَزَ: انْهَزَ. دَفَعَ/ پالی پێوەنا، دەستی پێوەنا، هەڵیسان.

– الشيءُ: قَرُبَ/ نزيك بوەوە، كاتى هات.
ناهَزَ: قارَبَ/ كاتى نزيك بۆتەوە، نزيكە.
– البلوغَ/ كاتى بلوغ بونيەتى، نزيكى پێگەيينە.
– الخمسين: دنا منها/ نزيكى پەنجايە، گەيوەتە پەنجا سالّى.
– و إنتهز الفرصة: إغتنمها/ هەلى (بەكارهێنا، پەرست).
إنتهز فرصة كذا/ دەرفەتێكى وەهاى هێنا، فلانە هەلى بەكارهێنا.
نُهْزَة: فُرصَة/ هەل، دەرفەت.
نَهّاز الفُرَص: إنتهازي: نَفْعي/ هەل (پەرست، دزن).
إنتهاز الفُرَص: إغتنام و استغلال الفُرَص/ هەل (پەرستن، بەكارهێنان)، بۆ هەل گەران.
نهش:
نَهَشَ: عَضَ/ قەپى پياكرد، گەستى، گازى لێگرت.
– هُ الدهر: جَهَدَهُ و ادفعه في الحاجة/ هەلّس و كەوتى زەمانە هەژارى كرد، كەفتەكار بو.
نَهّاش: عَضّاض/ گازگر، قەپ گر.
نهض:
نَهَضَ. إنتهض: قامَ/ راپەرى، هەستا راست بوەوە.
– للأمر: قام و شرع فيه/ دەستى (دايە، پێكرد).
– للأمر: قام و إستَعَدَّ لَهُ/ ئامادە بو، خۆى بۆ ئامادە كرد.
– على: قام ضد/ لە دژى هەستا، راپەرى،.
– الى: اسرع اليه/ بۆى راپەرى، بۆى چو، پەلامارى دا.
ناهَضَ: قاوَمَ/ بەرگرى كرد، بەرهەلّستى كرد.
– : تَحَدّى/ بەربەرەكانى كرد، بەرەنگارى كرد، لەرويا هەلّگەرايەوە.
– : خاصَمَ/ دژمنايەتى كرد، ناكۆكى كرد.
أنهَضَهُ: حَرَّكه للنهوض/ راىوەشان، هەلّىسان، خەبەرى كردەوە.
نَهْض. نُهوض: قيام/ هەستا، راست بونەوە، راپەرين.
نَهضَة: نُهوض: إنتعاش او تَحَرُّك/ بوژانەوە، ژيانەوە، جولاّن.
– : حركة نحو التقدم/ راپەرين، هۆشياربون، جولاّنەوە بەرەو پێشەوە.
– : طاقَة و قُوَّة/ ليّهاتويى، وزە، هێزو چالاكى، توانايى، تين.
ناهِض: قائم/ هەستاو، وەستاو، راپەريو، بەخەبەر.
– : ثابت/ جێگير، دامەزراو.
– : مجتهد/ تێكۆشەر، چالاك، خەباتكار.
مكان – : مرتفع/ بلّند، بەرز، ديار.
مُناهضة: مُقاوَمَة/ بەرهەلّستى.
نهق:
نَهَقَ. نَهِقَ الحمار: صَوَّتَ/ زەرى.
نَهْق. نُهاق. نهيق: صوت الحمار/ زەرين، زەرەزەر، زەرەى كەر.
نهك:
نَهَكَ الثوبَ و غيره: إستعمله حتى بَلِيَ و خَلَقَ/ كۆن بو، پەكى كەوت.
– عِرْضَهُ: بالغ في شتمه/ قسەى ناشيرينى پێوت، جنێوى پێدا.
– . نَهِكَ. افنى. استنفذ/ تەواو بو، نەما، لێبوەوە.
– . – . إنْتَهَكَ: أضنى. إنْحَلَّ/ شەكەت بو، ماندو بو، هێزى نەما.
– . – . – قُوَّتَهُ/ لە پەل و پۆ كەوت، هێزى نەما.
إنْتَهَكَ الحُرمَةَ: هَتَكَ العرضَ. دَنَّس/ كارى ناپەواو ناشيرينى كرد، دەستى بۆ ناموس برد.
– الشيء: اساء إستعماله/ چەوت بەكارى هێنا.
– حُرمَةَ إمراة: إغتصبها/ بەزۆر (لاقەى نافرەتى كرد، بنى پژان، كچێتيەكەى برد).
أنهَكَ: عَذَّبَ/ سزاى دا.
– : قَوَّضَ/ شەكەتى كرد، كفتى كرد، ماندوى كرد، چەوسانيەوە، لاوازى كرد، رەتانديەوە.
– : نَهَكَ: إستهلك/ بەكارى هێنا، پەكى خست، لەكەلكى خست.
نُهِكَ. ضَنِيَ/ لاواز بو، پەكى كەوت، نەخۆش كەوت، لە پەل و پۆ كەوت، شەكەت بو.
لا يُنتهك: حَصين/ پتەو قايم، سەخت.

ن

نَهك. إنتهاك: إستنفاذ/ شەکەتی، هێز تیا نەمان، پەك کەوتن، کفتی، ماندویەتی.
– . – : سوء الاستعمال/ چەوت بەکارهێنان.
مُنْهك: مُتْعب/ شەکەت کار، ماندوکار، کفت کار.
مَنهوك: مُسْتَنْفَد/ پەك کەوتو، پەرپوت، بەکارهێنراو.
– القوی. مُنْهَك: مُتْعَب/ شەکەت، کفت، ماندو، هیلاك.
نهل:
نَهَلَ. شَرِبَ/ خواردیەوە.
مَنْهَل: موضع الشرب/ دەفرو شوێنی ئاو خواردنەوە، ئاوخۆرکە.
نهم:
نَهِمَ: اکل کثیراً/ زۆری خوارد، چلێس بو، زۆر خۆری کرد.
– فی الأکل. اکل بنهم و شَرَه: إلتهم/ تێری نەئەخوارد، چلێسانە خواردی.
– فی الشيء: رَغِبَ فیه جداً/ ئەیویست، تێری نەئەخوارد، هەر داوای ئەکرد.
نَهَم: بِطْنَة/ زۆر خواردن، زۆرخۆری، تێر نەخواردن.
– : شَراهَة/ چلێس، خۆرایی.
نَهِم. نَهیم: شَرِه. مِبطان/ زۆرخۆر، چلێس، خۆرا، تێر نەخۆر، سك دڕاو.
مَنهوم بکذا: مولع به. لا یَشبَع منه/ چلێس، تێری لێ ناخوا.
نهی:
نَهی (نَهیاً). نَها (نهواً) عن. مَنَعَ/ نەیهێڵا، قەدەغەی کرد.
– . نُهِيَ. أُنْهِيَ الیه الخَبَرُ: بَلَغَ/ پێی ڕاگەیەنرا، پێی وترا.
نَهَّی. انْهَی الیه الخَبَرَ: اَبْلَغَهُ/ ڕایگەیاند، هەواڵەکەی گەیان.
أنهی: اتَمَّ/ تەواوی کرد، لێبوەوە.
– : جَعَلَهُ یَنْتَهي/ وای لێ کرد (تەواو بێ، ببڕێتەوە، کۆتایی بێ)، تەواو بو، کۆتایی هات.
– : أتی علی (دوایی، کۆتایی) پێهێنا، هیچی نەهێشت.

إنْتَهی: تَمَّ/ تەواو، تەواوبو، کۆتایی هات، دوایی هات.
– : زال. إنقطع/ بڕا، نەما.
– : الأمْرُ/ کار لە کار ترازا.
– اَمْرَهُ/ لێبوەوە.
– الأهل او الموعد/ کات بەسەر چو، ڕۆیی، تێپەڕی.
– الشيءُ: بَلَغَ نهایَتَه/ بڕایەوە، هیچی نەما، کۆتایی هات.
– بکذا/ ئاوای لێهات، بەوە کۆتایی هات.
– به الی کذا/ ئەوە وای لێ کرد، بەوە وای لێهات، ئاوای لێهات.
– الیه الخبر: بلغ/ هەواڵەکەی زانی، پێی گەیشت.
– . تناهی الوقت/ کات تێپەڕی، بەسەرچو.
– عن کذا: کَفَّ/ وازی هێنا، دەستی هەڵگرت.
نَهو. إنهاء: إنجاز/ تەواوکردن، کۆتایی پێهێنان، لێبونەوە.
– . نَهي: مَنع/ قەدەغەکردن، نەهێشتن، نەهێڵان، بەرگری کردن.
نُهِیّ: تحریم. حَظر/ قەدەغەکردن، حەرام کردن.
ناهٍ: مانع/ نەهێڵ، قەدەغەکەر، کۆسپ، بەربەست.
– : آمِر بالإمتناع/ نەهێڵ، کەسی قەدەغەکەر.
ناهیك من کذا/ واز لەوە بێنە، جگە لەوە.
مَنْهِيّ عنه: مُحَرَّم/ لێی قەدەغە کراو، حەرام کراو.
نِهایة. مُنتهی: اقصی/ ئەوپەڕی، دوایین، کۆتایی، ئەنجام، مەبەست.
– : حَدّ/ سنور، پەڕ، کەنار، سەر.
الـ – الصغری/ کەمترین، ئەم پەڕی، ئەم پەڕەکەی.
الـ – الکبری/ زۆرترین، ئەوپەڕی، ئەوپەڕەکەی.
الی الـ – / تا کۆتایی.
الی مالا – / هەتاهەتا، بێسنور.
لا – له: لیس له نهایَة/ کۆتایی نایەت، تەواو نابێ، بێپایان، نەبڕاوە.
فی الـ / لە کۆتاییدا، لە ئەنجامدا.
نِهائي: اخیر/ کۆتایی، دوایین، پایان، خولی کۆتایی.
– : بات/ یەك لایی بو، کۆتایی پێ هاتو.
لا – / بێپایان، کۆتایی نییە.

إنتهاء: آخر/ كۆتايى، دوايى، پايان.
— : إنقضاء/ بەسەرچون، تێپەڕبون، برانەوە.
— : زوال/ نەمان، لێبونەوە، برانەوە.
حُسْن الـ — / جوان كۆتايى، بەجوانى كۆتايى هاتن.
إنهاء: إنجاز. إتمام/ تەواوكردن، كۆتايى پێهێنان، لێبونەوە.
مُتناه: محدود/ سنوردار، ديارىكراو
غير — : لاحد له/ بێسنور، ديارى نەكراو.
غير — : لا نهاية له/ بێكۆتايى، بێئەنجام.
تَناهٍ: الإنحصار ضمن حَدّ/ سنور بۆ دانان، ديارى كردن.
مُنتَهٍ: مُنْجَز. تام/ تەواو، تەواو بو، كۆتايى پێهاتو.
— : مُنْقَضٍ/ تێپەڕيو، بەسەرچو، نەماو.
— : لم يبق منه شيء/ نەماو، تەواوبو، هيچى لێنەماوەتەوە.
مُنتهى: آخر/ كۆتايى.
— : غاية/ مەبەست، ئەنجام.
— : اقصى/ ئەوپەڕ، ئەوپەڕى، ئەوپەڕەكەى.
نِهَى: نُهاء: زجاج/ شوشە، بلور.
نُهى: نُهْيَة: عقل/ ژيرى، هۆش، بير.
نِهاء: رخام شَفيف/ مەرمەرى رون.
— . نِهايَة. آخر/ كۆتايى، پەڕ، پايان.
— . — : غاية/ مەبەست، ئەنجام.
نوء:
ناء: سَقَطَ/ كەوت، كەوتە خوارێ، هاتە خوارێ.
— بالحمل: نَهَضَ به مثقلاً/ بە نارەحەت بە كۆمەڵەكەيەوە هەڵسا.
— به او اناءَهُ الحِمْلُ: اَثْقَلَه/ بارى گران بو، بە بارەكەيەوە نالآنى.
— : نَهَضَ بجهد و مَشَقَّة/ بە گران و نارەحەتى هەڵسا.
— . نَأى: بَعُدَ/ دور بو، دور كەوتەوە.
ناوَأَ: عارضَ/ سەرپێچى كرد، ناقايل بو.
مُناوَأة. نِواء: مُعارَضَة: مُقاوَمة/ سەرپێچى، ناقايلى، بەرگرى.
مُناوِيء: معارض. مُقاوم/ ناقايل، بەرگر، دژكار، ياخى، بەربەرەكانى كار، بەلەسە.

نَوْء. انواء. نَوّ: إضطراب البحر/ پشێوى دەريا، گەرداو.
— : مَطَر/ باران.
الأنواء الجوية: علم تقلبات و الارصاد الجوى/ كەش (زانى، ناسى)، كەشەوانى.
مِنْواة. مُسَجِّلَة التقلبات الجوية/ كەش نوس.
مِنْوئي: مختص بالارصاد الجوية/ كەش (زان، ناس).
نوب:
ناب عنه: قام مَقامَه/ لەبرى بو، لەجياتى بو، بريكارى بو.
— منابَةً او عنه: كان نائباً عنه/ نوێنەرى بو، جێى گرتەوە، چوە جێى.
— . اناب الى: رجع مرة بعد مرة/ زۆرجار گەڕايەوە.
— ـهُ. إنتابَهُ امر: وقع له/ كارەساتێكى بەسەر هات، توش بو.
— ـهُ كذا: نالَه. خَصَّهُ/ دەستىكەوت، بەرىكەوت.
اناب. نَوَّبَ: وَكَّلَ/ لە جێى خۆى داينا، كردى بە نوێنەرى.
ناوَبَ: داوَلَ/ نۆرەى گرت، سەرەى گرت.
تناوَبَ: تَعاقَبَ/ بەدواى يەكدا بون، دوابەدواى بو.
— وا العمل و عليه: قاموا به مُناوَبَةً/ بەنۆرەو يەك لە دواى يەك ئيشيان كرد.
إنتابَه: اتاه مَرَّةً بعد اخرى/ بۆى هاتەوە، توشى بوەوە.
نَوْبَة: دَوْر/ نۆرە، خول.
— : فُرصَة/ هەل، دەرفەت.
— : مَرَّة/ جار، كەڕەت، پات.
بالـ — . مُناوَبَةً: بالدور/ بەنۆرە، بەسەرە.
نِيابَة: وكالة/ جياتى، نوێنەرى، لەباتى، لەجێى.
بالـ — عن: بالوكالة/ لەجياتى، لەبرى، لە شوێنى.
نيابَةً عن: بدلاً من/ لەجياتى، لەبرى، لە شوێنى.
نيابى: بالوكالة/ نواندن، نوێنەرێتى.
— : مكان اجتماع النواب/ شوێنى كۆبونەوەى نوێنەران.
مجلس — : مجلس النواب/ ئەنجومەنى نوێنەران.
نائب. مُناب: وكيل/ بريكار، جێگر.

ن

– : عـضـو مجلـس نـواب/ نوێنـەر، ئەنـدامی ئەنجومەنی نوێنەران.

إنابة: إبدال/ گۆڕین، لەجێدانان.

– : إيفاد النائب/ ناردن، نوێنەر ناردن.

مَناب: بَدَل/ لەجیاتی، لەبری.

– . نوب. نیاب: ابدال/ گۆڕین، لەجێدانان.

نابَ مَنابَهُ: قام مَقامَهُ/ لەجێی ئەوابو.

مُناوَبَة. تَناوب: تعاقُب. تَداول/ نـۆره، نـۆرەکردن، یەك لە دوای یەك.

بالـ – . بالـ – : بالدور/ بەنۆره، بەسەره.

مُتناوِب: متعاقب/ نۆرەگر، نۆرەکار، گۆڕاو.

نُوبَة. نائبَة. مُصيبَة/ بەڵا، کارەسات، رو‌داو، مەره.

نوائب: حوادث خيراً أو شراً/ کارەسـات، رو‌داو خـۆش بێ یا ناخۆش.

نوت:

نات: تَمايَلَ/ لەریەوه، بەم لاولادا کەوت، لەترێدا.

نوتي: مَلاّح/ کەشتیەوان.

نوح:

نـاحَ: بكـى بـصياح و عويـل/ گريـا، شـيوەنی کـرد، لاواندیەوه، ناڵاندی.

– الحمام: سَجَعَ/ خوێندی.

ناوحَ: قابل. واجَهَ/ روبەڕوی بو، بەرەنگاری بو، ناوقەد بو.

تَنَوَّحَ: تَحرَّك و هو مُتَدلٍ/ لەریەوه، هات و چو.

نَـوْح. نـواح. نيـاح: عَويـل/ گريـان، شـيوەن، نـاڵين، شين، شين و زاری، لاواندنەوه، ناڵاندن.

– . – . – الحمام/ خوێندنی کۆتر.

نَـوّاح. نـائح: بـاكٍ. نـادب/ ئـەگری، شـيوەن ئـەکا، ئەلاوێنێتەوه.

مَناحَـة: مَنْدَبَـة. عويـل/ شـيوەن کـردن، لاواندنـەوه، شینەوار.

نوخ:

أناخَ الجملَ: ابركهُ/ يخى دا، چۆکی پێدادا.

– بالمكان: أقام به/ هەڵێدا، دای کوتا، مایەوه.

إستناخ: بَرَك/ يخ درا، چۆکی دادا.

مَناخ: محل الإقامَة/ ژینگه، نیشتمان.

– : طقس. حالة هواء المكان/ ئاووهەوا، کەش.

نود:

نـادَ. تَنَـوَّدَ: تمايَـل/ جولايـەوه، بـەم لاو لادا ئـەهات و ئەچو، لەریەوه.

نَوْد. نودان: تَمايـل/ جولانـەوه، لەرینـەوه، بـەلاّم لادا کەوتن.

– . – : تَنكـيس الـراس نُعاسـاً/ خەوبردیـەوه، وەنەوز، وەنەوز ((دان، ەکوتن)).

نور:

نَوَّرَ النباتُ: ازهر/ گوڵی کرد، خونچەی کرد، پشکوت.

– : جعل له نوراً/ روناکی تێخست.

– . انار الشيءُ: اضاءَ/ شەوقی دایەوه، بریسکایەوه، روناکیدا.

– . – المصباحَ: أشعله/ دایگیرسان.

– الصُبحُ: ظهر نوره/ شەبەقیدا، گزنگیدا.

أنار المسئلة: اوضحها/ رونی کردەوه، لێکی دایـەوه، راڤەی کرد.

– العَقلَ: ثَقَّفَـهُ/ تێیگـەیان، فێـری کـرد، بـۆی رون کردەوه، بیری رۆشن کردەوه.

أنْوَرَ: ظَهَرَ/ دەرکەوت، کەوتەڕو، ئاشکرابو.

تَنَوَّرَ المكانُ: اضاءَ/ روناك بـوەوه، روناکی تێکـەوت، رۆشنایی تێکەوت.

– : تَطلّـى بالنُّورة/ قـسڵی تێـسو، لە قـسڵی گـرت، جاڕوکەشی کرد.

– . إسـتنار عَقلُـهُ: تَثَقَّـفَ/ تێگەشـت، بـۆی رون بوەوه.

إستنارَ: إستَمَدَّ نوره/ روناکی لێوه وەرگرت.

– العقلُ: تثقف/ تێی گەیشت، بۆی رون بوەوه، بیری رۆشن بوەوه.

نَوْر (الجمع انوار و المفرد نَوْرَة): زَهر/ گوڵ، خونچه.

نَوْرَة. نُوّارَة. زهرة/ گوڵێك.

نَوْرِيَّة: ورقة الزهرة/ پەڕەی گوڵ.

نور (الجمع أنوار و نيران): ضَوء/ روناکی، رۆشـنایی، تیشك.

نوري. نُوري. مُنير: مُضيء/ روناك، رۆشن، بەشـەوق، درەوشاوه.

— . — : النسبة الى النور/ پەیوەنـد بـە روناکیەوە.

— . — : مُحتال/ فێڵباز، تەڵەکەباز، کەڵەکچی، ساختەچی.

جسم — (کالکواکب)/ هەسـارە، شـەوقدار، ئەدرەوشێتەوە.

نوّار: شديد النور/ بەشەوق، زۆر روناك.

مُنير: مُضيء/ روناکی دەر، روناك کەرەوە.

— : ساطع/ ئەدرەوشێتەوە، بریقەدار، روناك، رۆشن.

نَيِّر: ساطع او مُشرِق/ بەشەوق، بریقەدار، گەش.

— : ضد مُظلم/ روناك، رۆشن.

— : واضِح: جَلي/ ئاشکرا، رون، دیار.

طلاء او دهان — / بۆیەی بەشەوق، بریقەدار.

عَقْلٌ — : مثقف/ تێگەیشتو، زیرەك، زۆرزان.

الـ — الأعظم: الشمس/ رۆژ، خۆر.

النَّيِّران: الشمس و القمر/ مانگ و خۆر.

إنارة. تَنوير: إضاءَة/ روناك کردنەوە، رۆشن کردنەوە.

— . — العقول: تثقيف/ تێگەیاندن، رۆشن بیری.

مَنار. مَنارَة: موضع النور/ روناکی بەخش.

مَنارَة المسجد: مِئْذَنَة/ منارە، شوێن بانگدان.

مِنْوَر السقف: كَوَّة السَّقْف/ کلاوڕۆژنە.

مِنوار مِصباح الشارع/ روناك کەرەوە، چراو روناکی شەقام.

مَنْوَر: نبات زينة/ نازناز.

مُتَنَوِّر: مُثَقَّف/ تێگەیشتو، رۆشن بیر.

نار: جوهر محرق/ ئاگر.

— : سِمَة. كَي/ داخ، داخ کردن، دروشم.

جَبَل الـ — بركان/ ئاگرپڕژێن، فۆلکان.

الـ — : جهنم/ دۆزەخ، جەهەنم.

الـ — : الرأي/ باوەڕ.

اوقَدَ — الحرب: اشعلها/ شەڕی نایەوە، هەڵیگیرسان.

لا تستضيء بـ — فلان: لا تستشره/ راوێژی پێ مەکە.

لا تتراءَى — هما: لا يجتمعان/ رێك ناکەون، دانویان پێکەوە ناکوڵێ.

ناري: من نار/ ئاگرین.

سلاح — / چەکی ئاگر هاوێژ.

نُورة: كلس/ قسڵ.

نُوْر نَيْلَج. دخان الشحم/ دوکەڵی بەزو پیو، هێس.

مُناوَرة. مُناورات: تمرين الجيش على الاسلحة/ راهێنان و فێرکردنی سەرباز.

— . — : مداورات سياسية/ پێچ و پەنای رامیاری.

نَوْرَج: دَرّاسَة/ جەنجەڕ.

— : سكة المحراث/ گاسن.

نَوْرَس: طير مائي/ تیتلەکەناچە، کەناچە.

نوس:

ناسَ الشيء: تَحَرَّك و تذبذبَ مُتَدَليًا/ لەریـەوە، جولایەوە، بزاوت.

نُوس: ذبذبة/ لەرینەوە.

نَوّاس: مُتَذبذب/ ئەلەریتەوە، راناوەستێ.

— : المضطرب المسترخي/ لەرزۆك، شپرزە.

نُواس العنكبوت: نَسْجَهُ/ مێلانە جاڵجاڵۆکە، تەیمان و تەنانی جاڵجاڵۆکە.

— الدخان: ما تَدَلّى منه من السقف/ هیس.

إنسان (الجمع أُناس و ناس): بَشَر/ مرۆ، مرۆڤ، خەڵك، پیاو، مەردوم، کەس.

إنسانية/ مرۆڤایەتی.

نوش:

ناشَ. تَناوَشَ الشيءَ: تَناوَلَهُ/ وەریگرت، گرتی.

ناوَشَ العَدُوَّ: نازَلَهُ/ دەستەویەخە بو، یەخەی گرت، پەلاماری دا.

— : ناوَلَ/ دایە دەستی، دای پێی.

مُناوَشَة: نزال/ دەستەویەخەوەستان، پەلاماردان.

نُووش: قَوِيّ/ بەهێز، بەتین.

نوص:

ناصَ: هَرَب و تَنَحّى عَنْ/ هەڵهات، بۆی دەرچو، تێی تەقان، تێی قاچان.

نَوَّصَ. إنتاصَ القنديل: ضعف نوره/ چراکە کزبو.

نَوْص: الحمار الوحشي/ کەرەکێوی.

— . نوص: فرار/ راکردن، هەڵهاتن.

– . مَناص. منيص: مَفَرّ/ پەنا، پەناگە.

لا مَناصَ منه: لابُدَّ منه. محتوم/ چار نیە، هەر ئەبێ ببێ.

نوط:

ناط. اناط. نَوَّط: عَلَّقَ/ هەڵیواسی.

– . – . – به الامرُ: كَلَّفَهُ به/ پێی سپارد، رای‌سپارد.

– . – . – عليه الامرَ: عَلَّقَهُ عليه/ پێوەی بەست، كارەكەی پێوە بەنگ كرد.

نيط به الأمرُ. نيط عليه: عُلِّقَ عليه/ پێوەی بەنگ كرا، بەوەوە بەسترا، لەسەر ئەو بەنگ كراو.

مَنوط: مُعَلَّق/ پێوە بەستراو، بەنگداو.

نَوط: ما عُلِّقَ/ هەڵواسراو، شۆڕەوە بو، داهێڵراو.

– : تكريم/ خەلات، مەداليا.

– الشجاعَة/ خەلاتی ئازایەتی، مەدالیای ئازایەتی.

نياط القلب: أوتار القلب/ دەمارەكانی دڵ.

نوع:

نَوَّعَ الشيءَ: جَعَلَهُ انواعاً/ كرد بە هەمەجۆر، بەش بەشی كرد، جۆرجۆری كرد.

– : غَيَّرَ. عَدَّلَ/ گۆڕی.

تَنَوَّعَ: صار انواعاً/ بو بە (هەمەجۆرە، بابەت بابەت، هەمەچەشنە).

نوع: جنس/ توخم، جۆر، بابەت، چەشن، رەنگ.

– : صنف/ پلە، جۆر، باش و خراپی، چەشن.

نوعاً ما. بنوع ما: قليلاً او كثيراً/ كەم یا زۆر، هەرچۆن بێ، بەهەرجۆر.

نَوعِيّ: مُعَيَّن/ دیاری كراو.

الوزن الـ – / كێشەی دیاری كراو، ئاوكێشە.

تَنَوُّع: تَعَدُّد الانواع/ بابەت زۆری.

مُتَنَوِّع: شَتّى. مختلف النوع/ جۆراوجۆر، هەمە (جۆر، رەنگ، چیزە)، زۆر (جۆر، بابەت).

نوف:

نافَ. اناف: إرتفع/ بەرزبوەوە، بڵندبوەوە.

– على الشيء: اشرف/ بەسەریا روانی، بەرز تر بو.

نَيَّفَ و اناف على: زادَ/ زیاتر بو، زۆرتر بو، پتر بو.

نَيْف: زيادە/ زۆری، زیاتری.

مُنْذُ اربعون سنه و – . – / لە پێش چل ساڵەوە، چل ساڵ زیاتر.

نياف: تام الطول و الحُسْن/ بالاوجوانی تەواو، بالابەرزو جوان.

مُنيف. مَناف: مُرْتَفِع/ بەرز، بڵند.

نوق:

ناقَ الشَحْمَ مِنَ اللحم: فَصَلَهُ/ چەوریەكەی لێ گرتەوە.

نَوَّقَ الشيءَ: صَفَّهُ/ ریزی خست.

تَنَوَّقَ. تَنَيَّقَ في ملبسه و مطعمه او أُموره: تَجَوَّدَ فيها/ رێك و پێك بو، لە جل و خواردن و هەمو كارێكیا.

آنَقَ: اعْجَبَ/ بەدڵی بو.

نَيِّق: الذي يُتَجَوَّد في ملبسه و مطعمه و اموره/ رێك و پێك لە هەموو شتێكیا.

ناقة (جمعها نوق. نياق. ناقات. انوق): انثى الجمل/ ماوشتر، وشترە (ماچە، مێ).

لا – لي فيها و لا جَمَل/ هیچی منی تیا نیە، پوشێكی منی پێوە نیە.

نول:

نالَ. أنالَ. نَوَّلَ. اعْطى/ دایە، پێیدا، دایە دەستی.

– : حَصَلَ على (في نيل)/ دەستی كەوت.

ناوَلَ: سَلَّمَ الى/ دایە دەستی.

– : اعطى/ پێیدا، دایە، پێیدا.

تَناوَلَ: اخَذَ/ وەریگرت.

– الطعام: اكَلَ/ خواردی، نانی خوارد، خۆرشتی خوارد.

مُناوَلَة: تسليم/ دان، پێدان، دانەدەست.

تَناوُل: اخذ/ وەرگرتن.

– الطعام/ نان خواردن، خۆرشت خواردن.

– : اخذ القُربان عند المسيحين/ پیرۆزكردن، پیرۆزی وەرگرتن لە قەشە.

نَول. مِنْوَل: خَشَبَة الحائك. مِنْسَج/ تەون، دەستگای جۆلایی.

مِنوال: حائك/ جۆلا.

– : اسلوب. نَسَق/ شێوازِ رێگە، رێباز، مۆدە، باو، پێوەدان.

- واحِد. .نَسَق واحِد، عدم تغيير/ يەك (جۆر، بابەت، شێوە، چەشن)، نەگۆڕان.
على هذا الـ - : على هذا الاسلوب و النسق/ بەم شێوەیە، بەم پێیە، لەم بابەتە.
نوم:
نام: ضد إستيقظ. غفا/ نوست، خەوت، خەوی لێکەوت.
- : رَقَد. دَخَلَ سريره لينام/ راكشا، پاڵكەوت، چوە ناوجێ.
- البَحْرُ: هَدَأ/ دەریا هێواش بووەوە، هێمن بووەوە.
- عن حاجته: لم يَهْتَم لها/ کەمتەرخەم بو، گوێی پێ نەدەدا، بایەخی پێنەدا.
- ت البضاعَة: كَسَدَت/ ماڵەکەی شکا، بازاڕی وەستا.
- ت الرِجلُ: خَدِرَت/ قاچ سڕ بو، تەزی.
- ت الريح: سكنت/ باكەی خست، هێمن بووەوە.
- ت السوق: :كَسَدَت/ بازاڕ وەستا.
- ت النار: هَمَدَت/ ئاگرەکە دامرکایەوە، کوژایەوە، نیشتەوە.
- و إستنام و تناوَم اليه. إطْمَأنَ/ لیی دڵنیا بو، بڕوای پێ کرد.
- و - اليه: رَضى به/ پێی قایل بو، پێی رازی بو.
- و - اليه: اذْعَنَ/ ملی بۆدا.
لايَنام و لا يُنيم: لايَدَعُ احداً ينام/ نەنەنوێ و نە نەیەڵێ کەس بنوێ.
إستنامَ: نام/ نوست، خەوت، خەوی لێکەوت.
- : تَظاهَرَ بالنوم كذباً/ خۆی کرد بە نوستو.
- اليه: إستانس به/ به دڵی بو، پێی خۆش بو، کرەی نەکرد.
تَناوَمَ: تظاهَرَ بالنوم/ خۆی کرد بە نوستو.
تَنَوَّمَ. إسْتَنْوَمَ: إحْتَلَم/ شەیتانی بو.
نَوم. نُوام. ضد يقظة/ خەو، خەوتن، خەولێکەوتن.
ثقيل الـ - / خەو قورس، خەوگران.
خفيف الـ - / خەوسوك.
وقت الـ - / خەوتنان.
كثير الـ - / خەووك، خەفۆك.

نَومي: مختص بالنوم/ هی خەو، هی نوستن، بابەتی نوستن.
اليقضة النومية/ گورگە خەو.
نَؤوم. نُوَمَة. نَويم. نَوّام: كَسول/ تەمەڵ، تەوەزەل، خەوالو.
نَومَة: المَرَّة من نام/ خەو، خەوێك، نوستنێك.
نيم: ثوب النوم/ بەرگی (خەو، نوستن).
نائم: ضد مُسْتَيقظ/ خەوتو، نوستو.
- : مُخَدَّر/ تەزیو، سڕ.
تنويم/ نواندن، خەواندن، خەولێخستن.
- مغنطيس/ خەواندنی موگناتیسی.
مَنام: نَوم/ نوستن، خەوتن.
- : حُلْم/ خەون، خەون بینین.
- . مَنامَة: مَوْضِع او فراش النوم/ نوێن، جێگە، جێگەی نوستن.
- . - : غرفة النوم/ ژوری نوستن، خەوگە.
مَنامَة. قميص النوم/ بەرگی خەو، بەرگی پێوەنوستن.
مُنَوِّم. مَنْومَة: يَجْلب النعاس/ خەولێخەر، خەوهێن.
- . - : مُخَدِّر/ بێهۆشکەر، خەولێخەر.
نون:
نَوَّنَ الكلمَة: الحقها التنوين/ دو بۆری بۆ دانا.
نون: سَمَك/ ماسی.
- : بال/ حوت.
نونة: نقرة الدقن/ چاڵی چەناگە، چاڵی زەقەن.
نوه:
ناه. تَنَوَّه: إرتفع/ بەرز بووەوە، هەڵچو.
تنوين/ دو بۆر دانان.
نوه:
ناهَ. تَنَوَّهَ: إرتفع/ بەرز بووەوە، هەڵچو.
نَوَّهَ: رفع/ بەرزی کردەوە.
- به: ذكره/ ناوی هێنا، باسی کرد.
- به: مَدَحَهُ و عَظَّمَهُ/ هەڵیدا، بەرزی کردەوە، هەڵی نا.
- عن او الى كذا: لَمَّحَ او اشار/ بە پەرلە ناوی هێنا، ئاماژی کرد، لاپلاری هاویشت.
تنويه: ذكر/ ناوهێنان، باس کردن، ئاماژە بۆ کراو.

ن

– : مَدح/ پیاهەڵدان، هەڵنان.

مُنَوَّه به: مَذکور/ ناوهێنراو، باسکراو.

نوی:

نَوی. إنتوی: عَقَد النِیَّة/ بریاریدا.

– . – : قَصَدَ/ مەبەستی بو، نیازی بو، ویستی.

– : تَباعَدَ/ دورکەوتەوە.

نَوَّی: عَقَدَ النُوی/ ناوکی کرد، دەنکی کرد.

ناوَی: عادی/ بەربەرەکانی کرد، دژایەتی کرد.

نَوی: بُعْد/ دوری.

– : ما یُقصِدُهُ المسافر/ جیٚمەبەست، ئەو شوێنەی گەشتیار بۆی ئەچێ، مەبەستێتی.

نَواة: عَجْمَة. حَبَّة/ دەنك، ناوك، ئەتۆم.

نَوَوِی: ذو نواة/ ناوك دار.

القنبلة النووية: الذريه/ بۆمبای ئەتۆم.

غشاء – / ئەتەمی ناوکدار.

إنتواء: عقد النِیَّة/ بریاردان.

نِیَّة: عَزم/ نیاز، بریار.

– : قصد/ مەبەست، ئامانج، ئارەزو، خواز.

حُسْن الـ – : سلامة القصد/ (مەبەست، نیازی)ی پاك.

سوء الـ – : سوء القصد/ مەبەست، نیاز)ی خراپ.

سليم الـ – : مخلص الطوِیَّة. بسیط/ دڵسۆز، چاك خواز، نیاز دروست، ساویلکە، نیاز پاك.

سلامة الـ – : إخلاص. صدق/ راستی، راست گۆیی، دڵپاکی.

بسلامة الـ – / بە (مەبەست، نیاز)ی پاك.

بسوء الـ – / بە (مەبەست، نیاز)ی خراپ.

عَقَد الـ – علی عَزَمَ. نَوَی/ بریاریدا، مەبەستی بو، نیازی کرد.

علی نیاتِه: سلیم النِیَّة. ساذج/ ساویلکە، دڵپاك، بێمەبەست.

نيء:

ناءَ: لم یَنضَج/ ناکام بو، کاڵ بو، پێنەگەیو بو.

نِیءٌ. نَیٌّ: لم یُطبَخ/ کاڵ، نەکوڵاو.

– . – : ناقِص النُضج/ کاڵ، کاڵ و کرچ، پێنەگەییو، سەوز.

– . – : فَجّ/ تفت.

نیب:

نَیَّبَ: عَضّ بالأنیاب/ کەڵبەی لێ گیر کرد.

ناب: السِنّ خلف الرباعِیَّة/ کەڵبە.

– الفیل و الخنزیر/ (کەڵبەی، شفرە)ی فیل و بەراز.

کَشَّرَ عن انیابه/ دانی جیڕ کردەوە.

نیزك (فی نزك) نیف (فی نوف)

نیکوتین/ ژارقەندە.

نیس:

نیسان: الشهر الرابع المیلادی/ گوڵان، بانەمەڕ.

نیل:

نالَ مطلوبَهُ: اصابَهُ. حصل علیه/ دەستی کەوت، بە مەرامی خۆی گەیشت.

– : ادرك/ پێی گەیی، دەستی کەوت.

– : رَبِحَ/ بردیەوە، قازانجی کرد، پەیدای کرد، پێیگەیشت.

– منه: اَثَّرَ/ کاری تێ کرد، هەستی جوڵان.

– جائزة/ خەڵاتی وەرگرت، خەڵات کرا.

– من عرضِه: سَبَّهُ/ جنێوی پێدا، ئابڕوی برد، شکانی.

– رضاه/ لێی رازی بو.

– . أنال: جعله ینال/ بەدەستی گەیان، پێیدا.

– . – : اعطی/ دایە، پێیدا.

نائل: الذی ینال/ وەرگر.

– : معروف/ چاکە، پیاوەتی.

مَنال. نَیْل: إحراز/ دەست (کەوتن، گیربون).

نیل. نِیلَة: صباغ ازرق/ چویت، خم، خوم.

نَیلی: بلون النیل/ چویتی، خمی، خومی.

نَیْلَج. نورر. نَؤور. سخام/ دوکەڵی پیوو بەز، هێس

هـ

هناك، هنالك )في هنا( ... هجرة

هجرة. هجرة. مهاجر. مهاجر

هؤلاء. هجرة. مهاجرة

هلهل ... هوارة. هواري

ها بمعنى خُذ/ هانێ، بگره.

هؤلاء/ ئەوان.

هائل (في هول) هائم (في هيم) هاب (في هيب) هاجَ (في هيج) هاجّ (في هجو) هاجِر (في هجر) هاجس (في هجس) هاجم (في هجم) هاد (في هدی) هاديء (في هدأ) هاله (في هول) هام )(في هيم) هامّة (في هم) هان (في هون) هاود (في هود) هاوية (في هوی)

هب:

هَبَّ من نومه: إنتبه و إستيقظ/ راپەڕی، هەڵسا.

– يفعَلَ كذا: إبتدا/ دەستی پێکرد، دەستیپێدایە.

– للحَرب: تَسلّح/ چەکی هەڵگرت، خۆی بۆ جەنگ (ئامادە کرد، چەك دارکرد).

– في الحرب: إنهزم/ شکا، بەزی، رایکرد، هەڵهات.

– ت الريح: ثارَت/ با هەڵی کرد.

– ت النار: إتّقَدَت/ ئاگر کڵپەی کرد، کڵپەی سەند، داگیرسا.

– الرجُلُ: غاب مُدّةً من الزمان/ ماوەیەك ون بوو، دیارنەبوو.

هَبّبَ الثوبَ: مزّقَهُ/ دڕانی، شڕی کرد.

مُتأهّب: مُستَعد/ ئامادە، لەسەرپێ، لەسەر تێز.

تهَبّب: بَلِيَ. تَقَطَّعَ/ دڕا، کۆن بو، شڕ بو.

هَبّة ريح: حركة و لَفحَة ريح/ با هاتن، کزەی با، سروە.

هُبوب الريح/ با هەڵ کردن.

هَبوب: ريح مُثير للغُبرَة/ بای خۆڵاوی، گێژەڵوکە، سەبون.

مَهَبّ الريح: موضع هُبوب الريح/ ئەو جێیەی بای لێوە دێ.

هَبّ: لِنَفرِض/ با بڵێین، ئەقا، ئەقو، وادابنێین.

هَباب: غبار ناعم/ تەپ و تۆز، خۆڵە وردە.

هَباب الدُخان: كَتَن/ تەن، مێس، تەنیی.

– المصباح: سُخام. سِناج/ رەشی و دوکەڵی چرا.

هباء (في هبو)

هبت:

هَبَتَ: ضَرَبَ/ لێی دا، کوتای، دای پلۆسی.

– : حَطّ من قدره و ذلّهُ/ سوکی کرد، لە نرخی کەم کردەوە.

هُبِتَ: كان جباناً ذاهب العقل/ ترسنۆك بو، کەودەن بو.

هَبيت: عبيط/ کەودەن، گەوج، گەلۆر، گەمژە، گەلحۆ.

– : جَبان/ ترسنۆك.

هبر:

هَبَرَ اللَحم: قَطَعَهُ قطعاً كبيرة/ کوت کوتی کرد، پل پلی کرد.

٥

هَبْر: لَحمٌ/ گۆشت، کوتە گۆشت.

— : لحم بلا عظم/ نەرمە، پلەگۆشت، گۆشتی بێ ئێسقان.

هَبْرَة: قطعة لحم/ گرتکە گۆشت، نەرمە.

هَبِر. اَهْبَر: كثير اللحم/ گۆشتن، قەڵەو.

هِبْرِيَة. هُبارِيَة: قِشْرَة الراس/ کرێش، کرێشە سەر.

ريح هُبارِيَّة: ذات غُبار/ بای تۆزو خۆڵاوی، گێژەڵوکە.

هُبَيْرَة: ضَبُع/ کەمتیار.

ابو — : ذكر الضِفْدَع/ نێرە بۆق.

ام — : انثى الضِفْدَع/ مابۆق، مێچکە بۆق.

هَبور: عنكبوت/ جاڵجاڵۆکە.

هبش:

هَبَش. هَبَّش: جمع/ کۆی کردەوە، گردی کردەوە.

— : جَرَش/ کرەی کرد.

هَبّاش: كثير الكسب و الجمع/ زۆری دەست ئەکەوێ و کۆی ئەکاتەوە، ئەماشێتەوە.

هَبّاشَة: ماكنة الجرش/ کرەکەر، هاڕەر، مەکینەی کرە.

هبط:

هَبَطَ: نَزَلَ/ هاتە خوارێ، دابەزی.

— من موقع الى آخر: إنتقل/ گواستیەوە.

— : سَقَطَ/ کەوت، کەوتە خوارێ، ڕوخا، ڕما.

— قلبهُ: خارَ. وَهَنَ/ دڵی داخورپا.

— الثمنُ: خَفَضَ/ نرخ داشکا، هەرزان بو.

— الى الارض: وقع/ کەوت، بە زەویدا.

— السقفُ: سقط/ ڕوخا، تەپی، ڕۆچو، داکەوت.

— ت الطائرةُ او الطَيّارَة: نزلت/ نیشتەوە، هاتەخوارێ.

— المرضُ جسمه: هزله/ لاوازی کرد، لەڕی کرد.

— المكانَ: اتاه/ بۆی هات.

— . اَهْبَطَ: انزل/ دایبەزان، هێنایە خوارێ.

— . — الثَمَنَ: خَفَّضَهُ/ نرخی داشکان، کەمی کردەوە.

— ـهُ الزمان: ذَهَبَ ماله و معروفه/ سەروماڵی تیاچو، ڕۆژگار نابوتی کرد، تێشکا، هیچی نەما.

هَبْط. إهباط: تنزيل/ کەم بونەوە، دابەزین داشکان.

— : نُقصان/ کەم بونەوە.

— : ذُلّ/ کەم و کوڕی، ڕسوایی.

هَبْطَة: سَقطة/ کەوتنێك، کەوتنە خوارەوەیەك.

— : نَزلَة/ دابەزین، هاتنەخوار.

— : وَهْدَة/ چاڵ، نزمایی.

— قلب: فزع/ داخوریان، داچڵەکین.

هُبوط: نزول او سقوط/ دابەزین، کەوتن، هاتنەخوار، نزم بونەوە.

— : خَسْف/ تەپین، نەوین، ڕۆچون، داکەوتن.

— : تناقُص/ بەرەو کەمی چون، کەم کردن، کەم بونەوە، کورت هێنان.

— الاسعار: تدهور. كساد/ بێبازاڕی، نرخ داشکان.

— صِحّي: هُزال. إنحطاط عام/ لەش تێك چون، ڕوخان، لاوازی، تێشکان.

هَبوط: مُنْحَدَر/ سەرەوخوارە، لێژی.

هبيط. مهبوط: المهزول الضامر/ لەڕ، لاواز، لەڕو لاواز.

هابِط: نازِل/ دابەزیو، تێشکاو، کەوتو.

مَهْبَط: موضع الهُبوط/ شوێن (دابەزین، نیشتنەوە).

— الطائرات: مطار/ فڕۆکەخانە.

— (کهرباء)/ نزمەك.

اشعة الـ — / تیشکی نزمەك.

هبل:

هَبَّل. تهبَّل. إهتبل لعيا له: تكسَّبَ/ پەیدای کرد، ڕەنجی دا، دەستیکەوت.

— . هَبَلَ. إذْهَبَ عقله/ (گێل، گەمژە، گەوج، کەڕ)ی کرد.

— الطبْخَ: طَبَخَهُ بالبُخار/ بە هەڵم کوڵانی.

إهْتَبَلَ الفُرْصَةَ: إنتهزها/ دەرفەتی هێنا، هەلی (بەکارهێنا، لەکیس نەدا).

تَهَبَّلَ بالبُخار: مَطبوخ بالبُخار/ بە هەڵم کوڵاو.

هابِل: كاسِب/ کاسب، تێکۆشەر، پەیداکار.

— : كثير اللحم و الشحم/ گۆشتن، قەڵەو، کەتە، شیشمان.

— : مُحتال/ فێڵباز، گزیکار، تەڵەکەباز، ساختەچی.

مُهَبَّل: لحيم. مُوَرَّم الوجه/ تەڵەوی گوپن.

هِبِل. هِبَل: رجل طويل/ بالابەرز، درێژ، چەڵاك.

— . — : مُحتال/ فێڵباز، درێژ، چەڵاك.

هَبَل: شان/ کاروبار، مەبەست.

– : بَلِهَ/ گەوجی، گەوەنی، گێژی، گەلحۆیی.
هَبّال: الكاسب المُحتال/ كاسبی دەست بڕو ساختەچی، فێڵ باز، گزی كار.
هَبَلَة: بُخار/ هەڵم.
اهْبَل. هبيل. مَهْبول: ابله/ گەوج، كەودەن، گێژ، حەپۆلە، گەلحۆ، گەمژە.
مِهْبَل: خفيف/ سوك.
مَهْبِل المرأة: مسلك الرحم/ زێ، بۆریچەی منداڵدان، گولنك.
هِبَة (فی وهب)
هَبو:
هَبا الغُبارُ: سَطَعَ/ روناكی كردەوە، رون بوەوە، خۆڵ نەما.
هَباء: غُبار/ تۆز، خۆڵ، تەپ و تۆز.
ذَهَبَ – منثورا/ بە فیڕۆ ڕۆی، بەتەپن ڕۆی.
هَباءَة: ذرّة تُراب/ وردەخۆڵ.
هت:
هَتَّ الرجل: حَطَّ من قدره/ سوكی كرد، لە نرخی كەم كردەوە.
– هُ بكذا: عَيَّرَهُ/ سەرزەنشتی كرد، شكاندی.
هَتْهَتَ الشيءَ: كَسَرَهُ/ شكاندی.
– فی الكلام: اسرع/ بە پەلە قسەی كرد.
هَتْهات: سريع الكلام/ خێرا قسەكەر، بە پەلە قسە ئەكا.
هتر:
هَتَرَ الكِبَرُ فُلاناً: افْقَدَ عقله/ پیری خەڵەفانی، خەڵەفا.
– : مَزَّق/ درانی، شری كرد.
– : هَتَّرَ عَرْض فُلان: مَزَّقَه/ ئابڕوی برد، سوكی كرد.
هاتَرَ: شاتَم. سَبَّ بالقبيح/ قسەی ناشیرینی وت، جنێوی‌دا.
اهْتَرَ. اُهْتِرَ الرجُلُ: خَرِفَ/ خەڵەفا، تێك چو.
– . – : هَذَى/ بزركانی.
إستَهْتَرَ: إتَّبعَ هواه/ بێئابڕویی كرد.
– بالأمر: إستَخَفَّ بِه/ گەمەی بەكارەكە هات، گاڵتەی پێهات.
تهاتَرَ الرَّجُلان: إدّعى كل على صاحبه باطِلاً/ گێچەڵیان لەیەك ئاڵاند، گەریان بەیەكتری كرد.
– ت الشهادات: تَعارَضَت/ هەریەكە شتێكی وت، گەواهی درۆ درا.
هَتْر: خَرَف/ خەڵەفان، خەڵەفاوی.
مُهْتَر: خَرِف/ خەڵەفاو.
– : هاذِ/ ئەبزركێنێ.
هِتْر: السقط من الكلام/ قسەی (قۆڕو ناشیرین، بێمانا).
– : كَذِب/ درۆ، درۆو دەلەسە، دەلەسە.
مُهاتَرَة: مَشادَّة/ دەم قاڵێ.
– : مشاتَمَة. مُشاحَنَة/ شەرە جنێو.
مُسْتَهْتَر بالشيء: مولع/ شەیدا، حەزی لێئەكا، هەر ئەوەی ئەوێ.
– : كثير الأباطيل/ درۆزن.
مُستهتر: طائش/ كەمتەرخەم، گاڵتەچی، لاقرتێكەر، بێئابڕو.
استهتار: استخفاف. اتباع الهوى/ بێئابڕوی، كەمتەرخەمی، گاڵتە پێهاتن، خەرنار.
هتف:
هَتَفَ: صاح/ قیژاندی، هاواری كرد.
– الحمامُ: صاتَ/ گمانی، خوێندی.
– بِه: ناداه/ بانگی كرد.
– به او بذكره. مَدَحَهُ/ هەڵیدا، پیاهەڵدا، هەڵێنا.
هُتاف: صِياح. صُياح/ بانگەواز، هاوار، قیژە.
– الإستحسان/ ئافەرین كردن، پەسەندكردن.
– الفرح و السرور/ هاواری خۆشی.
هاتِف: صائح/ بانگ كەر.
– : تلفون/ تەلەفۆن.
هتك:
هَتَكَ. هَتَّكَ السِتْرَ و غَيْرَهُ: خَرَقَه. شَقَّهُ/ پەتی پچڕان.
– : جَرَّسَ بِه. فَضَحَهُ/ ئابڕوی برد، ئاوبانگی زڕان، ئەتكی كرد، ناموسی شكان.
– سِتْرَة: فَضَحَ مساوِئَهُ/ راستی لێوت، جاڕی لێدا.
– ستره: جَلَب عليه العار/ نوشوستی بەسەردا هێنا.
– عرض إمرأة: إغْتَصَبَ إمرأة/ بەزۆر لاقەی ئافرەتی كرد، كاری ناڕەوای لەگەڵ كرد.
تَهَتَّكَ. إنْهَتَكَ: تَمَزَّقَ/ درا، شڕ بو.

٥

— . — : إفْتَضَحَ/ ئابروی چو، ئاشکرابو، زڕا، ریسوا بو، شکا.

— . — : إنْكَشَفَ/ دەرکەوت، پێزانرا، ئاشکرابو.

هَتْك او هتكة السِتر: إفشاء/ دەرخستن، ئاشکراکردن.

— العِرض (عَرْض إمرأة): إغتصابها/ ئەتك کردن، نافەك برین، گاینی ئافرەت، لاقەی ئافرەت کردن.

هتيكة: فَضيحَة/ نەنگی، ئابروچون، نەتورە، ریسوایی.

تَهَتُّك: عدم حياء/ بێئابرویەتی.

— : تَمَزُّق. تَقَطُّع/ دڕان، شڕبون، شڕوویبون.

مُتَهَتِّك. مُستَهْتِك: قليل الحياء. صفيق/ بێئابرو، بێشەرم.

هتم:

هَتَمَ. اهْتَمَ الرجلَ: كَسَرَ مقدم اسنانه/ دانەکانی پێشەوەی شکان، دانی کەل کرد.

تَهَتَّمَ الشيءُ تَكَسَّرَ/ شکا.

— ت اسنانه: تَكَسَّرَت/ دانی شکا، کەل بو.

هَتِمَ الرجُلُ: كان اهْتَم: إنكسرت ثناياه/ دانەکانی پێشەوەی شکا.

اهْتَم: اثرم. سقطت ثناياه/ دان (شکاو، کەل، کەل و کرم).

— : أدرد. لا أسنان له/ بێدان، دەم پوچەڵ.

هُتامَة: كِسرَة/ تەڵەزم، پارچە، کەرت.

هتن:

هَتَنَت. تهاتَنَت السماء: تتابع مطرها/ بارانی زۆر باری، خۆشی نەکردەوە.

هَتْن: مطر مُتتابع/ لێزمە، خورەم، بارانی لێزمەو درێژە پێداو.

هَتون. هاتِن. هَتّان: غزير/ بارانی بەتاو، زۆر، لێزمە، شەست.

هج:

هَجَّت النار: إتَّقَدَت. أجَّتَ/ داگیرسا، کلپەی کرد، بڵێسەی سەند.

هَجَّ: هَرَبَ/ رای کرد، هەڵهات، بۆی دەرچو.

هَجَّجَ النارَ: أشعَلَها/ دایگیرسان.

— ت عيونه: غارَت/ چاوی بە قوڵاو چو.

هَجأ:

هَجَأ جوعُهُ: سَكَنَ و ذهب/ برسێتیەکەی نەما، تێر بو.

اهْجَأ جوعَهُ: سَكَّنَهُ/ برسێتیەکەی نەهێشت، تێری کرد.

تَهَجَّأ الكلمة (راجع هجو)/ حینجەی کرد.

هجر:

هَجَرَ الشيءَ: تَرَكَهُ و اعرض عنه/ وازی لێهێنا، دەستی لێ هەڵگرت، لێی دورکەوتەوە، بەجێی هێشت.

— زوجته: إعتزل عنها و لم يطلقها/ لەژنەکەی جیابوەوە.

هَجَّرَ القوم: رَحَّلَهم/ ئاوارەی کردن، دەری کردن، دەربەدەری کردن.

هاجَرَ من البلد: رَحَلَ عن وطنه/ کۆچی کرد، وڵاتی بەجێهێشت، دورکەوتەوە.

اهْجَرَ: تَرَكَ/ بەجێی هێشت، رۆیشت.

— : تكلم بالهذيان/ وڕێنەی کرد، بزرکانی.

تهاجَروا: تقاطعوا/ وازیان لە یەکتری هێنا، لێك جیابونەوە، لێك زویر بون.

هَجْر: تَرك/ وازلێهێنان، دەست لێهەڵگرتن، بەجێهێشتن، کۆچ کردن، رەوکردن.

— . هجيرة. هاجِرَة: نصف النهار/ نیوەڕۆ.

— . — . — : شِدَّة الحَرّ/ قرچەی گەرما.

هِجْرَة. هُجْرَة. مُهاجَرَة: ترك المكان. الخروج من أرض الى اخرى/ رەو، کۆچ کردن، وڵات بەجێهێشن، رەوکردن دەبەدەربون، رەهەندبون، ئاوارەیی.

الـ — النبوية: هجرة النبي من مكَّة الى مدينة/ کۆچی پێغەمبەر لە ساڵی ٦٢٢ی زایین.

السنة الهجريه/ ساڵی کۆچی.

الـ — الجماعة/ کۆرەو.

موسم الـ — / وەرزی ئیلاخان.

مَهْجَر: موضع الهجرة/ شوێن کۆچ، شوێنی بۆچون، رەوگە.

مَهْجور: متروك/ بەجێهێڵراو، واز لێهێنراو، دەست لێهەڵگیراو.

— : بَطُلَ إستعماله/ کۆن، دێرین، بەکار ناهێنرێ.

مُهاجِر: راحِل. نازِح/ کۆچ کردو، ئاوارە، لانەواز، دەربەدەر، رەهەند، رەوکردو، کۆچەر، رەوەند.

مُهاجَرَة: نزوح. تَغَرُّب عن الأوطان/ ئـاوارەبون، كـۆچ كردن.
هُجْر. هَجْراء. هاجِرَة: كلام قَبيح/ قسەی (قۆڕ، ناشيرين، سوك).
هـاجِرِي: مختصّ: بنِصف النهار/ پەيوەنـدی دار بـە نيوەڕۆوە.
- : حَسَن. جَيِّد/ باش، چاك، ناياب.
- : حَضَري/ شاری، شارنشين، شارستانی.
هجس:
هَجَسَ الشيءُ فی صَدره: خَطَر بباله/ هـات بـه بيريا، بيری كەوتەوە.
هَجَّسَ فی كلامه: هَذِیَ/ بە سرپە قـسەی كـرد، بزركـانی، چرپەچرپی بو.
هَجْس: كلام تسمعه و لاتفهمه/ قسەی سرپە، چرپە.
- . هاجِس: خاطِر/ بير، را.
هاجِس: بلبال. قَلَق/ پشێو، شپرزە، شڵەژاو.
- : خالِج. ريبة/ گومان، مەترسی.
هواجِس. مَخاوِف/ مەترسی.
الأستغراق فی الهواجس: أحلام اليقظة/ خـەيالْ پـلاو، دالغه لێدان.
هجع:
هَجَعَ: نام/ نوست، خەوت، راكشا.
- : إستَكَنَ/ كپ بو، كرِ بـووە، هـێمن بـووە، هێـواش بووه، هاتەوه هۆش خۆی، ئارامی گرت، سرەوت.
- . اهجع الجوعَ و غيره: سَكَّنَهُ/ برسيەتی نەهێشت، دای مركاندەوە.
- . - : هَدَّأَ/ هێواشی كردەوە، هێمنی كردەوە.
هُجُوم: نَوْم/ نوستن، خەوتن، راكشان.
- : همود. سكون/ بێدەنگی، هێمنی، سرەوتن، كپی، كری، ئارام.
هاجع: راقد/ پالْ كەوتو، راكشاو، نوستو.
هجم:
هَجَمَ على. هاجَمَ: إنْقَضَّ/ پەلاماريدا، زۆری بۆ برد.
- علـى و هـاجم المدينـة: حمـل عليهـا/ هێرشـی بردەسەر، هورووژمی بردەسەر.
- على: دَخَل بغير إذن/ خۆی پياكرد.
- الشتاء: أسرع دخوله/ زستان كوت و پڕ هات.
هَجَّمَ. أهجم: جعله يَهْجم/ پەلاماری پێدا.
تَهاجما: هَجَمَ أحدهما على الآخر/ پەلاماری يەكتريان دا، هێرشيان بردەسەر يەك.
تَهَجَّم على الشيء: تَكَلَّف االهجوم عليه/ هێرشـی بـردە سەر، پەلاماری دا.
إنْهَجَمَ. هَجَمَ البيت: إنْهَدَمَ/ روخا، وێران بو، كاول بو.
- الدمعُ: سال/ فرمێسك (رژا، هاتەخواری).
- الرَّجُلُ: هَرِمَ. ظَهَرَ عليه الضعف و الكبر/ پـير بـو، پەكی كەوت.
هَجْمَـة. هجـوم: حَمْلَـة. غـارَةَ/ پـــەلامار، هێـــرش، زۆر بۆهێنان.
- الشتاء: إشتداد برده/ سەرماو سۆڵەی زستان.
هجوم. مُهاجَمَة: غارَة. حَمْلَة/ پەلاماردان، هێرش بـردن، هەڵمەت، هورووژم، نيشتنەسەر.
مُهاجِم: ضد مُدافع/ پەلاماردەر، هێرش بەر.
هَجوم: ريح شديدة/ رەشەبا.
- : مُعَرِّق/ ئارەق كەرەوە.
هَجّام: شُجاع/ ئازا، بەغيرەت، چاونەترس.
- : اسد/ شێر.
مَهجوم: البيت إذا وقَعَ/ روخاو، وێران، كاول بو.
هجن:
هَجُنَ: كان هجينا/ دورەگ بو، دو توخم بو.
- : كان فيه عيب/ خەوشدار بو، ناتەواو بو.
هَجَّنَ: جعله هجيناً/ دورەگی كرد، دو توخمی كرد.
- الأمْرَ: قَبَّحَهُ عابَهُ/ خەوشداری كرد، خراپی كرد.
إستَهْجَنَ: إستَقْبَحَ/ پەسـەندی نـەكرد، قايـل نـەبو، بـەدڵی نەبو.
هُجْنَة: عَيْـب/ خـەوش، ناتـەواوی، عـەيب، نـەنگی، نـام و نەنگی.
- : ضياع/ ون كردن، بيرچون.
هَجين: لئيم/ ترۆ، چەپخون.
- : غير أصيل/ نارەسەن، توخم خراپ.
- : مختلط الابوين/ دورەگ.
- . هجان: جَمَل سريع/ وشتری خۆش (رەوت، بەن).

هِجان من كل شيء: خيارهُ و خالصه/ رەسەن، باش، چاك.
إسْتِهجان: إستنكار. عدم استحسان و موافقة/ پەسەند نەكردن، نەویستن.
مُسْتَهْجَن: مرفوض. مُستنكر/ پەسەند نەكراو، نەویستراو.
تهجين: خلط. تخليط/ دورەگ (بون، كردن، كاری).
هجو:
هَجاهُ: عَدَّدَ معايبه و وقع فيه و شَتَمَهُ/ زەمی كرد، قسەی پێوت، بەخراپ لێی خوێند.
— بقصيدة/ بەهۆنراوە قسەی پێوت و زەمی كرد، هەجوی كرد.
هجا. هَجّى. تَهَجّى الحروف: عَدَّدَها/ (حینجە-حونجە)ی كرد.
هَجو. هِجاء. ذِكر المعايب/ زەم كردن، قسە پێوتن، هەجو.
— على بالنشر/ زەم كردن بە نوسین، لێنوسین.
هاجٍ: الذي يَهْجُو/ زەم كەر.
— بالنَّشر/ لێنوس.
اهْجُوَّة. اهْجِيَّة: طعن. قذف/ قسەپێوتن، گاڵتە پێكردن، تێز پێكردن.
هِجاء. تَهَجٍّ. تَهْجِيَة/ حینجە كردن، حینجە.
حروف الـ — / ئەلف و بێ، لە ئەلفەوە تا یێ.
علم الـ — : علم الحروف و الإملاء/ نوسین زانی.
هد:
هَدَّ: هَدَمَ/ روخانی، وێرانی كرد، كاولی كرد.
— : ضَعْضَعَ/ شلۆقی كرد.
— : كَسَرَ/ شكانی.
— : صات عند وقوعه/ گرمەی ( كرد، هات).
— صحته: اضعف/ لاوازی كرد، تێكی شكان.
— قُوَّتَهُ: حَطَّمها/ پەكی خست، هێزی لێبڕی، لە پەل و پۆی خست.
— : فَكَّ/ بەریدا، بەرەڵای كرد، كردیەوە.
— ته المصيبة: اضعفته/ لە پەل و پۆی خست، پرزەی بڕی، پەرێشانی كرد.
إنْهَدَّ: إنْهَدَمَ/ روخا، داروخا، وێران بو، كاول بو.
— ت صحته او قواه: تحطمت/ تەندروستی خراپ بو، پەكی كەوت، هێزی تیانەما، لە پەل و پۆ كەوت.
هَدَّدَ. تَهَدَّدَ: تَوَعَّدَ/ هەڕەشەی كرد.
— : خَوَّفَ/ ترسانی.
هَدٌّ. هَدَد: هَدْم/ روخاندن، روخان، داروخان، وێران كردن، كاول كردن.
— . هَدَّة: صوت السقوط/ گرمە، تەپە، گرمەو تەپەی كەوتن و شكاندن.
— : كَسْر/ شكان، شكاندن.
هَدَّة. وَقْعَة لها صوت غليظ/ گرمە، تەپە، هارە.
تَهْديد. تَهَدُّد: تَوَعُّد/ هەڕەشەكردن، گوڕەشە كردن.
— . — : إرهاب/ مەترسی، مەترسی خستنەوە.
— : وَعيد/ هەڕەشە، هەڕەشەو گوڕەشە.
مُهَدَّد: عليه تهديد/ جێمەترسی، هەڕەشە لێكراو، گوڕەشە لێكراو.
مُهَدِّد: مُتَوَعِّد/ هەڕەشەكەر، مەترسی هێن، گوڕەشەكار.
تهديدي: وَعيدي/ هەڕەشاوی، گوڕەشاوی.
هداد: رفق و تأنٍ/ هێواشی، لەسەرخۆ، شێنەیی.
هَداديك: مَهْلاً/ لەسەرخۆبە، هێواش بە، بە شێنەیی بە.
هَدْهَدَ الطفلَ: هَزَّه لينام/ رای ژەن.
— الشيءَ من عُلو الى اسفل: أنْزَلَهُ وحَدَّرَهُ/ گلی كردەوە، خلی كردەوە، تلۆری كردەوە.
هُدْهُد. هُداهِد: طائر/ پەپو، پەپوسلێمانە.
هدا:
هَدَأَ. هَدا. سَكَنَ/ هاتە سەرخۆی، خاو بوەوە، هێمن بوەوە، هێواش بوەوە، نیشتەوە، ژێربوەوە.
— بالمكان: اقام/ جێگیر بو، نیشتەنی بو.
هَدَّأَ. اهْدَأَ: سَكَّنَ/ هێمنی كردەوە، هێواشی كردەوە، كەمی كردەوە، دابینی كرد، ژێری كردەوە، هێنایەوە سەرخۆی، دایمركانەوە.
— . — السُرْعَةَ/ خاوی كردەوە، هێواشی كردەوە.
— . — خاطِرَهُ: سكن و طَيَّبَ خاطره/ دڵی هێنایەوە، هێمنی كردەوە.
— روعة: سكَّنَهُ/ هێنایەوە سەرخۆ.
— الطفلَ. رَبَّتَهُ/ ژێری كردەوە، بێدەنگی كرد، نواندی، دایمركان.

هَدِّيء رَوْعَكَ: هَوِّن عليك/ لەسەرخۆبە.

هَدْء. هُدوء: سكُون/ هێمنی، بێدەنگی، کش و ماتی، ئارام گرتن، سرەوتن، دامرکان، داسەکنان.

— . هُدْء: هَزيع من الليل/ بەشێکی شەو.

هُدوء الروع: إتّزان. رَصانة/ لەسەرخۆیی، هێمنی، شێنەیی.

بهدوء: بسكون. بسكوت/ لەسەرخۆ، بەهێمنی، بە بێدەنگ، بە شێنەیی.

هادِيء: ساكن: ساكت/ لەسەرخۆ، هێمن، سەرنەرم، بێدەنگ، ژیر.

المحيط الـ — / ئۆقیانوسی هێمن، زەریای هێمن.

مُهَدِّيء/ هێمن کار.

تَهْدِئَة: تسكين. تسكيت/ هێمن کردنەوە، بێدەنگ کردن، ژیرکردنەوە.

— الروع: تطمين. تأمين/ دڵنیاکردن.

هدب:

هَدَّبَ الثوبَ: جعل لها هُدُباً/ پەراوێزی بۆ کرد.

هَدِبَت العينُ: طال هُدْبها/ برژانگەکانی درێژبون.

— ت الشجرةُ: طالت اغصانها و تَدلَّت/ لقەکانی شۆڕبونەوە.

هُدُب: شعر الجفن/ برژانگ.

— الثوب: خملته/ جێگەو تەختەی قوماش.

— . هُدّاب الثوب: حاشيته/ پەراوێز، دامێن، ریشوە.

هُدّاب. هُدُب: غَبِيّ ثقيل/ گەمژەی قورس، حەپۆلە، گەلحۆ.

هَدِب. أهْدَب. طويل الأهداب/ برژانگ درێژ.

شجرةٌ هَدْباء: متدلية الاغصان/ لق شۆڕ.

هدج:

هَدَجَ: مَشى كالشيخ/ خۆی بەکێش دەکا، پیرانە دەڕوات.

— . إستَهْدَجَ: مَشى في إرتعاش/ ئەلەرزێ، لارولار دەڕوات.

تَهَدَّجَ الصوتُ: تقطع في إرتعاش/ دەنگەکە ئەپچڕێ.

هَوْدَج: مَحْمَل/ کەژاوە، تەختەڕەوان.

مُسْتَهْدِج: مستعجل/ پەلە، بەپەلە، خێرا، گورج.

مُستَهْدَج: إستعجال/ پەلەکردن، خێراکردن، گورج کردن.

هدر:

هَدَرَ الحمامُ: سَجعَ/ خوێندی.

— الدمَ: سفكهُ هَدْراً/ خوێنی بەخۆڕایی ڕژان.

— : زأر. زَمْجَرَ/ نەڕانی، گرمەی هات.

— : غَلی/ کولا، هاتەکوڵ، قوڵپی دا، دەمی کێشا، دەم بو، پێگەیی.

— صحتَهُ: تَلَفَهُ/ تەندروستی دانا، تێك چو.

— مالَهُ: بَدَّدَهُ/ بە فیڕۆیدا، دای لەبەرد.

— الدمُ و الصحةُ و المال: ذهب هَدْراً/ خوێن و تەندروستی و دارایی بە تەڕن چو، سەروماڵ تیاچو.

هَدَر. هَدْر: باطلاً/ بە فیڕۆچو، بەخۆڕایی لە کیس چو، بە تەڕن ڕۆی.

مَهدور: مُبَدَّد/ لە کیس چو، بە فیڕۆ چو.

— الدم/ بە تەڕن ڕۆیو.

دَم — خوێنی ڕژاو، کوشتنی ناڕەوا.

هَدير: صوت/ دەنگ، نرکە، گرمە.

— الأسد/ نەڕەی شێر.

— الرعد/ گرمەی هەور.

— البحر/ ناڵەی دەریا.

هدف:

هَدَفَ. أهْدَفَ. قارَبَ/ نزیك بوەوە.

— . — : قصد/ مەبەستی بو، بۆی چو، ئاراستەی کرد، تێی گرت، پێوەی نا.

استَهْدَفَ: جعله هدفاً/ مەبەستی بو، ئاراستەی کرد، کردی بە ئامانج.

هَدَف: دَريئَة/ نیشانە.

— : غَرَض. مَطْمَح/ مەبەست، بۆچون، ئامانج.

جَعَلَهُ هَدَفاً لكذا/ کردی بە مەبەست و نیشانە.

هَدّاف: ماهِر في الرماية/ دەست ڕاست، نیشانەشکێن، پێکەر.

هادف/ ئامانج گر.

مُستَهدِف لكذا/ مەبەستیتی، بۆی ئەچن.

هدل:

هَدَلَ: ارخى. ارسله الى اسفل/ شۆڕی کردەوە، ڕای هێڵا، دایهێشت.

— الحمام: هَدَرَ/ خوێندی، گمەی هات.

هَدِلَ. تَهَدَّلَ: تَدَلّى و إسترخى/ شۆڕبوەوە، داهێڵرا.

- . – الثوبُ: إسترسل/ داكەوت.

اهْدَلَ. مُهْدَل: مُسترْسِل/ داكەوتو.

– : مُتَدلّ: مُسْتَرْخٍ/ شۆڕەوەبو، راهیلّراو.

شَفَة هَدْلاء مُنْقلِبَة على الذقن/ لچی شۆڕ.

هَديل كثير الشَعْر/ توكن، توك بڕ، قژن.

– : صوت الحمام/ دەنگی کۆتر، گمە.

هدم:

هَدَمَ. هَدَّمَ: ضد بَنى/ روخاندی، هەڵیوەشاند، تێکیدا.

– . – : خَرَّبَ/ وێرانی کرد، کاولی کرد، رمانی.

إنْهَدَمَ. تَهَدَّمَ: إنْهَدَّ/ روخا، تێك چو، هەڵوەشا.

– . – : تَخَّرَبَ/ وێران بو، کاول بو، رما.

هُدِمَ: أصابَهُ الدوار/ گێژ بو، سەری گێژی خوارد.

هَدْم: هَدّ: ضِد بِناء/ روخان، هەڵوەشان، تێك چون، تەپین.

– : تَخْريب/ وێران کردن، کاول کردن، روخاندن، تێك دان، هەڵوەشاندن.

هَدّام: هادِم: مُخَرِّب/ وێران کار، کاول کار، تێك دەر، رمێنەر.

تهديم: تَخْريب/ وێران کردن، روخاندن، کاول کردن، تێك دان، رماندن.

مُتَهَدِّم. مُهَدَّم: مُخَرَّب/ وێران، کاول، تێکدراو، روخاو.

مَهْدَم. مَهدوم/ داروخاو، روخاو، رماو.

هِدْم: ثَوب بال/ جلەکۆن، جلەشڕ.

هُدُوم: ملابس/ پۆشاك، جل، جل و بەرگ.

هُدام: دوار البَحْر/ گێژی دەریا، گەرداو.

هدن:

هَدَنَ: سَكَنَ/ هێمن بووەوە، نیشتەوە، دامرکایەوە، سرەوت، ئارامی گرت.

– : أرضى/ قایلی کرد، بێدەنگی کرد، رازی کرد، دایمرکاندەوە.

هادَنَ: صالح/ رێك کەوت، ئاشت بوەوە.

– : أوقف القتال/ رێك کەوت، جەنگی وەستان.

تهادَنَ القومُ: تصالحوا/ رێك کەوتن، ئاشت بونەوە.

هُدْنَة: هُدُون: سكون/ هێمنی، بێدەنگی، ئارام گرتن، دامرکان، سرەوتن.

– : فترة وقوف و مصالحة/ راوەستان، وچان، پشو، ئاشت بونەوە، رێك کەوتن.

– . هِدانَة. مُهادَنَة: وقف الحرب/ جەنگ راگرتن.

هدي:

هَدَى: أرْشَدَ/ رابەری کرد، رێی نیشاندا.

– : ضد اضَلَّ/ بە رێی راستدا ئەڕۆیشت، رێی راستی گرتبو.

هَداهُ الطريق و الى الطريق و للطريق: بَيَّنَهُ له و عَرَّفَهُ به/ رێگەی راستی پیشاندا، خستیە سەر رێگەی راست.

هَداهُ الله الى الايمان و للايمان: ارشده اليه/ خوا دەروی ئاین و خواپەرستی لێکردەوە، خستیە سەر ئەو رێگەیە.

هَدى. أهدى له و اليه: قَدَّم له و اعطاه/ پێشکەشی کرد، خەلاتی کرد، بۆی نارد، پێیدا.

– . – . إهتدى العروس الى زوجها: زَفّها اليه/ بوکیان گواستەوە، پێشکەش بە مێردەکەی کرا.

هادى. تهادى: تبادلوا الهدايا/ دیارو خەلاتیان دا بە یەکتری.

تَهادى في مشيته: تمايَلَ/ لارۆلا رۆ ئەڕوا، بەم لاولادا ئەکەوێ، لەتر ئەدا، روت ئەدا.

إهتدى الى كذا: عرفه/ ناسییەوە، دۆزیەوە.

– الى الطريق: عرف الطريق/ رێگەکەی زانی، ناسییەوە، دۆزیەوە.

– الى الايمان: طلب الهداية/ هاتە سەر رێگەی ئاین و خواپەرستی.

– : جَدَّد صحيفة حياته/ هۆشی هاتەوە، گەڕایەوە، بیری کردەوە.

إستهدى. تَهَدّى: طلب الارشاد/ بۆ رێگەی راست گەڕا، کەوتە راوێژ.

– : طلب ان يُهدى إليه/ داوای خەلات و بەخششی ئەکرد، ئەیویست بیدرێتێ.

هُدى. هداية: إرشاد/ رابەری راوێژ.

– . – : تجديد او تَجَدُّد القلب/ تازەکردنەوە، دڵ و دەرون و ئاین و باوەڕ تازەکردنەوە، چونە سەر رێی راست و ئاینی پەروەری.

– : ضد ضلال/ رێی روناکی و راست گرتن.

إنه على – : على استقامة/ راستەورێی راستی گرتوە.

على غير – : ضالّ/ ڕێی چەوتی گرتوە، وێڵ، بێئامانج.

إهتداء: الوصول الى الغرض/ گەیشتنە ئامانج.

– من شرّ أو الى الإيمان: رَعْوى/ تۆبەکردن، گەڕانەوە، ڕێی ڕاست گرتن، دەست بەرداری خراپە.

مَهْدِيّ. مُهْدَيء: مُقَدَّم كَهَدِيَّة/ پێشکەش کراو.

– . مُهْتَدِ: ضد ضالّ/ ڕێی ڕاست گرتو.

– . – : تَجَدَّدَ قَلْبُه. مولود من جديد/ تازەوە بو، دڵ و دەروون و باوەڕ و ئایین تازەوە بو، ڕێی ڕاست گرتو.

– . – الى دين أو عقيدة/ ئایین و باوەڕێکی تازەی گرتوە.

هادٍ. مُرْشِد/ ڕابەر.

إهتداء: الوصول الى الغرض/ گەیشتنە مەبەست و ئامانج، ڕێی ڕاست دۆزینەوە.

هَدْيَة. هِدْيَة: طريقة/ ڕێ، ڕێباز، شێواز.

هَدِيَّة: تَقْدِمَة/ دیاری، خەڵات، مژدانە، مزگێنی، پۆیلانە.

إهداء: تقديم/ پێشکەش کردن.

مِهْداء: الذى من عادته أن يهدى/ بدەر.

هذا:

هذا. هذه (و الجمع هؤلاء)/ ئەم، ئەمە.

لهذا السبب/ بەم هۆیەوە، لەبەر.

مع هذا/ لەگەڵ ئەمەشدا.

هذب:

هَذَّبَ. هَذَّبَ الشجر و غيره: قطعه و اصلحه/ هەڵیپاچی، ڕێکیخست.

– . – : طَهَّرَهُ مما يُعَيِّبُه/ خاوێنی کردەوە لە خەوشەکان.

– : صَحَّحَ و قَوَّمَ/ چاکی کرد، چارەی کرد.

– : نَقَّحَ/ بژاری کرد، پیاچووەوە، پوختەی کرد.

– : عَلَّم و اصلح/ فێری کرد، دەرسی دادا.

– الوَلَد: عَلَّمَهُ و رَبَّاه/ پەروەردەی کرد، تەمێی کرد، فێری ڕەوشت و خوی باشی کرد، بەخێوی کرد.

تَهَذَّبَ: تَعَلَّم و تَرَبّى/ پەروەردە بو، فێربو، تەمێ بو، دەرسی وەرگرت.

هَذْب. تَهذيب: إصلاح/ چاك کردن، دەست پیاهێنان، بژارکاری.

– . – : تَنْقِيَة/ خاوێن کردن، بژارکردن، پاك کردنەوە، پوختەکاری.

تَهْذيب: تعليم/ فێرکردن، ڕاهێنان، دەرس دادان.

– : تثقيف. تربية/ پەروەردەکردن، تەمێ کردن، بەخێوکردن، فێرکردنی ڕەوشت و خوی باش.

– : تقويم/ چاك کردن، ڕاست کردنەوە، هەڵپاچین، ڕێك خستن.

– : تَنْقيح/ بژارکردن، پیاچونەوە.

تَهْذيبي: تربوى/ پەروەردەیی، بۆ پەروەردە.

مُهَذَّب. مُتَهَذِّب: مُثَقَّف/ تێگەیشتو، ڕۆشن بیر.

– . – : مُؤَدَّب. مُرَبّى/ پەروەردەکراو، بەتەمێ، وێژیار.

– : مُنَقَّح. مُصَحَّح/ بژارکراو، ڕاست کراوە، ڕێك خراو.

مُهَذِّب: معلم. مدرس. مدرب/ فێرکار، ڕاهێنار، مامۆستا.

هذر:

هَذَرَ: تكلم بما لاينبغى/ چەنەی دا، هەڵەوەڕی کرد، ڕستی.

هَذَّر مَعَ: هَزَلَ/ گاڵتەی کرد، گاڵتەی لەگەڵ کرد.

هَذَر. هَذْر: دَرْدَشَة/ وت و وێژ، گفت و گۆ.

هَذِر. مِهذار: ثرثار/ چەنەباز، زۆرڵێ، هەڵەوەڕ.

هِذار: هَزْل/ گاڵتە، گەپ، گەمە.

هَذْرَمَ: اكثر الكلام/ زۆری وت، قسەی زۆری کرد.

– : أسرع في القراءَة أو الكلام/ گورج دو، خێرابو لە قسەکردن و خوێندنەوەدا.

هذي: هَذَى: تكلم بغير معقول/ بزرکانی، وڕێنەی کرد، ناپەسەند دوا.

هَذْي. هَذَيان. هُذاء: التكلم بغير معقول لمرض و غيره/ وڕێنە، یاوە، وتەی ناپەسەند.

– . – الحُمّى: بُحران/ وڕێنەی تا، بزرکاندن.

هاذٍ: مُهْتَدٍ/ ئەوەی وڕێنە ئەکاو ئەبزرکێنێ، بزرکێنەر، وڕێنەکار.

هر:

هَرَّ الكلبُ: صات دون نباح/ لورانی، لورەی هات.

– القِطُ/ مرانی، میاوانی.

– الدواءُ بَطْنَهُ: أطلقها/ ڕەوانی کرد، سکی شۆڕ کرد، بەلەفیرەی پێ خست.

ه

هِرّ: قط/ پشیله، گوریە، کتك.
هِرَّة: قطّة/ پشیلەی مێ، کتکە مێچکە.
هرير الكلب/ لورەی سەگ.
— القطّ/ (مرەمر، میاوە، مرمیاو)ی پشیلە.
هَرْهَرَ: حرّك/ جولاّنی، بزواندی، لەقاندی.
— عليه: تَعَدّى/ دەست درێژی لێکرد.
هرأ:
هَـرَأَ. هَـرَّأَ. اهـرَأَ اللحـمَ: انْـضَجَهُ كـثيراً/ زۆری كـولان، توانیەوە.
— ـهُ. — ـهُ — ـهُ البردُ: إشْتَدَّ عليـه/ وەختـەبو رەق ببێتەوە لەسەرمانا.
— ت الريحُ: إشْتَدَّ بردها/ زۆر ساردی کرد.
— في الكلام: اكثر القبيحَ و الخَطَأ/ قسەی قۆڕی کرد، زۆر هەڵەی کرد.
— . هَرِئ: مَزَّقَ/ درانی، پوانی، رزانی.
— . — الثوبَ: ابلاه/ کۆنی کرد، هەلاهەلای کرد.
هَرِيءَ. تَهَرَّأ اللحمُ بالطبخ. إهْتَرَى/ زۆرکولا، توایەوە.
— . — : تَمَزَّقَ/ درا، شربو، هەلاهەلابو، شیتاڵ شیتاڵ بو.
— . — : بَلِيَ/ کۆن بو.
هُراء: كلام فارغ/ یاوە، قسەی (قۆڕو بێمانا، هیچ و پوچ).
مُهْتَرِيء بالطبخ: مطبوخ و ناضج/ زۆر کولاو، تواوە.
— : مُمَزَّق/ دراو، شڕ، هەلاهەلا، شیتاڵ شیتاڵ.
— : بالٍ/ کۆن، پەرپوت.
هرب:
هَرَبَ: فَرَّ/ سەری خۆی هەڵگرت، رایکرد، هـەڵهات، بـۆی دەرچو، دەرباز بو، پێی پێوەنا.
— من كذا. افلت و نجا/ رزگاری بو، دەربـاز بـو، قوتـار بو.
— من الجُنْديَّة/ فیراری کرد، هەڵهات، رایکرد.
— من المدرسة او العمل/ خۆی دزیەوە.
هَـرَّبَ. اهْـرَبَ: جعلـه يَهْـرَبُ/ وای لێکـرد رابکـا، دەربـازی کرد.
— : إضطره الى الهرب/ ناچاری کرد رابکا.
— : ساعَدَ علـى الهَـرَبِ/ دەربـازی کـرد، یاریـدەی هـەڵ هاتنی دا.

— الاشياء الممنوعة/ قاچاخی دەرکرد.
تَهَرَّبَ: إنهزم/ رایکرد، دەرکەنار بو، خۆی دزیەوە.
— من واجب او غيره: تَمَلَّصَ/ خۆی لێدزیەوە.
هَرَبٌ. هُرُوب. هَرَبان: فرار/ سەری خۆ هـەڵگرتن، راکـردن، قوتاربون، دەربازبون. هەڵهاتن، پێ‌پێوەنان.
— . — مـن الجنديـة: فـرار/ راکـردن لـە سـەربازی، هەڵهاتن، فیرارکردن.
هارِب. هَرْبان/ راکردو، هەڵهاتو، فیرار.
تهريـب: إضـطرار الغـير الى الهـرب/ دەسـت پێوەنـان، بردن، دەرکردن.
— : تخليص/ رزگارکردن.
— الأشياء الممنوعة/ قاچاخ چێتی، قاچاخ دەرکردن، دزەفرێنی.
مَهْرَب: مَـلاذ. مخلـص/ پـەنا، پەناگـە، حەشار، چـارە، رزگاری.
مُهَرِّب. / قاچاخ چی.
هرج:
هَرَجَ النـاسُ: وَقَعـوا فـي إضـطراب/ کەوتنـە پـشێویەوە، سەریان لێ تێك چو، ئاژاوەیان تێکەوت.
— في الحديث: خلط فيه/ دای بە سـەریەکدا، تێکەڵ و پێکەڵ قسەی کرد.
هَـرَّجَ فـي الحـديث: مَـزَحَ و اتـى بالمضحِك/ کـردی بـە (پێکەنین، گاڵتە).
— بالحيوان: صاح به و زجره/ ورووژانی، چاشی کرد.
هَرْج: فتنة و إختلاط/ ئاژاوە، پشێوی، سەر لێتێك چون.
— و مَرج: ضوضـاء/ ژاوەژاو، غەڵبەغەڵب، هەرا (هەرا، و هوریا).
مُهَرِّج: مُضحِك/ گاڵتەچی، کوچەك، کۆستەبایی.
هَرْجَلَ: إختلط مَشْيُه/ تێکەڵ و پێکەڵ ئەڕۆی.
— : مَشى بخطوات متباعِدَة/ هەنگاوی درێژی ئەنا.
هَرْجَلَة: عَدَم إنتظام/ نارێکی، پشێوی، ئاژاوە.
مُهَرْجَل: غير منتظم/ نارێك، پشێوی، ئاژاوە.
هرس:
هَرَسَ: دَقَّ و سَحَقَ/ کوتایی، تێکی شکان، هـاڕی، وردی کرد.
— . مهك: دَهَكَ/ تێکی شێلا، هەڵیگڵۆفت.

وَطَدَ. وطَدَ: ثَبَّتَ/ قايمی كرد، جێگیری كرد، پتەوی كرد.
— . — : قَوَّیَ/ بەهێزی كرد، قایمی كرد، توندی كرد.
— . — الارض: رَدَمها/ پڕی كردەوە، كوتايەوە.
— . — له: اَعَدَّ و مَهَّدَ/ ئامادەی كرد، ئاسانی كرد.
— . — ثقته فيه: إئتمنه/ باوەڕی پێ قايم بو، زیاتر متمانەی پێ كرد.
— . — عَزْمَهُ علی: عَقَدَ النيَّةَ/ بڕیاریدا، نیازی كرد، مەبەستی بو.
تَوَطَّدَ: تَثَبَّتَ/ قايم بو، جێگیر بو، پتەو بو، بەهێز بو.
وَطِد. مَوْطود: قَوِیّ. ثابت/ قايم، پتەو، جێگیر، بەهێز.
أَوْطاد: جبال/ چیا، شاخ، كێو، كوسار، كەژ.
مِطَدَة. مِنْدالة/ زەوی كوت.
وطر:
وَطَرٌ: بُغْيَة/ ئارەزو، خواست، ویستن، مەرام، مەبەست.
قَضی منه وَطَرَهُ: نال بُغْيَتَه/ بە (خواست، مەرام، مەبەست)ی خۆی گەیشت.
وطس:
وَطَسَ: ضَرَبَ/ لێیدا، كوتای، بە سوڵ لێیدا.
وَطيس: تَنّور/ تەنور.
— : مَعْرَكَة/ جەنگ، بەيەكدادان.
حَمِيَ الـ — إشتدت المعركة/ جەنگ گەرم بو.
وَطّاس: راعي/ شوان، گاوان، رەوگەوان.
وطف:
وَطِفَ: كَثُرَ شَعْرُ حاجِبَيْه/ بڕۆی ئەستور بو.
أَوْطَف: كثير شَعْرُ الحاجب/ بڕۆ ئەستور، سێوەنگ.
وطن:
وَطَنَ بالمكان: اقام/ مایەوە، تیامایەوە، نیشتەجێ بو.
وَطَّنَ. تَوَطَّنَ. إسْتَوْطَنَ بالمكان: إتَّخَذَهُ وطناً/ جێنشین بو، كردی بە نیشتمان، تیانیشتەجێ بو.
— نَفْسَهُ علی الأمر و للأمر: هَيَّأَها/ خۆی بۆ ئامادە كرد.
وَطَن: مَنْزِل إقامة الانسان/ نیشتمان، مەڵبەند، وڵات، زێد.
حُبّ الـ — : وَطَنِيَّة/ نیشتمان پەروەری.
وَطَني: مختص بالوطن/ خۆماڵی، نیشتمانی، شت و مەكی خۆماڵی.
— : إبن البلاد/ دانیشتوانی وڵات، ڕۆڵەی نیشتمان.
— : قومي. اهلي/ نیشتمانی، نەتەوەیی.
— : مُحِبٌّ لوطنه/ نیشتمان پەروەر.
وَطَنِيَّة: قوميَّة/ نیشتمان پەروەریتی، هەستی نەتەوایەتی.
حقوق — / مافی (نیشتمانی، نەتەوایەتی).
حكومة — / حكومەتی نیشتمانی.
مصنوعات — / پیشەسازی خۆماڵی، دروستكراوی خۆماڵی.
نَعْرَة — / هەستی (نەتەوایەتی، نیشتمانی).
إستيطان: إسكان/ نیشتەجێ بون.
توطين إسكان/ نیشتەجێ كردن.
مَوْطِن: مُقام. مَقَرّ/ ماڵ، نیشتمان، شوێن نیشتەنی و ژیان.
— : وَطَن/ نیشتمان.
— : مَرْبَط المواشي/ شوێنی ئاژەڵ.
مواطِن: إبن بلد/ هاوڵاتی.
مُسْتَوْطِن: مُقيم/ دانیشتو، نیشتەنی، نیشتەجێ.
مَرَض — : خاص بمكان او قَوْم/ دەردی ناوخۆیی.
وظب:
وَظَبَ. واظَبَ علی: داوَمَ/ بەردەوام بو، لەسەری ڕۆیی.
واضب علی عمله: ثابر/ كۆڵی نەدا، لەسەر ئیشەكەی بەردەوام بو.
مُواظِب: مُثابر/ كۆڵ نەدەر.
— : مُداوِم/ لەسەر ڕۆیو، بەردەوام.
مُواظَبَة: مُثابَرَة/ كۆڵنەدان، لەسەر ڕۆیین.
وظف:
وَظَّفَ الرجُلَ: وَلّاهُ مَنْصِباً/ دایمەزران، دای‌نا.
— المالَ: ثَمَّرَهُ/ دراوو ماڵی خستە ئیشەوە، هەڵی سوڕان.
تَوَظَّفَ: تَعَيَّنَ/ دامەزرا، دانرا.
وظيفَة: راتِب/ موچە.
— : خدمة/ ئیش، ئیش كردن، كار.
— : مَنْصَب/ پلەو پایە.
— العُضْو: عمله/ كردەوە، فرمان.
أدّى وَظيفَتَهُ/ كاری خۆی بەجێهێنا.
تَوْظيف: تَعْيين/ دامەزراندن، دانان.

و

— المال: تَشغيله/ دراوو مالْ خستنه ئيشەوە، ئيش پێ کردن.

مُوَظَّف: مُعَيَّن/ دامەزراو.

— : عامل/ ئيش کەر، فرمان بەر، کرێکار، کارمەند.

وَظيف الحِصان و امثاله: قَصَبَة يد الحصان/ ئيسقانی لاقی ئەسپ، لولاق.

وعب:

وَعَبَ. أوْعَبَ: إستوعب الشيءَ: أخذه كله/ گرتی، هەموی گرت، جێی تیابوەوە.

أوْعَبَ الشيءَ في الشيء: ادخله فيه/ تێی کرد، تێی خست، تێی ئاخنی، خستیە ناوی.

إسْتَوعَبَ: إسْتَأْصَلَ/ هەڵی کەن، ریشەکێشی کرد، لەبن دەری هێنا.

— الوعاءُ الشيءَ: وَسِعَهُ/ گرتی، جێی تیابوەوە.

— الحديثَ: فَهِمَهُ/ تێیگەیشت، حاڵی بو.

وَعيب: واسع/ فراوان، گەورە.

وعث:

وَعَثَ الطريقُ: تَعَسَّرَ سلوكهُ/ سەخت بو، سەختان بو.

وَعْث: عسير. شاق/ سەخت، گران.

وَعْثاء: مَشَقَّة و تَعَب/ شەکەتی، ئارەحەتی، ماندویەتی.

وعد:

وَعَدَ. أوْعَدَ كذا أوبه: عَهَدَ/ پەیمانی پێدا، بەڵێنی پێدا، گفتی پێدا.

— ت الارضُ: رُجِّيَ خَيْرَها/ زەویەکە پیت و فەڕی لێچاوەروان ئەکرا.

— هُ. أوْعَدَهُ. تَوَعَّدَهُ بِشَرٍّ: تَهَدَّدَهُ/ هەرەشەی لێکرد، شەڕی لێئەبوەوە.

واعَدَهُ. تَواعَدوا: وَعَدَ كل منهما الآخر/ پەیمانیان بەست، بەڵێنیان بەیەکدا.

وَعْد. عِدَة. مَوْعِد. مَوْعِدَة/ پەیمان، بەڵێن، گفت، ژوان.

أخْلَفَ بِوَعْدِه/ پەیمانی شکان.

وَعيد. تَوَعُّد: ما تَهَدَّدَ به/ هەرەشە، هەرەشەو گورەشە.

تَوَعَّد: إيعاد: تَهْديد/ هەرەشەکردن، گورەشەکردن.

واعِد: مُعْطي الوَعْد/ پەیمان دەر، بەڵێن دەر.

— : مُرْجُو المستقبل/ میوای خۆشی، ئومێدەوار.

مَوْعِد. وَعْد: عَهْد/ پەیمان، بەڵێن، ژوان.

— . ميعاد. مُواعَدَة: إتفاق على مُقابَلَة/ شوێن و کاتی ژوان و چاوپێکەوتن.

ميعاد: وقت مُعَيَّن/ کاتی تایبەتی.

— المرأة: حَيْض/ کاتی خوێنی ئافرەت، بێنوێژی، لەخوێنابون.

حَضَرَ في الـ — / لەکاتدا هات، لەکاتی خۆیدا هات.

مُحافظ على المواعيد، مُراعي المواعيد/ بەڵێن راست.

مَوْعود: على وَعْد/ لەسەر ژوان، پەیمان دار.

يوم الـ — : يوم القيامَة/ رۆژی (زیندوبونەوە، حەشر).

وعر:

وَعُرَ. وَعِرَ. وَعَرَ. تَوَعَّرَ: كان وَعْراً/ سەخت بو، رەقان بو.

وَعْر. واعِر. وَعير: يصعب السير فيه/ سەختان، سەخت، رەقان، هەرد، هەردە، هەردە بانان.

وعز:

وَعَزَ. أوعَزَ اليه بكذا: أشارَ/ فەرمانی پێدا، دەستوری پێدا، پێیراگەیاند، پێی وت، گاڵیدا.

إيعاز: إشارة/ فەرمان دان، گاڵ دان، نیشانە بۆ کردن.

مُوعِز: مُشير/ فەرمان دەر، نیشانەکار.

مُوعَز به: مُشار اليه/ ئەوەی وترا، دیاری کراو، نیشانە بۆ کراو.

وعس:

وَعَسَ الدَهْرُ الرَجُلَ: حَنَّكَهُ/ خاراوی کرد، قاڵی کرد.

وَعْس: ميعاس: رَمْل تَغيب فيه الأقدام/ لمی شل کە پێی تێچەقێ.

وعظ:

وَعَظَ: نَصَحَ له/ ئامۆژگاری کرد، پەندی دادا.

— : ألقى موعِظَة/ وتاری ئاینیدا.

إتَّعَظَ: قَبِلَ النَصيحَةَ/ ئامۆژگاری و پەندی وەرگرت، چو بە گوێیدا.

وَعْظ: تبشير/ ئامۆژگاری کردن، دەرس دادان، پەندادان.

عِظَة. مَوعِظَة. وَعْظَة: نَصيحَة/ ئامۆژگاری، پەند.

— . — : ما يُتَّعَظ به/ دەرس، ئەوەی دەرسی لێ وەرئەگیرێ، ئەنجامی پەندو ئامۆژگاری.

مَوْعِظَة: تَبْشير ديني/ ئامۆژگاری ئاینی.

واعظ: الذي يعظ/ ئامۆژگار، فێرکار، ئەو کەسەی ئامۆژگاری ئەکات.

وعك:

وَعَكَ الحَرُّ: إشتَدَّ مع سكون الريح/ گەرمای کرد، تاوی سەند، کپ بو، باکەی خست.

- . تَوَعَّكَ: إنْحَرَفَت صِحَّتَه/ تەندروستی شێوا، لەشی تێك شکا، نەخۆش کەوت، ناساغ بو.

وَعْكَة: إشتداد الحَرِّ مع سكون الريح/ گەرما زۆری، باوەستاو، تاو سەندن، کپ بون.

- . تَوَعُّك المزاج/ نەخۆشی، بێتاقەتی، لەش تێك شکان.

- الحُمَّى: اشتدادها/ گەرمەی تا.

- الأمر: شِدَّته/ نارەحەتی و گرانی کار.

وَعِك. مَوْعوك. مُتَوَعِك: الذي أصابته وعكه/ بێتاقەت، ناساغ، لەش تێك شکاو.

وعل:

وَعِل: نوع من المعز الجبلي/ بزنەکێوی.

وعم:

وَعَمَ: حَيَّا/ سڵاوی کرد.

عِمْ صباحاً: صباح الخير/ بەيانيت باش.

عِمْ مساءً: مساء الخير/ ئێوارەت باش.

وعي:

وَعَى. أوعى الشيءَ: جمعه و حواه/ کۆی کردەوە، گرتی.

- . - الحديثَ: قَبِلَهُ و حَفِظَهُ/ قسەکانی وەرگرت، لەبەری کرد، بە گوێیدا چو، چوە مێشکیەوە.

- الأمْرَ ادْرَكَهُ/ هەستی پێ کرد، تێیگەیشت.

- الأمْرَ: تَذَكَرَهُ/ بیری کەوتەوە.

- أدرك/ فامی کردەوە، هەستی کرد، هۆشی کردەوە، راست و چەپی خۆی ناسی، هەستی جولا.

أوعى. إستوعى الشيء: أخذه كله/ هەموی گرت، جێی هەمەوی تیابوەوە.

- الشيءَ: جعله في وعاء/ کردیە دەفرەوە.

وعِيَ: إنتبه من نومه او غفلته/ خەبەری بوەوە، بێدار بوەوە، ئاگادار بو، هەستی کرد، بەئاگاهات.

وَعَّى من: حَذَّرَ/ ئاگاداری کرد.

تَوَعَّى مِنْهُ: إحترز منه/ خۆی لێپاراست.

إوْعَ: حَذار/ وریابە، ئاگادار بە، ئاگات لەخۆت بێت.

وَعي. إيعاء: إحتواء/ گرتن، جێتیابونەوە.

- : حذر و انتباه/ ئاگاداری، وریایی.

- : إدراك. يقظة/ هەست، هەست کردن، هۆشیاری.

لاوَعي. بِلا وَعي/ بێئاگا، بێهۆش، بێخود.

واعٍ: مُلْتَفت او حريص/ بە تەنگەوە بو.

- : يَقظ/ هەستیار، هۆشیار، بەخەبەر، هۆشمەنگ.

- : مُدْرِك/ ئاگادار، وریا.

وِعاء. وُعاء: إناء/ دەفر، قاپ.

- دَمَوي/ بۆری خوێن، دەزولەی خوێن.

اوعيه: جمع وعاء. اوعيه دموية/ بۆریچەی خوێن، مولولەی خوێن.

اوعية شعرية/ دەزولەی خوێن.

وغد:

وَغْد: احْمَق. ضعيف العَقل/ گێل، گەوج، کەودەن، گەمژە.

- : دَنيء/ خوێڕی، سوك، رسوا، پیاوخراپ، تڕۆ، سەرسەری، سێبەندی.

- : خادم حقير/ نۆکەری خوێڕی و سوك.

وغر:

وَغَرَ. وَغِرَ عليه صَدْرَهُ. تَوَغَر: تَوَقَّدَ غَيْظاً/ تورە بو، لێی بەکوڵ بو، رقی لێهەڵسا، پیشی خواردەوە.

وَغْر. وَغَر: عَداوة/ دوژمنایەتی.

- . - : حقد. ضِغن/ رق، قین، دڵ پیسی.

وَغْرَة: شِدَّة تَوَقُّد الحَرّ/ قرچەی گەرما.

وغل:

وَغَلَ. اوْغَلَ. تَوَغَّل في كذا: دَخَل فيه/ چوە ناوی.

- على القَوْم: اتاهم بلا دَعْوَة/ خۆی تێخست، چوە ناویان بەبێ بانگ کردن.

أوْغَلَ في السير: أسْرَع/ پێی هەڵ گرت، خێرایی کرد.

- في الكلام: بالغ/ زۆری پێوەنا، قسەکەی گەورە کرد.

- ـهُ في كذا: ادخله فيه/ تێی خست، تێی ئاخنی.

واغل، وَغْل. طفيلي/ مشەخۆر، خۆ تێهەڵقوڵتێن، سەرسواڵکەر، هەوانتەچی.

وغي:

وَغْي. وَغَى: جَلَبَة/ قاووقیژ، ژاوەژاو، ئاژاوە.

و

- . - : حَرْب/ جەنگ، بەیەکدادان.

وفد:

وَفَدَ علی او الی: قَدِمَ/ هات، گەیشت.

وَفّدَ. اوْفَدَهُ: ارْسَلَ/ ناردی.

توافدوا علیه: تواردوا/ بەکۆمەڵ چون، بۆی ژون، چون بۆ لای.

وَفْد. نُوّاب مُرسَلون/ نێرراو، نوێنەری نێرراو.

- . وُفود. وِفادَة: قُدوم/ گەیشتن، هاتن.

احْسَنَ وِفادَتَهُ/ پێشوازیەکی گەرمی کرد.

وافِد: قادِم/ هاتو، گەیشتو.

- : رسول. مبعوث/ نێرراو، نوێنەر.

مرض - / درم، پەتا.

النزلة الوافِدَة/ هەلامەت، ئەنفلونزا، پەسیوی.

وفر:

وَفَرَ. وَفُرَ. تَوافَرَ: كَثُرَ. كان وافِراً/ زۆر بو، مشە بو، مایەوە، لێی مایەوە.

وَفّرَ: إقْتَصَدَ/ دەستی گرتەوە.

- : إدَّخَرَ/ كۆی كردەوە، پاشەكەوتی كرد.

- علیـه التعـب/ شـەكەتی و نارەحـەتی نەنایەبـەر، ماندوی نەكرد، نەی هێشت شەكەتی بچێژێ.

تَوَفّرَ علی كذا: صَرَفَ هِمَّتَه/ خۆی بۆ تەرخان كرد.

- ت فیه الشروط/ مەرجەكانی تیابو.

- : لم یُنفَق/ كۆكرایەوە، خەرج نەكرا، هێڵرایەوە.

تَوافَرَ: كان وافِراً/ زۆر بو، فرە بو، لێی مایەوە.

وَفْر: غِنَی/ سامان، فەرو پیت، زۆری، دارایی.

- . توفیر: إقتصاد/ ئابوری، دەست گرتنەوە.

- . - : إدّخار/ كۆكردنەوە، پاشەكەوت كردن.

- : المال المُقْتَصَد/ دراوی كۆكراو، پاشەكەوت كراو.

وَفْرَة: كَثْرَة/ زۆری، فرەیی.

توفیر: تكثیر/ زۆركردن.

- : إقتصاد/ ئابوری، پاشەكەوت كردن، كۆكردنەوە، دەست گرتنەوە.

صندوق الـ - / قاسە، سنوقی پاشەكەوت.

وافِر. مُتوافِر: كثیر/ فرە، زۆر، مشە.

- العَدَد: عَدید/ ژمارەی زۆر، بێشومار.

- المال: غَنِي/ ساماندار، دەوڵەمەند، دارا.

اوْفَر: اكثر/ زۆرتر، فرەتر.

النصیب الـ - / بەشی زۆر.

مُوَفَّر: مُكَثَّر/ زۆر كراو.

- : مُقْتَصَد/ كۆكراوە، پاشەكەوت كراو.

وفض:

وَفْضَة (الجمع وِفاض): وِعاء مِن جلد/ هەمانە، مەشكە، كوندە، جەوەنە.

خالي الوِفاض: فارِغ/ بۆش، بەتاڵ، بەدەستی بەتاڵ، دەست لە كونان درێژتر.

وفق:

وَفِقَ الأمْرُ: كان موافِقاً و صَواباً/ (رەخساو، كونجاو، لەبار، راست) بو.

وفّق الامر: جعله موافقاً/ كونجانی، رەخسانی، پێكی هێنا.

- بین النقیضین/ دوانی جیاوازی یەك خست، رێكی خستن، كونجاننی.

- بین المتخاصمین/ دو كەسی ناكۆكی كونجان، رێكی خستن.

- بینهم: صالَحَهُم/ ئاشتی كردنەوە.

- الله فُلاناً للخیر: ألهَمَهُ/ خوا نایە دڵی، رێی خێرو خۆشی خستەبەر.

وُفِّقَ لكذا: صادَفَهُ و لَقِیَهُ/ دۆزیەوە، دەستی كەوت، بۆی رەخسا.

وافَقَ الشيءُ الرَجُلَ: ناسَبَهُ/ بۆی كونجا، بۆی شیا، بۆی لوا.

- : لائَمَ/ كونجا، بو.

- : طابَقَ/ پر بەپری بو، چون یەك بون.

- . لم یَتَعارَض/ قایل بو، ناڕازی نەبو، رای لەسەر بو، بەرگری نەكرد.

- بین الشیئین. وَفَّقَ/ كونجانی، رێكی خستن.

- ـهُ الثوب/ پریەپری بو، بەقەدەری بو.

- ـهُ الشيء: إستحسَنَهُ/ پەسەندی كرد، پێی قایل بو، بەدڵی بو.

- ـهُ في او علی الأمر: ضد خالَفَهُ/ لەگەڵی بو، لەسەر رای بو.

إتَّفَقَ مع: وافَقَ/ رێك كەوت، پێك هات، لەگەڵی رێك كەوت، تەبابو.

- الرجلان: ضد اختلفا/ پێك هاتن، رێك كەوتن، تەبابون.
- لە كذا: حَصَلَ/ رویدا.
كَيْفَما - : بلا تَرَوٍّ/ هەرچۆ بێ، كوێرانە.
تَوَفَّقَ: نَجَحَ/ سەركەوت.
وَفْق. اُووِفْقاً او وِفاقاً لكذا: طبقاً/ بە گوێرەی، بەپێی، وەكو.
وِفاق. إتِّفاق: ضد خلاف/ رێك كەوتن، رێكی، پێك هاتن، كۆك بون.
إتِّفاق. توافُق: مُطابَقَة/ گونجان، بۆبون، تەبابون، رێك كەوتن.
- : مُصادَفَة/ رێكەوت.
- : عَقد/ پێك هاتن، پەیمان بەستن.
- الآراء: إجماع/ بەكۆمەڵ، بەگشتی، یەك دەنگ.
- . إتِّفاقيَّة: مُعاهَدَة/ پەیمان، تەبایی نامە، رێك كەوتن نامە، گونجان نامە. هاودەنگی.
إتِّفاقاً: مُصادَفَةً/ رێكەوت، بەرێكەوت.
إتفاقي: عَرَضي/ بەرێكەوت، لەخۆیەوە.
- : مُتَّفَقٌ عليه: عُرفي/ نەریتی ئاسایی.
تَوفيق: تكييف/ گونجان.
- : تَسوِيَة. مُصالَحَة/ رێك كەوتن، ناوبژی كردن، رێك خستن، پێك هاتن.
- : نَجاح/ سەركەوتن.
- : يُسْر/ خۆشی، خۆش گوزەرانی، هات.
- : حَظّ/ شانس، بەخت.
مُوَفَّق. مُتَوَفِّق: ناجِح. مُفْلِح/ سەركەوتو، بەختیار.
مُوافِق: مُناسِب/ گونجاو، لەبار، فیت، تەبا، بەجێ.
- : مَقبول/ پەسند، پەسەند، قایل، را لێبون.
مُوافَقَة: قَبول. مُصادَقَة/ پەسەندكردن، قایلی، را (لێبون، لەسەر بون).
- : مُناسَبَة/ گونجاندن.
مُتَّفَق عليه: مَقبول/ پەسەندكراو، لەسەری رێك كەوتو.
- عليه: عُرفي/ باو، ئاسایی، نەریت.
وَفيق: رَفيق/ هاوڕێ، برادەر، هاواڵ.
وفي:
وَفَى. اَوْفَى بالوَعْد: أتَمَّهُ. حافظ عليه/ پەیمانی (بردەسەر، پاراست، نەشكان).

- . - النَّذْرَ: اَبْلَغَهُ/ ئامەكەی بەجێ گەیاند، بردیە سەر، بەجێی هێنا.
- . - الدَّيْنَ: سَدَّدَهُ/ دایەوە، بەجێی هێنا.
- . - بِعَهْدِهِ: أخلص/ دڵسۆز بو، راستگۆ بو، پەیمان راست بو.
- : تَمَّ/ تەواو بو، كۆتایی هات.
اَوْفى. وَفَّى حَقَّهُ: أعطاه إيّاه تاماً/ دایەوە، مافی خۆی بەتەواوی دایەوە، سەرراست بو.
- : أتَمَّ/ تەواوی كرد، كۆتایی پێهێنا، برانیەوە.
وافَى الرَّجُلَ: فاجَأَهُ/ (كوت و پڕ، لەپڕ، لەناكاو) دای بەسەریا، خۆی پیشاندا، دەركەوت.
- فُلاناً حَقَّهُ: وَفَّاهُ/ دایەوە، مافی خۆی دایەوە.
وافاه: أتاه/ چو بۆ لای، سەری دا، هاتە لای.
- القدرُ أو الأجلُ: تَوفّي/ مرد، كۆچی دوای كرد، گیانی دەرچو.
تَوَفَّى. إسْتَوْفَى حَقَّهُ: أخذه كاملاً/ وەری گرتەوە.
تَوَفَّاهُ الله: ماتَ/ مرد، خوالێبردیەوە، سوێی بوەوە.
وَفاء الوَعْد: المحافظة عليه/ پەیمان راستی، سەرراستی.
- الدين: تسديده/ قەرزدانەوە، سەر راستی.
- الشيء: تَمامه/ تەواوكردن، بردنەسەر.
- : حِفظ العَهْد. أمانة/ پەیمان پارێزی، دڵسۆزی، دڵپاكی، بەوەفایی، سفەت.
وَفاءً لكذا. إيفاءً لكذا. سداداً لـ/ لەتۆڵەیدا، لەجیاتی.
وَفِيٌّ: تام/ تەواو، پڕ، هەموی، گشت.
- : صادِق الوَعْد/ پەیمان راست، سەرراست، راستگۆ.
- : أمين. مُخْلِص/ شوێن براو، دڵسۆز، دەست و دڵ پاك، جگەرسۆز.
- . ميفاء: قادر على إيفاء دَيْنه/ سەرراست، قەرز كوێر نیە.
- : كافٍ/ تەواو، بەشكردو، سەربەسەر.
إيفاء: وفاء/ پەیمان راست، سەرراست.
عَدَم - أو وَفاء الوعد أو العَهْد/ نالەباری، درۆزنی، سەرەڕۆیی.
- - أو - الدَّيْن/ قەرزكوێری، قەرز خواردن.
وَفاة: موت/ مردن، كۆچ كردن، سوێ بونەوە، سەرنانەوە، گیان دەرچون، مەرگ.

شَهادە او حجة الـ – / مردونامە.
مُتَوَفّى: مميت/ كوژەر، گیان كێش.
مُتَوَفّى: مَيِّت/ مردو، كۆچ كردو.
وقب:
وَقَبَت العَيْنَ: غارَت/ چاو بە قولاچو.
وَقْب. وَقْبَة: نُقْرَة. تجويف/چاڵ، بۆشایی، كلۆر، كون.
– : احمق/ گێل، گەوج، كەودەن، گەمژە، گەلحۆ.
وقت:
وَقَت. وَقَّت: حَدَّدَ وَقتاً/ كاتی دانا، كاتی دیاری كرد.
– . – : نَظَّمَ وَقْتَهُ/ كاتی خۆی رێك و پێك كرد.
وَقْت: آن. زَمَن/ كات، سات، دانگ.
من – لآخَر/ ناوبەناو.
فـاتَ – ـهُ: ای زَمَنَـهُ او أوانَـهُ/ بەسەرچـو، كـاتی بەسەرچو.
فی – بە: فی حینه/لەكاتی خۆیدا.
قَتْل الـ – / كات كوشتن، كات رابواردن.
مع الـ – / لەگەڵ رۆژدا، كاتی، دەم دەمی.
لـ – . لِوَقْتِه: حالاً/ هەر ئێستا، دەست و برد، كوتوپڕ.
وَقْتـی. مُوَقَّـت: لحـين فقـط/ كـاتی، بۆماوەیـەك، سەردەمی.
مُوقَّتاً. وَقتياً: لفترة قصيرة/ بۆماوەیەكی كەم.
وقتئذٍ: فی حینه/ ئەوسا، لەكاتی خۆیدا.
مُوقَّت. مُؤَقَّت. موقوت: محدد/ دیاری كراو، تایبەتی.
– . – . – : ضـد دائـم/ كـاتی، بـۆ ماوەیەك، سەردەمی.
مُوقِّت: حاسِب الوقت/ كات گر، كات راگر، ساتگەر.
– : محـافظ علـى المواعيـد/ بـەڵێن راسـت، سەرراست.
مَوْقِت. ميقات: الوقت المضروب/ كـاتی دانراو، كـاتی تایبەتی.
– . – : المكـان المحـدود/ شـوێن بـەڵێن، شوێنی تایبەتی.
توقيت: تحديد الوقت/ كات (دانان، دیاری كردن).
– : الساعَة/ راست كردنەوەی كات ژمێر.
وقح:
وَقَـحَ. وَقُـحَ. تـوَقَّـحَ. قَـلَّ حيـاؤُهُ/ (بێحـەیا، بێئـابرو، چوختی، چەقاوەسو) بو.
تواقَحَ: تَظاهَرَ بالوقاحَة/ بێحەیایی و بێ ئابڕویی كرد.
وقِـح. وقـيح: قليـل الحيـاء/ چاوسـور، لەوچـە، تـرۆ، چـوختی، چـاوقایم، روهـەڵماڵراو، بێئـابرو، بێحـەیا، چەقاوەسو.
وَقاحَـة. قِحَـة. وُقوحَـة: قلَّـة حيـاء/ بێئـابرویی، بێحەیایی، لەوچەیی، ترۆیی، چەقاوەسویی.
وقد:
وَقَـد. إتَّقَـد. تَوَقَّـدَ: إستَوْقَدَ: إشتعل/ داگیرسا، گـڕی گرت، ئاگری گرت، كڵپەی (سەند، كرد).
إتَّقَدَ غَضَباً/ توڕبو، ئاگری ئەكردەوە، رقی هەڵسا.
وَقَّد. اوقَد النار: اشعلها/ دایگیرسان، ئاگری كردەوە.
اوقَدَ فيه النار: اشعله/ ئاگری تێبەردا.
– المصباح: اشعله/ چرای داگیرسان، هەڵیكرد.
وَقد. وَقود. تَوَقُّد. إيقاد: إشتعال/ داگیرسان، گڕگرتن، هەڵگیرسان.
– . – . وَقيد. وِقاد: ما توقد به النـار/ چاوگە، سوتەمەنی.
وَقّاد. مُتَوَقِّد/ گڕگرتو، داگیرساو.
كَوْكَـب – : مُـضيء شـديد التوقـد/ هەسـارەی شەوقدار، روناك.
رَجُـل – : سـريع تَوَقُّـد القلـب/ تـورە، تـورە وتـرۆ، دڵ ناسك.
إيقاد: إشتعال/ داگیرسان.
إتِّقاد. إشتعال/ داگیرسان، كڵپە سەندن.
دَرجَة الـ – / پلەی كڵپە.
مَوْقِد. مُستَوْقَد: موضع نار التدفئة/ ئاگردان، كـورە، وەجاخ، كوانو، كوانج.
– . – : اتون/ تون، فڕن.
مَوْقود: مُشْعَل/ داگیرساو، گڕگرتو، سوتاو.
مُتَوَقِّد الذهن: مُتالِق/زیرەك، بیرتیژ، هەڵكەوتو.
– : مُتَّقِد: مُشْتَعَل/ داگیرساو، گڕگرتو.
وقر:
وَقَـر. وَقُـرَ: كـان ذا وقـار و رزانـه/ (بـەڕێز، رێـزدار، شكۆدار، شكۆمەند) بو.
– ت . وَقِرَت. وُقِرَت اذنه: ثَقُلَت او ذهبت سمعه/ گوێی گران بو، كەڕ بو.
– العَظْم: صَدَعَهُ. كَسَرَهُ/ شكانی.

– ـهُ الاسفار: صَلَبّتْهُ/ سەفەری زۆر قالّی کرد.

وَقَّر الشَيخَ: بَجَلَهُ/ ڕێزی گرت، ڕێزی لێنا.

– الدابة: سكنها/ تاقەتی کرد، وڵاخەکەی تاقەت کرد.

اوقَر الدابَّة/: اثقَلَ حِمْلَها/ باری وڵاخەکەی گران کرد/، باری زۆری لێنا.

– الـشَجَرُ: كَثُـرَ حِمْلَـه/ درەختەکـە بـەری زۆری گرتبو.

– الدَيْن فلاناً: اثقَلَهُ/ قەرزاری باری گران کردبوو.

وَقار: هَيْبَة و إحترام/ ڕێز، شکۆداری.

– : رزانـة و حِلْم/ هێمنـی، لەسـەرخۆیی، مەنـدی، شکۆمەندی.

وَقُور: جليل/ بەڕێز، شکۆدار، مەند.

مُوَقَّر: مُبَجَّل/ بەڕێز، شکۆدار، شکۆمەند.

وِقْر: حمل ثقيل/ باری گران.

وَقْر. وَقْرَة: نُقْرَة/ چاڵ، کلۆر، کون.

وقع:

وَقَعَ: سَقَطَ/ کەوت، کلا.

– الأمْرُ: حَدَثَ. حَصَلَ/ ڕوویدا.

– له امر: حَدَثَه له/ بەسەری هات، توش بو.

– الأمْرُ منه مَوْقِعاً. اثَر عليه. كان له تأثير/ کاری تێکرد.

– عنده موقع الرِضَى: نـالَ منـه حظاً و منزلـة/ بەرزبوە لەلای، لای خۆشەویست بو.

– الطائر على: حَطَّ/ مەل نیشتەوە.

– الحَقّ: ثَبَتَ/ چەسپی، ڕاستی چەسپی، دەرکەوت.

– الكلامُ في نفسه. اثَّر فيها/ قسەکاری تێکرد.

– له واقع: عَرَضَ له عارِض/ توشی شتێك بو.

– ت بينهم معركة/ بو بە شەڕیان، چون بەگژیەکدا، دایان بەیەکدا.

– . وقَع في الرَجُل: سَبَّهُ وعابَهُ/ قسەی بە پیاوەکە وت، تێی بەربو، سوکی کرد.

– . – في النـصل: حَدَّدَهُ/ دەمەکـەی تیـژکرد، دەمەزەردی کرد.

– من كذا او عن كذا: إمْتَنَعَ و تَنَحَّى/ وازی لێهێنا، دەستی لێ هەڵگرت.

وَقَّع الخِطابَ او الـصك: وَضَـعَ تَوْقيعَهُ/ ئیمـزای کـرد، شەقڵی کرد.

– بينهم: القى الـشقاق/ کردنی بەگـژ یەکـدا، ناکۆکی تێخستن.

– . اوقع: جعله يَقَع/ خستی، پاڵی پێوەنا.

– عليه عقاباً . – به قصاصاً: عاقبه/ سزای دا.

اوْقَعَ بـه: انزلـه بـه/ توشـی کـرد، کـردی بـە توشـیەوە، تێوەی گلان، گلانی.

– ـهُ في تهلكه: عَرَّضَه للخَطَر/ خستیە مەترسیەوە، توشی بەڵای کرد.

– ـهُ في فَخٍّ/ کردی بەتەڵەوە، ملی کرد بەتەوە، تەڵـەی بۆنایەوە، خستیە داوەوە.

واقَعَ الـمراة: جامَعَها/ ئافرەتەکەی لاقـە کـرد، لەگـەڵی نوست، گای.

– الرجـلَ: حاربـه/ چـوبەگژ پیاوەکـەدا، شـەڕی پـێ فرۆشت.

تَوَقَّع. إستوقع الأمْرَ: إنتظره/ چاوەڕوان بو، بەتەما بو.

إسْتَوْقَعَ الأمْرَ: تَخَـوَّفَ منه/ لێـی بـەترس بـو، مەترسـی لێی هەبو.

وَقع. وُقوع: سقوط/ کەوتن، کلانن.

– . – : حدوث/ ڕودان.

– الأقدام: صوت القدم/ تەپەی پێ، ترپەی پێ.

– الكلام: تأثيره/ کاریگەرێتی قسە، کارتێکردن.

وَقْعَة: سَقْطة/ کەوتن، کەوتنێك.

– : صَدْمَة/ بەڵا، کارەسات، ڕوداو، چورتم.

– : وَجْبَة. اكلة/ ژەم، ژەمێك خواردن.

– : النَومـة فـي آخـر الليـل/ گورگەخـەو، خـەوی بەرەبەیان.

واقع: ساقط/ کەوتو.

– : حاصل/ ڕوداو.

– : كائن/ بون، ڕاستی.

– فـي المكـان الفلانـي: موجـود فـي/ کەوتۆتـە..، لێبو، لەوێیە.

امْرٌ – او واقعي: حقيقي/ ڕوداوێکی ڕاستەقینە، ڕوداو، چارنەبون.

في – الأمر. في الواقع: حقيقةً/ لە ڕاستیا.

واقِعي: طبق الواقع:/ ڕاستێتی، ڕاستەقینەیی، پڕبەپڕی ڕاستی.

و

– : تابع لمذهب الواقعية/ سەر بە ڕێبازی (ڕاستێتی، ڕاستەقینەیی)، ڕاست کار، ڕاست پەرست.

**واقِعَة:** حادِثَة/ ڕوداو، سەربورد، سەرگوزشتە.

– : أمر مَفروض وقوعه/ ئەبێ ببێ، کارەساتێك کە ئەبێ ڕوبدات.

– : نازِلَة. مُصيبَة/ بەلا، کارەسات، ڕوداو، چورتم.

– : مَعْرَكَة/ جەنگ، شەڕ، بەیەکدادان.

– : قيامَة/ ڕۆژی زیندوبونەوە، قیامەت.

**وقيعَة:** إغتياب الناس/ عەیبەت کردن، قسەی پاشملە.

– : مجثم الطائر/ نیشتگە، شوێنی هەڵنیشتن.

– : قتال او مَعْرَكَة/ جەنگ، شەڕ، بەیەکدادان.

– : خِرقَة يُمسَحُ بها القلم/ پەڕۆی خامەسڕین.

**إيقاع. توقيع:** إسقاط/ خستن.

– . – العقاب/ سزادان.

– في الموسيقى: تناسُق في الاصوات/ تەرانە، ڕێك و پێکی لە دەنگ و ئاوازدا، ڕەزم.

**تَوَقُّع:** إنتظار/ چاوەڕوان بون، بەتەمابون، هیوابون.

**مَوْقِع:** مَكان/ شوێن، جێ، جێگە، جێگا.

**مَوْقِعَة:** مَعْرَكَة/ جەنگ، شەڕ، بەیەکدادان.

– . ميقَعَة الطائر: مجثم/ نیشتگە، شوێنی هەڵنیشتن.

**الواقِعيَة:** المذهب الواقعي/ ڕێبازی (ڕاستێتی، ڕاستەقینەیی)، ڕاست کاری، ڕاست پەرستی.

– في الأدب/ ڕاست کاری (وێژەیی، لەوێژەدا).

**وقع. وِقاع:** جماع/ گان، پەڕین.

**مُواقَعَة:** مُباشَرة جنسية/ گان کردن، پەڕین.

**وَقّاع. وَقّاعَة.** مُحَرِّض. الذي يغتاب الناس/ هان دەر، غەیبەت کەر، فیتنە، نوزمان.

**توقيع:** إمضاء/ ئیمزا، شەقڵ.

**مُوَقَّع:** مَمضي/ ئیمزاکراو، شەقڵ کراو.

**مُوَقِّع:** صاحِب التوقيع/ ئیمزاکەر، خاوەن ئیمزا، شەقڵ کار.

**ميقَعَة:** مِسَنّ/ هەسان، تیژکەر، بریەند، کارتیغ.

– من جلد: مِسَنّ/ قایش تیژ کردن.

**وقف:**

**وَقَفَ.** ثَبَتَ في مكانه/ لە شوێنی خۆیا جێگیر بو، وەستا، ڕاوەستا.

– : قام/ هەڵسایە سەرپێ، هەستا، هەڵسا، ڕاست بوەوە، ڕاپەڕی.

– أمَه: قاوَمَهُ/ لەڕویا هەڵگەڕایەوە، بەرهەڵستی کرد.

– على الأمر: فهمه. عَرَفَهُ/ تێی گەیشت، زانی، پێیزانی.

– على الأمر: تَبَيَّنَهُ. تَحَقَّقَهُ/ لێی کۆڵیەوە، لێی توێژیەوە.

– الأمْرُ على كذا: عَلَّقَهُ عليه/ لەسەری وەستا.

– في المسئلة: إرتاب/ دودڵ بو، بەگومان بو، گومانی لێکرد.

– . أوْقَفَ. وَقَّفَ: جَعَلَهُ يَقِفُ/ وەستانی، ڕایوەستان، ڕای گرت.

– . – : عافَ. مَنَعَ/ بەریگرت، قەدەغەی کرد.

– . – على: أطلَعَ على/ ڕایگەیاند.

– . – مِلْكَهُ لاولاده/ تەرخانی کرد، ملك و ماڵی تەرخان کرد بۆ منداڵەکانی.

– . – مالاً: حَبَسَهُ في سبيل الخير/ ملك و ماڵی تەرخان کرد بۆ خێر.

– : عَطَّلَ/ وەستانی، ڕایوەستان، ڕایگرت، پەککیخست.

– تنفيذ الحُكم: اجَّلَهُ/ جێبەجێ کردنی فەرمانەکەی ڕاوەستان، دوایخست، پاشی خست.

**تَوَقَّفَ.** تَمَكَّثَ/ وەستا، ڕاوەستا، وچانیدا، پشویدا.

– عن كذا: تَمَنَّعَ و كَفَّ/ وازی هێنا، دەستی هەڵگرت.

– الأمْرُ على كذا: تَعَلَّقَ به/ پێوەی بەند بو، لەسەری وەستابو.

– في الأمْر: تَرَدَّدَ/ لێی دودڵ بو، ڕاڕابو، بەگومان بو.

**إستَوْقَفَ:** طلب منه الوقوف/ ڕایوەستان، ڕایگرت، وەستانی.

– : حمله على الوقوف/ بو بە هۆی وەستانی، ناچاری کرد کە بوەستێ.

**وَقْف. وُقوف/** وەستان، ڕاوەستان.

– : مالَ مَوْقوف/ سامانی دەست بەسەراگیراو، ماڵودراوی تەرخان کراو، وەقف کراو.

— : سوار/ بازنگ.

وُقوف: قيام. ضد جلوس/ هەستان، هەڵسان، راوەستان، راست بونەوە.

واقِف: منتصب. ضد جالِس/ وەستاو، راوەستاو، هەستاو، راستەوەبو، بەرزەپێ.

— : ضد متحرك/ لەكاركەوتو، وەستاو.

— على: مَطَّلع على/ ئاگادار لە، لێزان.

إيقاف. توقيف: رَفع. إقامَة/ بەرزكردنەوە، راست كردنەوە.

— . — : رَسَخ/ راگیرکردن.

— : مَنع السير. إعاقة/ وەستاندن، تەگەرە تێخستن.

— : تعطيل/ پەك خستن، راوەستاندن.

— : إرجاء. تَعْليق/ دواخستن.

— التنفيذ/ دواخستن، جێبەجێ نەکردن.

— العمل/ کارراگرتن، کار وەستاندن.

توقيف: حَبْس/ بەند كردن، دەست بەسەراگرتن.

تَوَقُّف: عدم إستمرار/ وەستان، پەك كەوتن، لەكاركەوتن، وچان دان.

— : تَرَدُّد/ رارایی، گومان.

مَوْقف: حالَة/ بار، دۆخ، هەڵوێست.

— : محطة/ ئیستگە، وەستانگە، پشوگە.

— : محل/ شوێن، جێ، جێگە، جێگا.

— حَرِج/ هەڵوێستێکی تەنگاوی.

موقوف/ وەستاو، راگیراو.

— عن العمل/ لەكارخراو، وەستێنراو.

— : محبوس/ بەند، دەست بەسەراگیراو.

— او مُتَوَقِّف على: متعلق بـ/ بەستراوە بە..، بەندە بە..، لەسەر.. وەستاوە...

وقى:

وَقى. وَقّى: صانِ و سَتَر عَن الأذى/ پاراستی.

تَوَقّى. إتَّقى كذا: حذِرَهُ و خافَهُ/ سڵەمیەوە، لێی (سڵەمیەوە، ترسا)، خۆی پاراست.

إتَّقِ كذا: احْذرهُ/ خۆت بپارێزە، ئاگاداربە، وریابە.

وَقي. وقاية. تَوْقِيَة: دَفع الأذى/ پاراستن، ئاگاداری.

وِقاية: حَذَر و إحتياط/ ئاگاداری، پارێزکاری.

واقٍ. وَقي: حام/ پارێزەر.

تَقي. تَقْوى: مَخافَة الله/ خواپەرەستی، لەخواترسان.

— . — : تَدَيُّن/ ئاین داری، خواپەرستی.

تَقِيّ. تقّي. مُتّق: يَخاف الله/ خواپەرست، خواناس، لەخوائەترسێ.

— . — : مُتَدَيِّن/ ئایندار، ئاینخوار.

وكا:

إتَّكأ على. تَوَكّأ على: إسْتَنَد على/ پاڵیدایەوە، شانی دادا، خۆیدا بەسەردا.

إتّكاء. تَوَكُّوء/ پاڵ دانەوە، شان دادان، خۆبەسەردادان.

مُتَّكأ. تُكأة: ما يُتَّكأ عليه. عكاز/ پاڵپشت، گاڵۆك.

تَكْيَة: مَلْجأ العجزة/ تەکیە، خانەقا.

وكب:

وَكَبَ: مَشى مُتَمَهلاً/ لەسەرخۆ رۆیی.

واكَبَ الموكب: سار مَعَهُ/ لەگەڵی رۆیی، لەگەڵ کۆڕەوەکەدا رۆی.

— على الأمر: واظَبَ/ لەسەری رۆیی، بەردەوام بو.

مَوْكب: جَماعَة/ کۆمەڵ، کۆڕەو.

وكد:

وَكَدَ بالمكان: اقام/ لە جێگەکە مایەوە، نیشتەجێ بو، تیانیشت.

— المكانَ: قَصَدَهُ/ بۆی چو، چو بۆ جێگەکە.

وَكَّدَ. أكَّدَ. اوْكَدَ. جَزَمَ. اوثق/چەسپانی، سەلماندی، دوپاتی کردەوە.

تَوَكَّدَ. تأكَّدَ: تَوَثَّقَ/ سەلمی، سەلمێنرا، چەسپی.

— . — من/دڵنیا بو، لێی دڵنیابو.

اكيد. مُؤَكَّد. وكيد: الوثيق الثابت/ چەسپیو، بەراستی.

تاكيد. توكيد: إثْبات/ سەلماندن، دوپات کردنەوە، دڵنیایی.

بالـ — . اكيداً. من المؤكد/ بەدڵنیایی، بەراستی.

مُتأكد. مُتَوَكِد: مُحَقَّق: ثابت/ رون، دڵنیا.

وكر:

وَكَرَ. وَكَّرَ الطائرُ: إتَّخَذَ وَكراً/ هێلانەی کرد.

وَكر. وَكرَة: عُشّ الطائر/ هێلانە.

— الطيور البَرِّيَّة/ لیس.

وكز:

و

وَكَزَ. ضرَبَ بِجَمْعِ الكَفِّ/ مشتەکۆڵەی (پیاکێشا، وەشاند).

– ـهُ بالرمْحِ: طَعَنَهُ/ رمی پیا کرد، بە رم لێیدا.

– الرمْحَ فی الأرضِ: رَكَزَهُ/ دایچەقاند.

وكس:

وَكَسَ. وكِسَ. أوْكَسَ: بَخَسَ قيمتَه/ نرخی کەم بووەوە، هەرزان بو.

– . – الشيءَ: نَقَصَهُ/ کەمی کردەوە.

– الشيءُ: نَقَصَ/ کەم بووەوە.

وُكِسَ. أوْكَسَ التاجِرُ: خَسِرَ/ زیانی کرد، زەرەری کرد، تێی نەمێنا، نەیهێنا، تێشکا.

وَكْس: تنقيص الثمنِ/ نرخ کەم کردنەوە، داشکاندن.

– : خَسارَة/ زیان، زەرەر.

باعَ بالـ – : باع بالخَسارَةِ/ بەزیان فرۆشتی.

وكع:

وَكُعَ الشيءُ: إشْتَدَّ و صَلُبَ/ رەق بو، پتەو بو.

أوْكَعَ: صَلَّبَ/ رەقی کرد، پتەوی کرد.

وكيع: شديد. متين/ رەق، پتەو.

ميكَعَة الطيور: عظم عند ذيلها/ ئیسقانی قنگەجۆڵە.

– الإنسان: عظم داخلي بين ثُقْبَيِ الأنفِ/ کڵۆکەی لوت.

– : سِكَّة المحراث/ گاسن.

وكف:

وَكَفَ: سال قليلاً قليلاً/ ئاوی دەردا، ئاوی لێ چو، دەلاندی.

– . تَوَكَّفَ البيتُ: قَطَرَ سقفه/ دڵۆپەی کرد.

وَكْف. وكيف. وكفان: سيلان. نَفْح/ دڵۆپەکردن، ئاودەردان، دەلاندن.

وكل:

وَكَلَ اليه الأمرَ: سَلَّمَهُ إيّاه و فَوَّضَهُ إليه/ پێی سپارد، سەرپشکی کرد.

– . أوْكَلَ بالله: إستسلم اليه/ خۆی دایە دەست خوا، پشتی بەخوابەست.

وَكَّلَ فلاناً: جَعَلَهُ وكيلاً/ کردی بەوەکیلی خۆی، کردی بە بریکار.

– : أطْعَمَ/ دەرخواردیدا، کردی بە دەمیەوە.

واكَلَ و تواكَلَ القَومُ: إتَّكَلَ بعضهم على بَعْض/ پشتیان بەیەکتری بەست.

تَوَكَّلَ: صار وكيلاً/ بو بەوەکیل، بو بە بریکار.

– له بكذا: تَكَفَّلَ له به/ بو بە زامنی.

– . إتَّكَلَ على: إعتمد عليه/ پشتی پێبەست.

– . – على: وَثِقَ به/ بڕوای پێ کرد، لێی دڵنیابو.

– . – على الله: إستسلم اليه/ پشتی بەخوابەست.

وكيل: نائب. معتمد/ جێگر، بریکار، وەکیل، جێدار.

وَكالة. وِكالة: تفويض/ جێگری، بریکاری، وەکالەت، بریکارنامە.

– خاصة/ بریکارنامەی تایبەتی.

– عامة/ بریکارنامەی گشتی.

تَوْكيل: تعيين الوكيل/ دانانی (جێگر، بریکار، وەکیل)، وەکیل دانان.

– : تفويض/ سەرپشك کردن.

إتّكال: إعتماد/ پشت پێبەستن.

– . توكل: وثوق/ پشت پێبەستن، بڕواپێکردن، دڵنیایی، متمانە پێکردن.

تَواكُل: الإتكال على الغير/ پشت بە خەڵك بەستن.

مَوكول الى: مُفَوَّض الى/ پێسپێرراو، دراوە بە.

مُتَّكِل على/ پشت ئەبەستێ بە.

وكن:

وَكَنَ الطائرُ بيضَهُ أو على بيضه: حَضَنَهُ/ لەسەری (کرکەوت، هەڵنیشت).

وَكْن: عُشّ الطائر/ هێلانە، کولانە.

واكِن: جاثِم/ کرکەوتو، هەڵنیشتو، کورك.

ول:

وَلْوَلَ: أعْوَلَ/ لورانی، لورەی هات.

– : دَعا بالوَيْل/ قرانی، داوای کرد بەڵاو کارەسات رویدات.

– ت القوس: رَنَّت/ کڤەی هات، لەریەوە.

وَلْوَلَة: عَويل/ لورە، لورەلور، لوراندن.

ولج:

وَلَجَ. تَوَلَّجَ: دَخَلَ/ چوە ناوی، پیاچو، تێی چو.

أوْلَجَ: أدْخَلَ/ پیای کرد، خستیە ناوی، تێی کرد، تێی خست.

وُلوج. لِجَة: دُخول/ تێچون، پیاچون، چونەناو.
إيلاج: إدخال/ تێخستن، پیاکردن، خستنەناو.
وَلَجَة. مَوْلِج: مَدْخَل/ دەروازە، گوزەر، دەرگا، دەرك.
وَلِيجَة: صَدِيق لصيق/ پیانوساو، هاوەڵی خۆمەڵواس.
تُلَّج (اصلُه وَلَج): فَرْخ العِقاب/ بەچکەداڵ.
ولد:
وَلَدَ: اتى بِنَسْل/ وەچەی خستەوە.
— : أنْتَج/ بەری گرت، بەرهەمی هێنا.
— ت الحُبلى/ منداڵی بو، زا.
— ت أنثى الحيوان/ زا، بەچکەی بو، ترەکی.
وَلَّدَ الوَلَدَ: رَبّاه/ بەخێوی کرد، پەروەردەی کرد.
— : سَبَّبَ/ بو بەهۆی، لێی وەشایەوە.
— كذا من كذا: إستخرجه. انْشَأَهُ منه/ لێی (پێك هێنا، دروست کرد، دەرهێنا).
— ت القابلة الحبلى: تَوَلَّت ولادتها/ مامانی کرد، یارمەتیدا لە منداڵ بونیا.
وُلِدَ. إتْوَلَدَ/ لەدایك بو.
تَوَلَّدَ من: نَتَجَ/ لێی پێك هات، لە ئەنجام و بەرهەمی..
تَوالَدوا: كَثُروا. وُلِدَ بعضهم بَعضاً/ زاوزێیان کرد، نۆربون.
وَلْدٌ. وَلَد. وُلْد. وِلْد: المولود (ذكر أم أنثى)/ ساوا، کۆرپە.
— . — . — . — : أولاد. بَنون/ منداڵ، ریشەی جگەر.
— . — . — . — : صَبي. إبن/ کوڕ، منداڵ.
بَيت الوِلد: الرَحِم/ منداڵدان.
وَلْدَة: مَرَّةُ الوِلادَة/ منداڵ بونێك، سكێك، زاینێك.
وَلَدَت إثنين في وَلْدَة/ دوانەی بو، دوانی بو بەسکێ.
وِلادَة: وَضع/ منداڵ بون، زان، سك کردن.
— : بِدايَة. ظهور/ سەرەتا، دەست پێکردن، دەرکەوتن.
حديث الـ — /ئەوزاد.
سجل الـ — / زابەند.
بَيان الـ — / زابیجە.
غرفة الـ — / زابیگە، زاینگە.
منذ الـ — / زکماك، لە منالیەوە.

وَلادَة. وَلُود. كثيرة الولادَة/ زەووك، بەسك و زا، شفتەزێ (کار، کردن، ئەکا).
وَليد. مَوْلود: طِفل/ ساوا، کۆرپە.
— : صَبي. غُلام/ کوڕ، منداڵ، زادە.
أمّ الـ — : دَجاجَة/ مر، مامر، مریشك.
والِد: اب/ باوك، باب.
والِدَة: أم/ دایك، داك.
المرأة الوالدة حديثاً/ زەیستان.
الوالِدان: الأب و الأم/ دایك و باوك، داك و باب.
لِدَة: تِرب. مُعاصِر/ هاودەم، هاوچەرخ، هاوتەمەن.
— . ميلاد: وَقت الولادة/ کاتی لەدایك بون.
تَوَلُّد: تناسُل: تكاثُر/ زاووزێ، (بەرە، نەوە، وەچە) خستنەوە.
تَوْليد: مُساعَدَة الوالِدة/ مامانی.
صِناعَة الـ — : قِبالَة/ مامانێتی.
مَوْلِد. ولادَة/ منداڵ بون، زان.
— : مكان الولادَة. مسقط الرأس/ شوێن بون، شوێنی لە دایك بون.
لُغَة الـ — / زمانی زکماکی.
مُوَلَّد: مختلط الوالدين/ دورەگ.
— : المُحدَث من كل شيء/ دروستکراو، پێك هێنراو، تازە بابەت.
مُوَلِّد: قابل/ مامانی پیاو.
— : يُعطي نَسْلاً/ بەرهەم دار، نەوە ئەخاتەوە.
— : مُنْتِج/ پێك هێنەر، بەرهەم هێن.
الـ — الكهربائي: آلة تُوَلِّد القُوَّة الكهربائية/ کارەبا بەرهەم هێن، پێك هێنەری کارەبا، موەلیدە.
مُوَلِّدَة: قابِلَة/ مامانی ئافرەت.
مَوْلود: طِفل/ ساوا، کۆرپە.
— : وُلِيد/ لەدایك بو.
ميلاد: وقت الولادَة/ کاتی لەدایك بون.
عيد الـ — / جەژنی لەدایك بونی عیسا، جەژنی لەدایك بون.
تاريخ الـ — / زاییشت.
سَنَة ميلاديَّة/ ساڵی زایین، زایینی.
وَلوديَّة. وُلوديَّة: قِلَّة العِلم بالأمور كَفِعْل الصبيان/ کردەوەی منداڵانە.

و

ولس:

وَلَس. والَسَ: خَدَعَ. خادَعَ/ (فێڵ، گزی، ساختە)ی کرد.

والَسَ. اولَسَ بالحديث: عَرَّضَ بـه و لم يُصَرِّح/ درێژەی پێداو مەبەستی دەرنەخست.

وِلس. مُوالَسَة: غِش/ فیل، گزی، ساختە.

ولع:

وَلِعَ. اوْلَعَ. تَوَلَّعَ به: احَبَّهُ جداً/ خۆشیویست.

– . – . – بـه: علق بـه شديداً/ هـۆگری بـو، لەگەڵی رامات، ئالودەی بو.

– : إشْتَعَل/ داگیرسا، ئاگری گرت، گڕی گرت.

وَلَّعَ. اولَعَ فلاناً بكذا: جَعَلَهُ يولَع به/ رایهێنا، هۆگری کرد، ئالودەی کرد.

– : اشْعَلَ/ دایگیرسان، هەڵیگیرسان.

وَلِعٌ. وَلُوع: شَديد الوُلوع و التعلق/ هۆگر، پەرۆش، ئالودە.

مُوْلَع بكذا: مُحِبّ لـ . مُغْرَم بـ / هۆگر، بەخولیا، پەرۆش، ئالودە.

وَلَعٌ. وُلـوع. تَوَلُّع: شِدَّ الرَغْبَة. شَغَف/ هۆگریـون، ئالودەیی، سۆزی بەتین، خۆشەویستی، پەرۆشی.

وِلعَة: بَصْوَة نار/ پزیسك.

وَلّاعَة سجاير: قَدّاحَة/ چەرخ، چەخماخ، داگیرسێن.

والع: مُشْتَعِل/ داگیرساو، هەڵگیرساو.

ولغ:

وَلَغَ الكَلْبُ الإناء و في الأناء: شَرِب ما فيه باطراف لسانه/ لستیەوە، ئاوی خواردەوە.

ولف:

وَلَفَ: تَتابَعَ/ بەدوای یەکەوە بون.

والَفَهُ. وَلَفَه: إعتزى إليه و إتَّصَلَ به/ پەیوەندی لەگەڵ بەست، هاودەمی لەگەڵ کرد.

توالَفَ الشيئان: إئتلف احدهما الى الآخر/ تێکەڵی یەك بون.

وَلَّفَ: خَلَطَ و مَزَجَ/ تێکەڵی کرد.

وِلْف. وَليف. إلْف: صاحِب: صديق/ هاودەم، هاوەڵ، هاوڕێ، هاواڵ، برادەر.

ولم:

اوْلَمَ: عَمِلَ الوَليمَة/ زیافەتی کرد، دەعوەتی کرد.

وَليمَة: مادُبَة/ بانگ کردن، زیافەت، دەعوەت.

– : حَفْلَة/ ئاهەنگ، سور.

– عِرس: حفله عِرس/ شایی.

وَلْم. وَلَم: حِزام السَرج/ قایش قەیاسە، قەیاسە، تەنگە، سەرتەنگە، بن تەنگە.

وله:

وَلَـهَ. وَلِـهَ. تَوَلَّـهَ تَحَيَّـرَ مِن شِدَّة الوَجْد/ شـەیدابو، لەخۆشەویستیا شەیدابو.

وَلَّهَ. اوْلَهَ: حَيَّرَ/ شەیدای کرد، دڵی لێسەند، شێتی کرد.

وَلْهان. واله: مَفْتون/ شەیدا، شێت، دێوانە.

وَلَه: سِحْر. إمتنان/ شەیدایی، شێتی.

ولی:

وَلِيَ. وَلَى: دَنا مِنْهُ و قَرُبَ/ نزیك بوەوە، لێی نزیك بوە.

– الشيءَ و عليه: مَلَكَ امْرَهُ/ بـو بەخاوەنی، بـو بە بەڕێوەبەری.

– البلَد: تَسَلَّطَ عليه/ دەستی بەسەر وڵاتدا گرت، بو بە بەڕێوەبەری.

وَلّى فُلاناً: اقامَهُ والياً/ کردی بە بەڕێوەبەر، فـەرمان ڕەوایی پێ سپارد.

– هارِباً: أدْبَرَ/ پشتی لێ هـەڵکرد، هـەڵهات، رایکرد، بۆی دەرچو، تێی تەقان.

– الشيءَ وَعَنـهُ: اعْـرَضَ و إبْتَعَـدَ/ خـۆی لادا، دورکەوتەوە.

وَلّاهُ ظَهْـرَهُ: جَعَلَـهُ وَراءَهُ/ خستیە دوایـەوە، پـشتی تێکرد، روی لێ وەرگێڕا.

وَلّاهُ ظَهْرَهُ: هَجَرَهُ/ وازی لێهێنا، دەستی لێهـەڵگرت، بەجێی هێشت.

وَلّاهُ ظَهْرَهُ: نَبَذَهُ إحتقاراً/ ئافەرۆزی کرد.

والى: ناصَرَ. صادَقَ/ پـشتگیری کـرد، دەسـتی گـرت، یارمەتیدا، هاوڕێیەتی کرد.

– العَمَلَ: تابَعَهُ/ ئیشەکەی برد بەڕێوە، سـەرەوکاری کرد.

اوْلى فُلانـاً الأمْـرَ: جعلـه واليـاً عليـه/ پێـی سـپارد، بەرەوپێری کردەوە.

اوْلاهُ مَعْروفاً: صَنَعَهُ اليـه/ چـاکەی لەگـەڵ کـرد، یارمەتیدا دەستی گرت.

– هُ ثِقَتَه: وَثِقَ بهِ/ متمانەی پێکرد، بڕوای پێکرد.

– هُ كذا: جَلَبَهُ عليه/ توشی کرد، کردی به (توشیه‌وه، کولکیه‌وه).
تَوَلّی الأمرَ: قام به/ کردی، به‌جێی هێنا، گرتیه دەست خۆی.
– الحُكمَ: تَقَلَّدَهُ/ فەرمان ڕەوایی گرتەدەست.
– عنه: اَعْرَضَ/ وازی لێهێنا.
– هارِباً: اَدْبَرَ/ هەڵهات، ڕایکرد، بۆی دەرچو، تێیتەقان، پشتی تێکرد، پشتی لێهەڵکرد.
تَوالی: تَتابَعَ/ بەدوای یەکدا هاتن، یەک لەدوای یەک بون.
إستَوْلی علی: تَمَلَّكَ/ داگیری کرد، دەستی بەسەراگرت.
– عليه: غَلَبَهُ او تَمَكَّنَ مِنْهُ/ زاڵ بو بەسەریا، پێی وێرا.
وَلاء: مَحَبَة و صَداقَة/ خۆشەویستی، دڵسۆزی، هاوڕێیەتی.
– : امانَة/ دەست پاکی.
– : قَرابَة/ خزمایەتی، کەسایەتی، خوێشایەتی.
وَلِيّ: نَصير/ پشت گر، یاریدەدەر، هاوکار، هاریکار.
– : جار/ هاوسێ، دراوسێ.
– : صَديق/ هاوڕێ، هاوەڵ، برادەر.
– : قِدِّيس/ پیرۆز.
– الشيء: صاحِبَهُ/ خاوەن.
– الأمر: معيل/ چاوترسێن، بەخێوکەر، خاوەن، گەورە.
– الدم: اقرب اقارب المقتول/ خوێن خوان، خاوەن خوێن.
– العَهْد: وَريث الملك/ جێنشین.
– النِعْمَة: مُرَبّي. مِفضال/ بەخێوکەر، نان دەر.
– الله: المطيع لله تعالی/ وەلی، سۆفی، خواپەرست.
– شَرعي: قَيِّم/ باوان، داشدیار.
الله وَلِيُك: حافظك/ خوا بتپارێزێ.
وَلِيَّة: قِدِّيسَة/ پیرۆز، ئافرەتی وەلیو خواپەرست.
– : إمرأة/ ئافرەت، ژن.
دار – : قَريبَة/ نزیك، خانوی نزیك.
ولايَة: حُكم. سُلطان/ فەرمان ڕەوایی، قەڵەم ڕەو.
– : البلاد التي يَتَسَلَّط عليها الوالي/ والی نشین، ئیقلیم.
– : دَوْلَة صغيرة/ ناوچە، هەرێم، دیار، ئاستان.

– شَرْعِيَّة: حِضانَة. وِصايَة/ ماف گەرێتی، خاوەن مافێتی.
حُجَّة الـ – / گەورەنامە.
هُم علی – واحِدة: ای يد واحِدَة/ یەکن، یەك دەنگ و یەك ڕان، یەگ گرتوون.
أولياء الأمر: الحُكّام/ کاربەدەستان، فەرمان ڕەوایان.
والٍ. والي. حاكم/ فەرمان ڕەوا، والی، سالار.
تَوْلِيَة الحُكم: تقليد. تنصيب/ بون بە فەرمان ڕەوا.
مَوْلی: سَيِّد/ کاك، گەورە.
– : مُنْعِم/ خوا پێدار.
– : صاحِب/ خاوەن، برادەر، هاوڕێ، هاوەڵ.
– : جار/ هاوسێ، دراوسێ.
مُتَوَلٍّ امر كذا: مُكَلَّف به/ بەڕێوەی دەبات، لەسەریەتی، سەرەوکاری دەکات.
مُوالٍ: تابع/ لەگەڵ، سەریە.
اَوْلی: احَق/ لە پێشتر.
– له: اجدر له. احری به/ ئەبوایە، بۆی چاکتر بو.
– لك: كلمة تهديد تَعني قارَبَ الشرّ او الويل لَكَ/ بەلا لێت دا، جەهەنەمت لێ پڕ بێت.
مِن باب – . بالـ – : وخصوصاً. خاصَة/ بەتایبەتی، لە پێشتر.
إستيلاء: وَضع اليد علی الشيء/ داگیرکردن، دەست بەسەراگرتن.
وِلاء: تَتابُع/ یەك لە دوای یەك.
جاؤوا وِلاءً او علی وِلاء: بالتتابع او بالتعاقب/ بەدوای یەکدا هاتن.
تَوالٍ: تَتابُع/ یەك لە دوای یەك.
علی التوالي: بالتتابع. باستمرار/ یەك بینە، یەك لە دوای یەك.
مُتوالٍ: مُتَتابِع/ یەك لەدوای یەك، بەڕودوا.
– : مُستَمِر/ یەك بینە.
مُتوالِيَة هندسية/ (یەك لەدوای یەك، بەڕودوا)ی ئەندازەیی.
المُتَوالي. مُتاوِلي: شيعي/ شیعە، سەر بە ئیمامی عەلی.
في مايَلي: ادناه/ لە خوارەوە، لەمەودوا.
مَوّال: أُغْنِيَة/ جۆرە ئاوازێکە، مەوال.
وما:

و

وَمَأَ. أومَأَ. اشارَ/ پەنجەی درێژکرد، ئیشارەتی کرد، ئاماژی کرد. هێمای بۆ کرد.
أومَأَ الى: دَلّ على/ دەری خست، پیشانیدا.
إيماء: إشارة و حركة/ ئاماژ، ئاماژکردن، پەلەفرتێ.
تومِئَة. حركات إيمائية/ پەلەفرتکە، پەلەفرتێ.
المومَأ اليه: المُشار اليه. المذكور/ ناوبراو، دەرخراو، پیشاندراو، باسکراو.
ومس:
وَمَسَ: حَكّ/ خشانی.
– الشَيءَ بالشيءِ: إحْتَكّهُ به/ لەیەکی خشان.
اوْمَسَت المرأةُ: صارَت مومِسَة/ ئافرەتەکە بو بە سۆزانی، داوێن پیسی کرد.
مُومِس. مُومِسَة: المراة الفاجِرَة/ سۆزانی، قەحبە، ئافرەتی داوێن پیس.
ومض:
وَمَضَ. أومَضَ البَرقَ و غيره: لمع خفيفاً/ بریسکایەوە، درەوشایەوە، چەخماخەی دا، بریسکەیدا.
أومَضَ بعينه: سارق النظر/ چاوبرکێی کرد.
– : اشار خَفِيَة/ چاوی داگرت.
وَمْض. وَمِيض: تَأَلُق. بريق/ شەوق، روناکی، بریسکە.
– . – البرق/ چەخماخە.
ومق:
وَمِقَ: احَبّ/ خۆشیویست، دڵی پێوە بو.
وَمِيق. مَوْموق: مَحْبوب/ خۆشەویست، دڵخواز.
ونى:
وَنَى. وَنِيَ. تَواني: فَتَرَ و ضَعُفَ/ چروسایەوە، تینی نەما، ساردبووەوە، لاواز بو، بێهێزبو.
تَواني. وَنَّى: لَم يَجِدّ في عمله/ کەمتەرخەمی کرد، لەشی ساردبووەوە.
– : تَأَخَّرَ/ دواکەوت، پاش کەوت.
لايَنِي: لايَتْعَب/ (شەکەتی، ماندویەتی) نازانێ، شەکەت نابێ، هیلاك نابێ، کۆڵ نادات.
وَنّي. وَناء: فُتور. تَراخٍ/ کەمتەرخەمی، ساردبونەوە.
– . – : تَعَب أو ضَعْف/ شەکەتی، هیلاکی، لاوازی، بێهێزی، خاوبونەوە.
تَوانٍ. تَأَخُر. بُطء/ دواکەوتن، ساردی، هێواشی، کاوخۆیی.
– : إهمال/ کەمتەرخەمی، فەرامۆش کردن، گوێنەدان، پشت گوێ خستن.
مُتوان: مُتَراخ/ کەمتەرخەم، خاو، خلیچك، خرس.
وانٍ. واني: ضَعيف. ضعيف البدن/ بێهێز، لاواز، لەر، کەنەفت، زەبون، چروساوە.
مينا. ميناء: طلاء/ روکەش، مینا، مینابەندی.
– . – : مَرْفَأ السُفن/ بەندەر، ئەسکەلە.
وهب:
وَهَبَ الرَجُلَ الشيءَ و لَهُ: اعطاهُ إيّاه بلا عوض/ پێی بەخشی، خەڵاتی کرد.
– : كَرّسَ. خصّصَ/ تەرخانی کرد.
– ـهُ الله كذا/ خواپێیدا، خوا پێی بەخشی.
هَبْ: إفْرِض/ وای دانێ، وابزانە، لات وابێ.
هَبْني فعلت كذا: احسبني/ وایدانێ من کردومە.
واهِب: الذي يَهِب/ بەخشندە، بەخشەر.
مَوْهوب: مُعْطى كَهِبَة/ بەخشراو، خەڵات، بەخشیش.
– عَقْلِيّاً: ذكي/ ژیر، بە بەهرە، بەهرەدار، بەهرەمەند، زیرەك.
موهِبَة عَقْلِيَّة: ذكاء. قَريحَة/ بەهرە، زیرەکی، ژیری.
هِبَة. وَهْب. إيهاب: مَنْح/ بەخشین، دان، پێدان، خەڵات.
وهج:
وَهَجَ. تَوَهَّجَ: إتَّقَدَ. تَوَقّدَ/ گەشایەوە، هەڵگیرسا، داگیرسا، گرتی، گڕی گرت، کڵپەی سەند.
أوْهَجَ: أوْقَدَ/ گەشانیەوە، هەڵیگیرسان، دایگیرسان.
تَوَهَّجَ الحَرُّ: إشْتَدّ/ گەرمای کرد، تاوی سەند.
– الجوهرُ: تلألأ/ درەوشایەوە، درەخشا.
– ت رائحة الطيب: إنتشرت/ بۆنی خۆش بڵاوبووەوە.
وَهَج. وَهْج. وَهيج. وَهَجان النار: إتّقادها/ ئاگرگەشانەوە، هەڵگیرسان، گڕگرتن، داگیرسان، کڵپەکردن.
– . – . – . – الشمس: سطوع/ تیشکی رۆژ.
وَهّاج: لامِع. ساطع/ گەش، گەشاوە، بریسکەدار، درەوشەدار.
وهد:

وَهَّدَ: مَهَّدَ/ چاكى كرد، تەختى كرد، ريْكى خست، ئامادەى كرد.

وَهْدَة. وَهْد: أرْضٌ مُنْخَفِضَة/ نزمان، نزمايى، شوێنى نزم، چاڵ، كەند.

— : هُوَّة/ چەپەك، كەلەبەر، هەزار بەهەزار، چاڵ.

أوْهَد: منخفض/ نزم، چاڵ، كەند.

وهر:

وَهَرَ: أوْقَعَ فى مُشْكِل/ جەنجاڵى كرد، شێوانى، شلەژانى، سەرى لێ‌تێك دا، بێدەنگى كرد.

— : وَارَ. أفزَعَ/ ترسانى، تۆقانى.

تَوَهَّرَهُ فى الكلام: حَيَّرَهُ و أسكَتَهُ/ بە قسە شێوانى، سەرى لێ‌تێك دا، بێدەنگى كرد.

وَهَر: تَوَهُّج. وَقْع الشمس حتى تَرى له إضطراباً كالبُخار/ هەڵم و تەم و بۆخەى بەرەتاو.

— : سَراب/ ترەويلە، تراويلكە، چەوت بينى، سەراب.

وَهْران. مَوْهور: خائف/ ترساو، تۆقيو، سڵەميو.

وهق:

وَهَقَ. أوْهَقَ الدابَّةَ: أمْسَكَها بالوَهَق/ ولاخەكەى پەت كرد، كەمەندى كرد.

وَهْق. وَهَق: حبل فى طرفه أنْشُوطَة/ پەت، پەتى سەر بەئەڵقە، كەمەند.

وهل:

وَهِلَ: فَزِعَ/ داچڵەكى، ترسا، تۆقى، هەڵسڵەمى.

وَهَّلَ: خَوَّفَ و أفزَعَ/ داى‌چڵەكان، ترسانى، تۆقانى، هەڵى‌سڵەمان.

وَهِلٌ. فَزِع/ داچڵەكيو، ترساو، تۆقيو، هەڵسڵەميو، هەڵسڵەمين، هەڵسڵەمان.

وَهْل. وَهْلَة. أول وَهْلَة. أول وَهَلَة: أول نَظْرَة/ يەكەم (جار، كەرەت، بينين)، لەسەرەتاوە، پێشەكى.

وهم:

وَهَمَ. تَوَهَّمَ: تَصَوَّرَ/ وايزانى، ليى تێك چو.

— فى الشىءِ: ظَنَّ خَطأً/ خراپ تێى گەيشت.

— و وَهِمَ فى الأمرِ: أخطَأ فيه/ هەڵەى تياكرد، بەهەڵەداچو، سەهوى كرد.

إتَّهَمَ. اتَّهَمَ بكذا: إدّعى عليه به/ گوناهبارى كرد، تاوان بارى كرد.

— . — بكذا: عَزى اليه/ تاوانى خستە پاڵ.

— الرَّجُلَ: شَكَّ فى أمره او صِدْقِه/ دڵى لێ پيس كرد، ليى بەگومان بو، گومانى لێ كرد، دودڵ بو ليى.

— الرَّجُلَ باطِلاً: تَبَلَّى عَنْهُ. إدَّعى عليه/ بوختانى بۆ كرد.

تَوَهَّمَ الأمْرَ: تَخَيَّلَ وجوده/ بەهەڵەداچو، واى هات بە بيردا.

أوْهَمَ: أوْقَعَ فى الوهم/ خستيە (گومانەوە، مەترسيەوە، خەياڵەوە).

وَهْم: تَخَيُّل/ خەياڵ، خەياڵ پڵاو، بيركردنەوە، دالْغە.

— : ما يقع فى القلب من الخاطر/ بە بيرداهاتن، بەدڵداهاتن.

— : خَوْف/ ترس، مەترسى، پەستى داگرتن.

— : شَكّ/ گومان، دڵپيسى، دودڵى.

— : إنخِداع/ خەڵەتانـدن، هەڵخەڵەتانـدن، لەخشتەبردن، فريودان، تەفرەدان.

— : واهِمَة. وَهْمِيَّة: ظَنّ/ بەهەڵە لەشت گەيشتن، گومان كردن، سەهو كردن.

وَهْمى: خيالى/ بەخەياڵ، خەيالى، ريشكاو.

واهِم: مُخطِىء/ هەڵە، بەهەڵەداچو.

إيهام: إحتيال. خِداع/ بەهەڵەبردن، هەڵەپێكردن، فريودان، لەخشتە بردن.

تَوَهُّم. إشتباه/ لێ‌تێك چـون، گومان كـردن، بەهەڵەداچون، سەهوكردن.

تُهْمَة. إتهام: شكوى/ گوناهباركردن، تاوان خستنەپاڵ، تاوان.

مُتَّهَم. تَهيم: الذى وقعت عليه التُهْمَة/ گوناه بار كراو، تاوان بار كراو.

— . — : مشكوك فى امره/ گومان لێكراو.

موهوم: الذى ذهب اليه الوَهْم/ ناديار، هەر بە خەياڵ، نەڵێن.

وهن:

وَهَنَ. أوْهَنَ. وَهَّنَ: أضْعَفَ/ لاوازى كرد، هێزى لێبرى، بێهێزى كرد، هێزى لەبەربرى.

— . — العزم: أخمَدَ الهِمَّة/ وورەى پێبەردا، ساردى كردەوە.

— . وَهِنَ. وَهُنَ: ضَعُفَ/ لاواز بو، دەسەڵاتى نەما، تێشكا.

- ت . ت . - ت عَزيمتـه/ ورەی بـەردا، روخـا، پەکی کەوت.
- ت . ت . - ت قواه/ توانایی نەما، هێزی تیانەما، کوڵیدا، ئەژنۆی شکا.
لاتَهِن. لا تَـضْعَف/ کـۆڵ مـەدە، پـەکت نەکـەوێ، سارد نەبینەوە، وازنەهێنێ، ورەبەرنەدەی.
وَهْن. وَهَن: ضُعْف/ لاوازی، بێدەسەلاتی، بێکارەیی، ورەبەردان.
- من اللیل: جُزْءٌ منه/ ماوەیەکی کەم لەشەو.
وَهِن: رئیس عمل/ سەرکار، چاودێر.
واهِن: ضَعیف/ لاواز، جیقن، جیقنـە، سیس، سیسەڵە، بێدەسەلات، بێکارە، پەژمردە.
وهي:
وَهيَ. وَهِيَ: إسترخی رباطه/ شل بوەوە، خاوبوەوە.
- . - : ضَعُفَ/ کزبو، لاواز بو، پەکی کەوت.
اَوْهي: اضعف/ کزی کرد، لاوازی کرد، پەکی خست.
واهٍ: ضَعیف. رَکیك/ کز، لاواز، چروك.
- : طفیف. زهید. تافه سخیف/ هیچ و پوچ، تـڕۆ، بێنرخ.
- : مستَرخي الرباط/ شـلەپەتێ، شل و شـێواو، خـاوو خلیچك، تەپەترە.
سببٌ - / هۆیەکی هیچ و پوچ.
عُذرٌ - / بیانویەکی هیچ و پوچ.
واهِ. واهاً لـهُ و بِـه: مـا اَحْـسَنَهُ/ ئافـەرین، زۆرباشـە، زۆرچاکە، بەجێیە.
ویح:
وَیْحَ. وَیْحاً له. وَیْحَهُ: وَیلٌ له/ بەڵای لێدا، جەهەنەمی لێبێ.
واح. واحَة: ارض خِصْبَة فی قَفْر/ مێـرگ، میرخـوزار، نزار، لاڵەزار، شەکار.
ویل:
وَیْل: الشَرّ او حلوله/ بەڵا، خـەم، پـەژارە، ماتـەمینی، چورتم، کارەسات، بەڵاداکەوتن و بڵاوبونەوە.
وَیْلَة: بَلِیَّة/ کارەسات، بەڵا، چورتم.




ياس:

يَئِسَ: قَطَعَ الرجاءَ/ ئومێدی بڕی، هیوای نەما، نائومێد بو، پرزەی بڕا.

— منه: قطع الأمل منه/ دەستی لێشت، هیوای لێبڕی.

أياس: آيس: اوقع في الياس/ نائومێدی کرد، هیوای بڕی.

يَاس. ياسَة: قُنُوط/ نائومێدی، بێهیوایی، هیوا (نەمان، بڕین)، دەستبەرداری.

سِنّ الـ — / تەمەنی پیری، لێبونەوە، پەك کەوتن.

سن الـ — عند المرأة: إنقطاع الطمث/ تەمەنی (عوزرنەشتن، بێخوێنی، لێوەستانەوە)ی ئافرەت.

يائِس. يَؤوس. يَؤُس: قانِط: بِلا أمل/ نائومێد، بێهیوا، پرزە براو.

مَيئوس. مَيؤوس منه: لا أمَلَ فيه/ هیوای لێناکرێ، کەلکی نەماوە.

يا:

يا: حَرْف نداء (کقولك يا زياد)/ ئەی، ئای، هۆ.

— له من رَجُل/ ئەی چۆن پیاوێکە.

يب:

يَبَّبَ المنزل: جعله يباباً/ وێرانی کرد، کاولی کرد، تەختی کرد.

يَباب: خَراب/ وێران، کاول.

يبس:

يَبِسَ: جَفَّ/ وشك بو، وشکی کرد، وشك بوەوە، چۆڕاوی داهات.

يَبَّسَ. أيْبَسَ: جَفَّفَ/ وشکی کردەوە، چۆڕیری کرد.

يابِس. يَبِس: جاف/ وشك، وشك و برنگ، رەق و تەق.

رَجُلٌ — : قليل الخير/ پیاوی بێکەڵك، بێخێر، وشك، قەمتەر.

حَجَر — : صَلب/ بەردی رەق، سەخت.

يَبْسٌ. يَبَس. يُبُوسَة: جفاف/ وشکی وشکایی، وشکەن.

— . يابِسَة: أرض/ زەوی، وشکان، وشکەن.

تَيَبُّس جفاف. تَخَشُّب/ وشك بونەوە، رەق هەڵاتن.

يتم:

يَتَمَ. يَتِمَ. يَتُمَ. تَيَتَّمَ: صار يَتيماً/ هەتیوکەوت.

يَتَّمَ. أيْتَمَ: صَيَّرَهُ يَتيماً/ کردی بە هەتیو، هەتیوی کرد.

يُتْم. يتم. يَتَم: حالة اليَتيم. فقدان الوالدين/ هەتیوێتی، بێ باوك و دایکی.

يَتيم. مُيَتَّم: فاقد الابوين/ هەتيو، بێباوك و بێ دايك.
– : فريد. وحيد/ تەنها، تەنيا، تاك، تاك و تەنيا.
– : لانظير له/ بێهاوتا، بێمانەند.
يَتيمه: مُؤنث اليتيم/ هەتيو، تەنيا، بێهاوتا.
دُرَّة – : ثمينه لا نظير لها/ گەوهەری شەو چرا.
الجمعة ال – : آخر جمعه من رمضان/ دواهەينی مانگی رەمەزان.
مَيْتَم: مَلْجَأ/ هەتيوخانە، خانەی هەتيوان، پەناگەی هەتيوان.
يخت:
يَخت: سَفينَة نُزْهَة/ كەشتی گەشت، يەخت.
يد:
يَد: كَفّ/ دەست، لەپ، بەری دەست.
– : ذراع/ قۆڵ، باڵ.
– الشيء: مقبض/ دەسك، قولف، مشتو.
– : القُدرَة و السلطان/ دەسەلات.
مَصنوع باليد – . شُغل – : صناعة يَدَوِيَّة/ دەستكرد، بەدەست دروستكراو.
طَلَب – المرأة: خَطَبَها/ خوازبێنی كرد، داوای كرد.
لە – بيضاء فی الأمر: حاذِق فيه/ دەستێكی بالای تيايە.
بين يَدَي: امامی/ لەبەردەستمايە.
سُقِطَ فی يَدَيْه: نَدَم/ پەشيمان بووەوە، پاشگەزبوەوە.
اعطی بِيَدَيْه: إنقادَ و إستسلم/ ملیدا، خۆی دا بەدەستەوە.
ذَهَبوا ايدی سَبا او ايادی سَبا تَفَرَّقوا/ بلاوەيان لێكرد.
يَدَة: مَقْبَض/ دەسك، قولف، مشتو.
يدس:
يَدَس: عَظم التَّرْقُوَه: تَرْقُوَة الطائر/ چەلەمە.
يرب:
يَربوع: حيوان كالفار/ گڕەماڵ (تەكێنە، كەنە).
يرع:
يَرَعَ: كان جبانا/ ترسنۆك بو.
يَراع. يَراعَة: جَبان/ ترسنۆك.
– . – : قَلَم/ خامە، قەڵەم.
– . – : قَصَب/ قاميش، بلوێر.
– . – : حُباحِب/ وردە مێشولە، هورە.
يَراعَة: مِزمار/ شمشاڵ، بلوێر، دوزەلە، جوزەلە.
برق:
بَرَقان. ارَقان: آفَة زراعِيَة/ زەرتك، دەردێكی ناو كشت و كاڵە.
– الإنسان: صُفر الإنسان. مرض/ زەردويی.
يَرَقَة. يَرَقانَة. أرَقَة: من اطوار الحشرات/ مەگەزیاش دەرچونی لەگەرا، كرمۆكە، پرگە، لارفا.
مَيْروق: مصاب بمرض اليرقان/ زەردوييەتی، زەردويياوی.
يسر:
يَسَرَ. يَسُرَ. يَسِرَ: سَهُلَ/ ئاسان بو، سوك بو، سانابو.
– : لَعِبَ القمار/ قوماری كرد، گەمەی كرد.
– ت. ايسَرَت الوالدة: سَهُلَت عليها الولادة/ بە ئاسانی و سوكی منداڵی بو، بە سانايی منداڵی بو.
يَسَّرَ: سَهَّلَ/ ئاسانی كرد، سوكی كرد، سانای كرد.
ياسَرَهُ: لايَنَهُ و ساهَلَهُ/ نەرم و نيان بو لەگەڵی.
ايسَرَ. تَيَسَّرَت اموره: تَسَهَّلَت/ كاروباری ئاسان بو.
– : إغتَنَی/ دەوڵەمەند بو، گوزەرانی باش بو.
تَيَسَّرَ. إستَيسَرَ: تَسَهَّلَ/ ئاسان بو، سانابو، بە ئاسانی بۆی هات.
– لە كذا: أمْكَنَهُ/ بۆی (لوا، گونجا، شيا)، توانی.
تَياسَرَ: اخذ جهة اليسار/ لای چەپی گرت، چەپ رەويی كرد.
يُسْر. يُسُر. يَسار: سُهُولَة/ ئاسانی، سوكی، سانايی.
– . – . – : غِنی/ ساماندارێتی، دەوڵەمەندی، بون، دارايی.
– . – . – : نَجاح الأعمال/ سەركەوتن.
– . – . – : ضد العُسر/ ئاسان، سوك، سانا، سان.
يَسير: سَهْل/ ئاسان، سوك، سانا.
ماءٌ – : عَذِب: يَرغو فيه الصابون/ ئاوی سوك، ئاوی سان.
يُسرَی. اليَدُ اليُسرَی/ دەستی چەپ، چەپ.
الجِهَة ال – : عكس اليمين/ لای چەپ.
يَسار: نقيض يَمين/ چەپ.
يَساری: نقيض يمينی/ چەپە، چەپلەر، چەپگەر.
يَسير: قليل/ كەم، نەخت.

— . — : هَيِّن/ ئاسان، سوك، لەسەرخۆ، سانا.

تَيْسير: تسهيل/ ئاسان كردن.

أَيْسَر: أهْوَن. أسْهَل/ ئاسانتر، سوكتر، لەسەرخۆتر، ساناتر.

الجانب الا — / لای چەپ.

مُوسِر. مُيَسَّر: ذو اليسار/ دەوڵەمەند، ساماندار، دارا.

مَيْسور. مُتَيَسِّر. مُيَسَّر: ضد مُتَعَثِّر/ بێكوسپ.

— . — : سهل/ ئاسان، سوك/ سانا.

— . — : سهل النَّيْل/ بە ئاسانی چنگ ئەكەوێ.

ميسرة: نقيض الميمنة/ لای چەپ، بەشی لای چەپ.

— : مَيْسِرة. مَيْسُرَة: سُهُولَة/ ئاسانی، سوكی، سانایی.

— . — . — : غِنى/ سامانداریتی، دەوڵەمەندی.

ياسِر: سَهْل/ ئاسان، سوك، سانا.

مَيْسَر: قِمار/ قومار، گەمە، یاری.

يسم:

ياسمين: يسمين: نبات/ یاسەمین.

يعبوب (فی عبو) يسوب (فی عسب)

يفخ:

يَفَخَ الوَلَدَ: ضَرَب يافوخَهُ/ كێشای بە تەپڵی سەریا.

يافوخ: نافوخ. راس الطفل/ تەپڵی سەر، تەوقەسەر، شكڵەی سەر.

يفع:

يَفَعَ. أَيْفَعَ. تَيَفَّعَ الغُلام: ناهَزَ البلوغ/ بو بە هەرزەكار، پێگەیشت.

يَفَع: مناهَزَة البلوغ/ هەرزەكاری.

يَفَع. يافع: مناهِز البلوغ/ هەرزەكار، نەو (جەوان، رەس، نەمام).

— . يَفَاع: كل ما إرتفع من الارض/ تەپۆڵكە، تەپە، گرد، بەرزایی.

يقت:

اقوت/ گەوهەری شەوچرا، یاقوت.

، طين (فی قطن)

ظ:

ظَ. يَقُظَ. إسْتَيْقَظَ: ضد نام/ خەبەری بوەوە، هەڵسا،

لـ خەو هەڵساو، راپەڕی.

— . — . — تيقظ: حَذِرَ و تَنَبَّهَ/ ئاگادار بو، بەئاگا هات، وریابوەوە.

يَقَّظَ. أيْقَظَ. إسْتَيْقَظَ: أضْحى/ هەڵیسان، خەبەری كردەوە، راپەڕان.

— . — . — : حَرَّك/ جوڵانی، بزوانی، وروژانی.

— . — . — : حَذَّرَ/ وریای كردەوە، ئاگاداری كرد، راپەڕان.

يَقِظ. يَقْظان. مُسْتَيْقِظ: صاحٍ/ بەخەبەر.

— . — . مُتَيَقِّظ: واعٍ/ وریا، ئاگادار، بە ئاگا، هوشیار.

يَقَظَة: ضد نوم/ بەخەبر بون، هەڵسان.

— : تَيَقُّظ: إنتباه/ ئاگا، ئاگاداری، هۆشیاری، وشیاری.

— . — : حَذَر/ وریایی، سڵەمینەوە.

أبو اليقظان: كُنيه للديك/ كەڵەشێر، كەڵەباب.

يقن:

يَقِنَ الأمرُ: ثَبُتَ و وَضَحَ/ دەركەوت، ئاشكرابو، رون بوەوە.

— . أيْقَنَ. تَيَقَّنَ. إسْتَيْقَنَ الأمرَ: تَحَقَّقَهُ/ دەریخست، خستیەڕو، ئاشكرای كرد.

يَقَن. يَقْن. إيقان: تأكُّد. إزاحَة الشك/ دڵنیابون، دڵنیایی، بێگومانی.

— . يَقِن. يَقُن. يَقَنَة. ميقان: ساذج. الذی لايسمع شيئاً إلا أيْقَنَ به/ ساویلكە، خۆش باوەڕ، بەهەموو شتێ باوەڕ ئەكا.

يَقين. تَحَقُّق. إزاحَة الشكّ. إقتناع وتصديق/ دڵنیابون، دڵنیایی، بێگومانی، سەلماندن، باوەڕكردن.

— : مُحَقَّق. ثابت/ راست، رەوان.

حَقّ الـ — / ئەوپەڕی دڵنیایی.

علم الـ — / زانیاری دڵنیای، دڵنیایی لەڕێی زانیاریەوە.

عَيْن الـ — / دڵنیایی (لە ڕێی بینینەوە، بە بینین).

على يقين من: عالم به حَقّ اليقين/ دڵنیابون، زۆر بە دڵنیاییەوە.

يقيناً: بلا ريب. حقاً/ بە دڵنیایی، هەڵبەت، ئەڵبەت، بێگومان.

موقن: ثابت. محقق/ دڵنیا.

ميقان: سريع التصديق/ خۆش باوەڕ، ساویلكە.

يم:

یَمَّمَ كذا: قَصَدَهُ و إتَّجَه اليه/ بۆی چو، ڕوی تێکرد.
— . تَـيَمَّمَ لـلـصلاة: مـسح يـده و وجهـه بـالتراب/ تەیەمومی کرد.
تيَمَّمَ الأمْرَ: تَعَمَّدَهُ/ بەهەوەس کردی، بە ئەنقەست کردی.
يَمّ: بحر/ دەریا، زەریا.
يَمام: قصد/ مەبەست، خواست، ویست.
— . يَمَمْ: حمام بَرّی/ کۆترە (کێویلە، کێوی)، گاکۆتر.
يمن:
يَمَنَ. يمِنَ. يَمُنَ: كان ذا يُمْن/ لە خۆشیدا بو، بەختیار بو، ئاسودە بو.
— . يَمَّنَ به: ذهب به ذات اليمين/ بەلای ڕاستدا بردی.
يَمَّنَ. ايمَنَ. تَيامَنَ: ذَهَبَ نحو اليمين/ ڕاستی گرت، بەلای ڕاستدا (لایدا، ڕۆی).
تَيَمَّنَ: ماتَ/ مرد.
— به: تَبَرَّكَ به/ پێی پیرۆز بو، خۆی پێ پیرۆز کرد، موبارەکی کرد.
— بالمَيِّت: وضعه فی قبره علی جنب الأيْمَن/ لەسەر تەنیشتی ڕاست ناشتی.
يُمْن: بركة/ پیرۆزی، بەختیاری، خۆشی، کامەرانی.
مُيَمَّن: يأتی بالخیر/ پیرۆز، بەخت هێن، کامەران.
مَيمون: ذو اليُمْن/ پیرۆز، بەختیار، بەختەوەر، کامەران.
— . أيمن. يمين: من كان مباركاً علی قومه/ پیاو چاك، پیرۆز.
— : الطائر. مُيَمَّن: مُوَفَّق. سَعيد/ ڕێنێکی خۆش و پیرۆز.
سِرّ علی الطائرُ الـ — : دعاء للمسافر/ بەخۆشی بڕۆی.
يَمَن. يَمْنَة: ناحيَة اليمين/ لای ڕاست.
بنت الـ — : القهوة/ قاوە.
يمين: نقیض اليسار/ ڕاست.
— : قَسَم/ سوێند.
اداء الـ — / سوێند خواردن.
يُمْنى. اليد اليُمنى/ دەستی ڕاست، ڕاست.
الجهة الـ — / لای ڕاست.
أيْمَن: نقيض أيسر/ ڕاست، ڕاستە.
مَيْمَنَه: خلاف المَيْسَرَة/ بەشی لای ڕاست.
— . يُمْـن: بركـة/ خۆشـی، بـەختیاری، بەرەکـەت، کامەرانی پیرۆزی.

يُنْبغی (فی بَغی) ينبوع (فی نبع)
ينع:
يَنَعَ. اِيْنَعَ: ادرك/ پێگەیی.
يانع. ينيع: ناضِج/ پێگەییو، پێگەیشتو.
— : احمر/ سور، خوێنی.
يَنَع: الخرز الأحمر. ضرب من العقيق/ شیلان.
يهف:
يهفوف: احمق/ گێل، گەوج، کەودەن.
— : جَبان/ ترسنۆك.
— : القفر من الارض/ بیابان، سارا، چۆڵەوانی، کاکی بەکاکی.
— : القلب الحديد/ دڵی ڕەق و ئاسنین.
يهم:
يَهَم: جنون/ شێتی.
ايْهَم: المصاب فی عقله/ شێتۆکە.
— : الشامخ من الجبال/ چیای بڵند، گەردن کەش.
— : لا يسمع/ کەڕ، نابیسێ، گوێ کپ.
يهود. يهودی (فی هود)
يوب:
يوبيل: عيد خمسيني/ یوبیل، پەنجایەی هەمو شتێ، تێپەڕبونی پەنجا ساڵ بەسەر هەمو شتێکدا.
يوم:
ياوَمَهُ: عامله بالايام/ بە ڕۆژانە لەگەڵی ڕێکەوت.
يَوْم: ٢٤ ساعَة/ ڕوژ، شەو ڕۆژ.
— : نَهار/ ڕۆژ.
— : وقت/ کات.
الـ — : هذا اليوم/ ئەمڕۆ.
فی — من الايام: يوماً ما/ ڕۆژێ، لە ڕۆژان.
بين — و يوم . من — ليوم/ ڕۆژ نا ڕۆژێك.
إبن يومه: سريع الزوال/ تەمەن کورت.
يومی: كل يوم/ هەمو ڕۆژێ.
يَوْمِيَّة: اجره اليوم/ ڕۆژانە، ڕۆژبێر.
يوميا: كل يوم/ هەمو ڕۆژێ.
يَومَئِذٍ/ ئەوسا

